٤

زنجیره دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی

## لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

چاپی دووەم

✹ خوا بە یەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی دا ✹



التفسير

عەلی باپیر

زنجیــره دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

13 تـــا 26

بەرگـــی دووەم

## خوا بە یەکگرتن (التوحید)

## لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتی دا

1427ك

2006ز

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله والصلاة والسلام علی رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە (عەلی باپیر) بەڕێز مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و پیتی زیاتر

بخاتە ئیش و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی دیکە مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

چاپکردنی ئەم شێوەی کتێبە کاتێ بە نرخ بە گوێرەی

توانا و هەل و مەرجی ئێستە و ڕۆژگارەوە .

وە لەمێژ بوو هیوادارم وابوو شێوە چاپکردنێکی

وایان بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەران بێ . جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم لە خۆشەویستانی تەفسیرە و کارە هەستان.

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان

بێت ، منیش سوپاسیان دەکەم .

علی باپیر

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا - بەرگی دووەم |
| نوسەر: | عەلی باپیر |
| بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ : | أمين مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم 1427ك - 2006ز |
| تیراژ: | 3000 دانە |

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (.......) ی ساڵی 2006 دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشکەش بێ

بەوانەی کە دەیانەوێ و هەوڵدەدەن کە خوا (تبارك وتعالى) وەك چۆن تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارە، تاکە پەرستراویشیان بێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ قُلْ اللَّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لا يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ نَفْعاً وَلا ضَرّاً قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلْ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴾ (الرعد: 16).

# پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه

خوێنەری بەڕێز:

هەرچەندە بە تاکە بەدیهێنەر(خالق)و تەنها پەروەردگار (رب) زانینی خوا (سبحانه وتعالى) شتێکی خوارِسك (فطري)ەو لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا تێکهەڵشێراوە، وەك ئایەتی(172)ی سورەتی (الاعراف) ئاماژەی پێدەکات ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ .

واتە: وە یادبکەوە کاتێك پەروەردگـــارە لە پشـــتی ئادەمیزاداندا وەچەکانی وەرگرت و لەسەر خۆیانی کردنە شایەدو فەرمووی: ئایا من پەروەردگارتان نیم؟! گوتیان با شایەدیماندا، بۆیەش ئەو بەڵێنەمان لێوەرگرتن تاکو رِۆژی دوایی نەڵێن: ئێمە کاتی خۆی لەمە بێئاگا بووین.

بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا هەر لە بەرەبەیانی مێژووی مرۆڤـــایەتی یەوە ئەو بابەتە جێگـــای باس وخواس و مشتومرِی زۆر بووە، بە تایبەت لە نێوان پێغەمبەرانی خوا ﷺ. لە لایەك و طاغووتەکانی وەك نەمرودو فیرعەون لە لایەکی دیکەوە.

جا ئایا هۆکاری پەیدا بوونی ئەو دیاردەیە چییە؟!

من پێم وایە هۆکاری سەر هەڵدانی دیاردەی بێبڕوایی (إلحاد) لە نێو بەشەردا وێرای خوارِسك بونی خواناسیی و دانهێنان بە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتی خوادا، دوو شتە:-

(1) بە نسبەت طاغووتە لە خوا یاخییەکـــــانەوە لە ڕووی فێڵبازی و زۆرزانییەوە نکوڵییان کردوە لە ئەسڵی بوونی خوا (جلَ وعلا) واتە: لە بەدیهێنـــــەرایەتی، یان لە پەروەردگـــاریێتی خوا واتە: بەسەر ڕاگەیشتن و سەرپەرشـــتیاریتی و مشــــوورخۆریەتی بۆ کائینات، چونکە ئەو خۆ بە زلگــــرو لە خۆبایـــــی بووانە کەڵکەڵەی پەروەردگاریەتی و پەرســـتراوێتی (الربوبیة والألوهیة) یان لە کەللە دابووە، ئەوەتا نەمروود لە وەڵامی (إبراهیم) -علیه السلام- کە ویستوویەتی مەسەلەی مەرگ و ژیان یان ژیاندن و مراندن (الإحیاء والأماتة) بکاتە بەڵگەی ئیسپاتی پەروەردگاریەتی خوا ﴿إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ (البقرة: 258)، گوتوویەتی: ﴿قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ﴾ من دەژیێنم و دەمرێنم!

دیسان فیرعەون بە دارو دەســـتەی و تەگبیرکەرانی دەوروبەری دەڵێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلأُ مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرِي﴾ (القصص 38)، ئەی قسە ڕۆیشتوان، من جگە لە خۆم پەرشتراوێکی دیکە بۆ ئێوە شك نابەم.

ئنجا دیارە کاتێکیش زەمینە خۆش دەبێ و ڕێ تەخت و ئاچووغ دەبێ لەبەردەم ئەو خۆ بەزلگرو خۆ لێ بایی بووانەدا لەعنەتی خوایان لێبێ کە ئیددعای پەروەردگاریەتی و پەرستراوێتی بکەن بەسەر خەڵکیدا کە فیکرەی بێبڕوایی جێگای ئیمان و خوا بە یەکزانینی گرتبێتەوەو خەڵکەکە دووچاری بۆشایی فیکری و ڕووحی (الفراغ الفكري والروحي) بووبن.

ئەو کاتە ئەو طاغووتانە ئەگەر بە زمانی قسە (مقال)یش نەڵێن بە زمای کردەوەو حاڵ دەڵێن: جا خەڵکینە! مادام هیچ پەروەردگارو پەرستراوتان نەبن ئەوە ئێمە پەروەردگار و پەرستراوتانین!

(2) بەڵام بە نسبەت خەڵکی گشتی یەوە بە پێچەوانەی طاغووتەکانەوە هۆکاری بنەڕەتی بەرەو بێبڕوایی و دوور لە خوایی (إلحاد) چوونیان بریتیە لە نەزانیی (جهل) بەرانبەر بە خوا تبارك وتعالى، بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

خەڵکی ڕۆژئاوا بەگشتی و چینی خوێندوار بە تایبەت کاتێك شەپۆڵو تەوژمی بێبڕوایی بەرانبەر بە ئایین و زەندەقەو دوور لە خوایی لە نێویاندا پەرەی ستاندو بەهێز بوو کە چینی ئەکلیرۆس و پیاوانی کڵێسا ئەو بەرنامە (شريعة)یەی عیسا (عليه السلام) هێنابووی گۆڕیان و دەستکاری یان کردو پڕیان کرد لە ئەفسانەو شتی پڕوپووچی وا کە لەگەڵ هیچ عەقڵێکی سەلیمدا ناگونجێ و ئێستاش لەگەڵ بێ هەردوو کتێبی پەیمانی کۆن (العهد القديم)و پەیمانی نوێ (العهد الجديد) بە تایبەت یەکەمیان شتی هێندە سەیرو سەمەرەو لەگەڵ عەقڵ و مەنتیقدا

نەگونجاویان لەبارەی خوای بەرزو بێوێنەوە (عزّوجل) تێدایە کە یەکجار دوورن لە پایەی بەرزی خوا (سبحانەو تعالی)و کاتێك مرۆڤ ئەو شتانەی لەو دوو کتێبەدا دەکەوێتە بەرچاو کە نەصرانیەکان بە کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس)یان ناو دەبەن و لەسەر بناغەی وان و لەبەر ڕۆشناییاندا بە حیساب بڕوا بە خوا دێنن و دەیپەرستن، تێدەگات کە بۆچی دیاردەو تەوژمی بێدینایەتی و وازهێنان لە نەصرانیەت ڕۆژ بە ڕۆژ لە نێو خەڵك و جەماوەری وڵاتانی ڕۆژئاوادا پەرەدەستێنێ بە تایبەت لە نێو چینی خوێندەوارو ڕۆشنبیریاندا!

ئنجا ئەگەر ئێمە ناتوانین لە ڕێگای خستنە رووی ڕاست و دروستی فیکرەو عەقیدەی خواناسیی و بڕواهێنان بە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوا (عزّوجل)، ڕێ بگرین لە طاغووتە خۆ بە زلگرو لە خۆبایی یەکان کە لافی پەروەردگارێتی و بەسەر خەڵك دا لێدەدەن، چونکە کێشەی ئەوان ئەوەیە کە حەزیان لە خۆفەرزکردن و خۆسەپاندنەو دەیانەوێ بەهۆی جێ لێژکردن بە عەقیدەی خواناسیی و خوا بە یەکگرتنەوە زەمینەی خۆ لە خەڵك کردنە پەروەردگار و پەرستراویان بۆ هەموار بێت، بەڵام بێگومان دەتوانین بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوا خستنە ڕووی فیکرەی خواناسیی و خوا بە یەکگرتنەوە بەرچاوی ئەو خەڵکە ڕۆشن بکەینەوە کە لە سۆنگەی نەزانیی و نەشارەزاییەوە ئەو عەقیدەو فیکرە ڕاست و خوارسکەی لە پێش چاو بێزراوەو ملی بە دەشت و بیابان و هەڵەت و هەڵدێری بێدینایەتییەوە ناوە.

جا خوێنەری بەڕێـز

ئەم كتێبە وێڕای ئامانجە بنەڕەتییەكەی كە بریتییە لە:
هاوكاریكردن و یارمەتیدانی ئەو مســوڵمان و بڕوادارانەی دەیانەوێ ئیمان و عەقیدەی خواناسیی و خوا بە یەككگـــرتن (توحید) لە دڵ و دەروونیان دا بە هێزو پێزتر وە قایم وقوڵتــرو ڕیشەدارتر بێ و (ابراهیم) - علیه السلام  گوتەنی: ﴿ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ﴾ (البقرة: 260)، واتە: (با ئیمانم هەیە، بەڵام تاكو دڵم باشتر ئارام بگرێ) ئەو مەبەستەش كە پێش تۆزێك ئاماژەم پێدا ئامانجێكی دیكەیەتی و هیواداریشم و لە خوای بەخشـــــەر (الوهاب)یش داواكارم كە هەردوو ئامانجەكەی بە چاكترین شێوە بپێكێ و بێنێتە دی و، هەم عەقیدەی خواناسییو خوا بە یەككگرتن لە عەقڵو هۆشو دڵ و دەروونی مسوڵمانانداواتە ئەو خوشكو برا مسوڵمانانەی كە ئەم كتێبـــــە دەخوێننەوە لێی بەهرەمەند دەبن، ڕۆشنتــر و بەهێزو پێزتر بكات و هەم كەســـــانێكیش كە لە سۆنگەی نەشارەزاییو بێئاگاییەوە لە بارەی ئەسڵی عەقیدەو فیكرەی خواناسییەوە بەشێوە شەرعییە ڕاست و دروستەكەی خۆی دووچاری حاڵەتی دوور لە خوایی (إلحــاد) یان لایەنی كەم، گومان و دوودڵیی و لەرەلەر (تذبذب) بوونە، لێی بەهرەمەند بن و تیشكی ڕاست خواناسین و دروست ئیمان هێنان تەمومــژی بە هەڵە بۆ خوا (تبارك وتعالى) ڕوانین و پێ ئاشــــنا نەبوونی ڕابماڵــێ و ســـەرەنجام بناغەیەكی قایم و پتەوی ئیمان بە خوا

هێنانیان بۆ برەخسێ، تاکو بتوانن دیواری ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست و دینداریی‌یەکی پاك و پوختی لەسەر بنیات بنێن و هەڵچنن.

خوای بە بەزەیی و بەخشەریش گـــــفت و بەڵێنێکی پتەو و جەخت لەسەر کراوی بە هەرکەسێك داوە کە بە دڵێکی پاکو نیازێکی چاکەوەوە بەرەو لای بچێ هەنگاو بنێ نائومێدی نەکات و دەستی بگرێ و ڕێنمایی بکات.

﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾ (العنكبوت 69).

کەواتە: لە ئێمەی مرۆڤ هەوڵ و حەرەکەت و لە خوای بەرزو مەزن و بە بەزەییش، بە پیرەوە هاتن و ڕێ نیشاندان و دەست گرتن و سەرخستن و بەرەکەت.

1/ رجب / 1427

27/ حوزەیران/ 2006

هەولێر

# ڕێ خۆش كـردن

خوێنەری بەڕێز:

ئەگـــەر لە یادت بێ لە پێشەكی و ڕێخۆشكردنی گشتی ئەم زنجیرە دەرسەدا كە لە بەرگی یەكەمدا هاتوە گوتومانە:

بەشی دووەمی ئەم زنجیــــرە دەرسە (خوا بە یەك گرتن) "التوحید"و هاوبەش بۆ خوا پەیداكردن الشرك) سەرجەم لە بیست و چوار دەرس پێكهاتوە.

جا شـــــایانی باسە كە ئەم بەرگی دووەمە: (خوا بە یەكگرتن لە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتیدا) چواردە (14)دەرسی یەكەمی ئەو بیست و چوار دەرسەی گرتوونەخۆ وە دە(10)دەرسەكەی دیكەش تەرخان كراون بۆ توێژینەوە لە بارەی ناو و ســــیفەتەكان (الأسماء والصفات)ی خوای بەرزو بـێ وێنە و خوا بە یەكگرتن لە پەرستراوێتی (توحید الله في الألوهیة)دا، كە بەرگی سێیەمیان بۆ تەرخان كراوە خوا پشتیوان بێ-.

جا ئەو چواردە دەرسەی كە ئەم بەرگی دووەمە گرتوونیە خۆی باس و بابەتەكانیان بەم جۆرەی خوارەوەن، لە پێنج بەندان دا:

**بەندی یەکەم/** سەرەتا لە پێنج دەرسی یەکەم (1 تا 5)دا لە ژێر باسی (ڕێگاو چۆنیەتی زانین و ناسین)دا، لە بابەتێکی گرنگی فیکریی و فەلسەفییمان کۆڵیوەتەوە کە بە زاراوەی هاوچەرخ تیۆری زانست (نظرية المعرفة)یان (ئەبستمۆلۆژیا)ی پێ دەڵێن و نێوەڕۆکەکەی بریتیە لە لێکۆڵینەوەو باس وخواس دەربارەی ئەو ڕێبازو شێوازو چۆنیەتییانەی کە مرۆڤ دەتوانێ لێیانەوە بگاتە زانیاری و زانست و پەی بردن بە شتان (الأشياء).

شایانی باسیشە لەو پێنج (5) دەرسەش دەرسی یەکەم و دووەممان تەرخان کردوون بۆ قسەکردن لەسەر تیۆری زانست لە ڕوانگەی غەیری ئیسلامەوە هەر لە فەلسەفەی یۆنانییەکانەوە هەتا فەیلەسووفە ڕۆژئاواییەکانی سەدەکانی نێوەڕاست و چاخەکانی دواییش بە تایبەت چاخی ڕێنسانس.

پاشان سێ دەرسی سێیەم و چوارەم و پێنجەمیشمان تەرخان کردوون بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی ئیسلام و زانایانی ئیسلام لە بارەی چۆنیەتی و ڕێبازی وەدەست هێنانی زانیاری و زانستەوە .

**بەندی دووەم/** ئنجا لە دەرسی شەشەمدا لەژێر سەرباسی (خوا بە یەکگرتن بناغەی بەندایەتیی و بێبڕوایی و هاوبەش بۆ خودا دانان (الألحاد والشرك)یش گەورەترین تاوان و پووچترین ئەفسانەن) تیشکمان خستۆتە سەر مەسەلەی خوا بە یەکگرتن و هاوبەش بۆ خوا دانان (التوحيد و الشرك)و ڕوونمان کردۆتەوە کە خوا بە

یەکگرتن لە هەر سێك بواری بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی (الخالقیة و الربوبیة والألوهیة)دا گەورەترین و درەوشاوەترین راستییەو هاوبەش بۆ خوا دانانیش لە هەرسێك بوارەکاندا پووچترین ئەفسانەو زلترین تاوانە.

**بەندی سێیەم**/ئنجا لە پێنج دەرسی حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم و دەیەم و یازدەیەم دا، لەژێر ناوونیشانی: (عەقلّ و زانیاری و فیطرەت گەورەترین شایەدی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتی خوان)دا ئەو ڕاستییەمان خستۆتە ڕوو کە هەر کام لە عەقلّ و زانیاری و فیطرەت، بەڵگەو شایەدن بۆ ئیسپاتی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردیگارێتی خوای بەرزو بێ هاوتا (تبارك وتعالى) واتە هەر کەسێك بەو ویژدانەوە گوێ ڕادێرێ بۆ هەر کام لە عەقلی سەلیم و زانیاری ڕاستەقینەو فیطرەت و سروشتی ساغ، خۆی ناچار دەبینێ کە دان بنێ بە بەدیهێنەرایێتی و پەروەردیگارێتی خوای بەرزو مەزن دا.

**بەندی چوارەم**/ پاشان لە سێ دەرسی کۆتاییدا کە دەرسەکانی دوازدەو سێزدەو چواردەن، لە ژێر سەرباسی (قورئان بەرزترین شێوازی سەلماندنی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتی خوای تێدایە)دا، خستوومانەتە ڕوو کە چۆن چۆنی قورئانی بەرزو بەهێزو پیرۆز، ڕاستیی بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن بوونی خوا(سبحانه و تعالى) بۆ بوونەوەرو کائینات ڕوون دەکات و دەسەلمێنێ بە شێوازێك

کە دەتوانێ گەورەترین مولحیدو زەندیـــق لە چاڵ و زەلکاوی کوفرو ئیلحاد دەربێنێ.

**بەندی پێنجــەم/** وە لە کۆتاییدا لەژێــــــر ناوی (چوار کورتە باسی گرنگ)دا[1] چوار ڕاستی گەورەمان لە بارەی بەدیهێنەرایەتیـــی و پەروەردگاریێتی خوای بێ وێنەو هاوەڵ (جل شأنه) باس کردون و کۆتاییمــــــان بە باسی (بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتی خوا) هێناوە.

ئیدی ئێوەو باس و بابەتەکانی ئەم بەرگی دووەمی کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) لە دوو توێی چواردە دەرس و چوار کورتە باســــدا و ســــەرجەم ئەو دەرس و کورتە باسانەش لە پێنج بەندی سەرەکیدا.

(1) ئەو چوار کورتە باسە هی کتێبی (مسوڵمانی کامڵ) بەشی یەکەم-ن کە بە چاکم زانی لە جیاتی چاپکردنەوەی دوو بارە سەرجەم باس و بابەتەکانی بە تۆزێك دەستکاریی و گۆڕانکاریی یەوە بخەمە گەڵ ئەم کتێبەی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی...)، دیارە هەر باس و بابەتە دەخەینە نێو باس و بابەتەکانی بەرگێکەوە لە بەرگەکانی ئەم کتێبە، کە لەگەڵیان بگونجێن و لە شوێنی خۆشی دا ئاماژەیان بۆ دەکەین.

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد الأنبياء والمرسلين محمد وآله المهتدين بهديه المبين الى يوم الدين.

بەڕێزان: بۆیە بەر لەوەی بچینە سەر ئەسلی مەبەست کە بریتیە لە قسەکردن و باسکردن دەربارەی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوا (عزّوجل)، بە پێویستم زانی کە وەك ڕێ خۆش کردنێك بۆ چوونە نێو ئەو باسە گرنگ و پڕ بایەخە باسی مەسەلەی (ڕێبازو چۆنیەتی وەدەست هێنانی زانیاری و زانست)[1] بکەین، چونکە هەرچەندە ئەو مەسەلەیە، باسێکی عیلمیی و فەلسەفیی تا ئەندازەیەك وشکە، بەڵام وەك لە باسەکانی دواییدا دەبینین زۆر پێویستیمان پێی هەیە، لەبەر ئەوەی کە خوای پەروەردگار تەنها لە ڕێگای زانیاری و زانست (العلم والمعرفة)ەوە دەناسرێ، کەواتە تا نەزانین ئەو (علم ومعرفة)ی کە خوای پێ دەناسین (جل جلاله) لە بواری پەروەردگاریێتیو ناوو سیفاتو تەنیا پەرستراویێتیدا چییەو چۆن وەدەست دێو تا چ ئەندازەیەك جێگای متمانەو باوەڕە؟! تا

(1) بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودێکی زۆرم لە : (نظرية المعرفة بين القرآن والسنة)ی د. راجح عبدالحميد الكردي و (مصادر المعرفة في الفكر الديني و الفلسفي دراسة نقدية في ضوء الإسلام) ی د. عبدالرحمن بن زيد، وەرگرتوە.

ئەوە نەزانین  بێگومان بە یەکسەر چوونە نێو باسی (خوا ناسیی) و (بڕوا بە خوا بوون) و (خوا بە یەك گرتن)ەوە باسەکەمان زۆر دامەزراو نابێت.

کەواتە ئەم بابەتە (باسی ڕێبازو چۆنیەتی وەدەست هێنانی زانیاری و زانســـــت) وەك بنـــــاغە وایە بۆ زنجیرە باسەکانی دیکەی کە باسی خوا بەیەککگرتـــن و پێچەوانەکەی دەکـــەن کە بریتییە لە هاوبەش بۆ خوا دانان لە هەر سێ بوارەکانی پەروەردگاریتـــی و ناو و ســـیفات و پەرستراویتیدا.

شایانی باسیشە ئێمە ئەم بابەتە بە گوشراویی و پوختـــی لە چوار خاڵی سەرەکیدا دەتوێژینەوە کە ئەمانەن:-

1- پێناسەی (علم) و (معرفة)و چەند وشەیەکی دیکەی نزیکیان.
2- تیۆری زانست(نظرية المعرفة) چی یەو لە کەیەوە سەری هەڵداوە؟!
3- ئایا زانین‌و ناسینی شتان (الأشياء) بۆ ئینسان شتێکی گونجاوە؟!
4- لە چ ڕێیەکەوە دەستمان لە زانیاری و زانست گیر دەبێ؟!

**(خاڵی یەکەم): پێناسەی (علـم) و (معـــرفە) و چەند وشەیەکی دیکە کە لێیانەوە نزیکن:-**

لە فەرهەنگەکانی زماندا بۆ نموونە: (لسان العرب)[1] کە پێناسەی هەر کام لە (علم)و (معرفة) دەکات، هەروەها لە (القاموس المحیط) لە باسی وشەی (علم)و وشەی (المعرفة)دا، وە هەروەها (معجم مقاییس اللغة)[1]، وە (المختار الصحاح)[2]، هەر کام لەم قاموسانە وە ئەوانی دیکەش وشـــەی (علم)و وشەی (معرفة) زۆر بە لە یەك نزیك تەفسیر دەکەن و لێکـــدەدەنەوە، کە من پێم وایە لە کوردیدا ئەگەر بۆ وشەی (علم) بڵێین: زانین، وە(معرفة) بڵێین: ناسین، ماناکەیان پڕ بە پێستە، (علم) واتە: زانین، (عَلِمَ) واتە: زانی، (معرفة)ش واتە: ناسین، (عَرَفَ) واتە: ناسی، دوایی ئەم بابەتە زیاتر ڕوون دەکەینەوە،

وە وشەی (علم)و وشەی (معرفة)، خوای پەروەردگار هەردووکیانی لە قورئاندا بۆ خۆی بەکارهێناوە، واتە کە (بەندە)کان خوای خۆیان دەناسن و سیفەتەکانی دەزانن، بەڵام بە تایبەتی بۆ خۆی تەنیا وشەی (علم)ی بەکارهێناوە دوایی ڕوونی دەکەینەوە لەبەر چی!!

جا چەند جیاوازی‌یەك لەنێوان وشەی (علم)و وشەی (معرفة)دا هەن:

**(یەکـــەم):** جیاوازی یەکی بێژەیی (لفظی)یان لە نێواندا هەیە، چونکە وشەی (عَرَفَ) تەنیا بەرکـــــار (مفعول)ێکی دەوێ وەك خوای

---

(1) بەرگی (9) لاپەرە 236 – 243 ، و بەرگی 12 لاپەرە 416 – 422.

(1) ابن الفارس.

(2) الجوهري .

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ﴾[3] واتە: (یوسف) عليه السلام- برایەکانی خۆی ناسی، بەڵام ئەوان ئەمیان نەناس کرد وە پێی ئاشنا نەبوون، لێرەدا وشــەی (عرف) یەك (مفعول)ی ویستوە، بەڵام وشەی (علم) دوو (مفعول)ی دەوێن، وەك خـــوای زانا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ﴾[1]. لێـــــــرەدا (هُنَّ) (مفعول)ی یەکەمەو (مُؤْمِنَاتٍ)هی دووەمە، دەفەرموێ ئەگەر زانیتان ئەو ئافرەتـــــانەی کە لە (مكّة)وە بۆ (مدينة) کۆچیان کردوە، بڕوادارن، ئەوە مەیانگێـڕنەوە بۆ مەککەو بۆ نێو هاوبەشدانەر (مشرك)ەکان، دیارە بە زۆری بەم شێوەیەیە کە وشەی (علم) دوو(مفعول)ی دەوێن و وشەی (عرف)ش (مفعول)ێکی دەوێو هیچی دیکە. بەڵام جاری واش هەیە (علم) یەك (مفعول)ی دەوێ، جا ئەگەر هاتو یەك (مفعول)ی ویست دیارە ئەو کات بە مانای (عرف)یە، وەك خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾[2] لێرەدا هەم (لاَ تَعْلَمُونَهُمُ) یەك (مفعول)ی هەیەو هەم (اللّهُ يَعْلَمُهُمْ)یش هەر یەك (مفعول)ی هەیە، جا لێرەدا وشەی (علم) بە مانای (عرف)یە واتە ناسی.

(3) (یوسف 58) .

(1) (الممتحنة 10) .

(2) (الأنفال 60) واتە: وە کە سانێکی دیکەش هەن لە کافرەکان بێجگە لەوان، ئێوە نایانناسن بەڵام خوا دەیانناسێ.

**(دووەم):** جیـــاوازی لە نێوان وشەی (علم)و (معرفە)دا جیاوازی یەكی واتایی (معنوي)یە، چونكە وشەی (علـــــم) زیاتر پەیوەستە بە سیفەت و حاڵ و باڵی شتەوە، بەڵام (معرفة) پەیوەستە بە خود (ذات) شتەوە، وەك دەڵێی (عرفت أستاذك وعلمت أنه تقي)، واتە: مامۆستاكەتم ناسی و وە زانیشم كە تەقوای هەیە، (معرفة)ە كەی پەیوەندی بە خودی مامۆستاوە هەیە، بەڵام (علم)ەكە پەیوەندی بە سیفەتەكەیەوە هەیە كە تەقوایە، كەواتە (معرفة) ئەوەیە كە خودی ئەو شتە لە بیرو زانین دا ئامادە دەبێت، بەڵام (علم) بریتییە لە ئامادەبوونی سیفەتەكانی لە بیـــرو زەین دا، واتە: بە زانراو (اصطلاح)ی زانایانی ژێربێژایی (منطق): (معرفة) زیاتر وێنە هێنانە بەرچاو(تصوّر) دەگەڕێتەوە(علم)یش زیاتر بە ڕاست دانان، چونكە (تصوّر) ئەوەیە كە شتەكە لە نێو مێشكتدا حازربێ و بیهێنیـــە بەر ئاوێنەی زەین و مێشكت، بەڵام (تصديق) ئەوەیە كە تۆ حوكمی شتێك بە سەر شتێكدا بدەی و نسبەتی شتێك بۆ لای شتێك بدەی (الجرجاني) لە كتێبی (التعريفات)دا ئاوا پێناسەی (تصور)و (تصديق) دەكات: (التصور حصول صورة الشيء في العقل، والتصديق حكم بالنسبة بين الطرفين) واتە: (تصور) ئەوەیە شتەكە لە مێشكتدا ئامادە بێت، (تصديق)یش ئەوەیە كە حوكمی شتێك بۆ شتێك دابنێی واتە: ئەوەیە كە حوكم لەسەر شتێك بدەی، وەك بڵێی ئەم شتە بەڕاست نازانم.

**(سـ ێیەم):** جیاوازی یەکی دیکە ئەوەیە کە (معرفە) زیاتر بۆ شتێك بەکاردێت کە لە دوای ناسرانی فەرامۆش کرابێ، شتێکت نا سیوەو دوایی لە بیرت چۆتەوەو پاشان کە دەیبینیەوە، دەینا سی یەوە تۆ دەڵێی (عرفتە) واتە: ناسیمەوە، یاخود شتێك بە چەند سیفەتێك وەسف کرابێ، دوایی بە هۆی ئەو سیفەتانە بینا سی، هەردووك شێوەکان لە قورئاندا بەکار هاتوون یەکەمیان ئایەتەکەی سوورەتی یوسف کە دەفەرموێ ﴿فَعَرَفَهُمْ وَ هُمْ لَهُ مُنكِرُونَ﴾ وا تە: ئەو ناسینیەوە بەڵام برایەکانی نەیان ناسیەوە، دووەمیان: خوای بێ هاوەڵ دەربارەی جوولەکەو نەصرانییەکان (أهل الكتاب)و شارەزاییان بە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمْ ...﴾[1] چونکە (محمد) ﷺ سیفەت و وەسفەکانی لە کتێبەکانی پێشودا هاتوون و باس کراون، دە فەرموێ: بە هۆی سیفەتەکانی یەوە دەیناسن، وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن.

**( چوارەم):** جیاوازی نێوان وشەی (علم) و(معرفة) ئەوەیە کە (معرفة) یان وشەی نەزانیی (جهل)ی لە بەرامبەردا هەیە، یان (غفلة) بێئاگایی، بەڵام (علم) بە نسبەت خوای زاناو شارەزاوە ئەوا نەی پێش ناکەوێ، بە نسبەت غەیری خواش دەگوترێ: زانی (عَلِمَهُ) یان پێچەوانەکەی دەگوترێ نەیزانی (جَهِلَهُ)، بۆیە بۆ خوای بێ

(1) (البقرة 146).

وێنە وشەی (عالم) بەکاردێ، بەڵام (عارف) بەکار نایەت چونکە (عارف) بە کەسێك دەڵێن کە کاتێك بووە ئەو شتەی نەزانی بێ دوایی فێری بووبێت، یان ئەو کەسەی نەناسیبێ دوایی ناسیبێتی، بەڵام خوای پەروەردگار هەمیشە شتەکان دەزانێ و کە سەکانیش دەناسێ بە (عِلْم)ی ئەزەلـیی و بێ سەرەتایی خۆی هەر بۆیەش وشەی (عارف) خوا بۆ خۆی بەکاری نەهێناوەو دروستیش نیە بۆی بەکار بهێنرێ.

**(پێنـجەم):** جیاوازییەکی دیکەیان ئەوەیە کە (معرفة) بۆ شتێك بەکاردەهێنرێ کە بە هۆی شوێنەوارەکانییەوە بناسرێ، بەڵام خودی خۆی پەی پێ نابرێ بەڵام (عِلْم) بۆ شتێك بەکاردێت کە خود (ذات)ی ئەو شتە بزانرێ، بۆ نموونە: تۆ دەڵێی (عرفت الله) واتە: خوام ناسی بە هۆی شوێنەوار و سیفەتەکانی یەوە، بەڵام ناڵێی (علمت الله) چونکە (عِلْم) پەیوەندی بە (ذات)ەوە هەیە (ذات)ی خواش پەی پێ نابرێ، بەڵکو تەنیا سیفەتەکانی پەییان پێ دەبردرێ.

**(شـەشەم):** پێچەوانەی (معرفة) بریتیە لە نکوولێی لـێکردن (إنكار) بەڵام پێچەوانەی (عِلْم) بریتیە لە نەزانیی (جهل)، وە لە خاڵی چوارەمدا باسمان کرد کە (معرفة) (جهل)ی پێش دەکەوێ و (غفلة)ی پێش دەکەوێ، بەڵام (عِلْم) ئەوانەی پێش ناکەوێ.

**(حەوتەم):** جیاوازی یەکی دیکە ئەوەیە کە (معرفة) زیاتر پەیوەندی بە شتە بەرهەست (محسوس)ەکان و مانا جوزئی یەکانەوە هەیە، بەڵام (عِلْم) پەیوەندی بە شتی فامکراو (معقول)و مانا گشتییەکان (المعاني الكلية)ەوە هەیە.

ئەوە بە کورتی مانای هەردوو وشەی (عِلْم)و وشەی (معرفة) کە هەر یەکەیان مانای تایبەتی خۆی هەیەو جاری واش هەیە لە جیاتی یەکتری بەکاردێن، بەڵام ئەو جیاوازییانەیان هەیە کە باسمان کردن.

ئنجا چەند وشەیەکی دیکە هەن، کە زۆربەیان لە قورئاندا بەکار هاتوون و هەر کامێکیان لە (علم)و(معرفة)وە نزیکن کە ژمارەیان پازدە (15) وشەیەو هەر بە کورتی پێناسە یان دەکەین:

1- (الشعور) کە (الزمخشري) دەڵێ: (شعر يعني فَطِنَ، عَلِمَ، دَرى)[1].

واتە: بە مانا هەستی پێکرد، زانی، پەی پێ برد، (مە شاعر)یش واتە: هەستەکان یەکێك دەڵێ: شعوورم برینندار مەکە، واتە: هەستم برینندار مەکە، کەواتە ئەم وشەیە شعر زۆر لە (علم)وە نزیکە.

2-(الإدراك) بە مانای (اللقاء والوصول) دێت (پێگەیشتن و خۆگەیاندن بە شتێك) لە عەرەبیدا دەڵێ: (أدرك الغلامُ) یان (أدركت الثَمَرةُ) منداڵەکە بالغ بووە، میوەکە پێگەیشتوە، ئەوە لە بارەی (پێگەیشتن)ەوە، دەربارەی فریاکەوتن و گەیشتن بە شتێکیش خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا تَرَاءَى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ

(1) أساس البلاغة لاپەرە (494).

﴿مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ﴾[2]. واته: هاوەڵانی موسی (علیه السلام) گوتیان ئێمە دەستەو تاقمی (فرعون) پێمان دەگەن، لە شوێنێکی دیدا دەفەرموێ: ﴿لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ﴾ (الأنعام 103)، واته: چاوەکان خوا دەرك ناکەن و پێی ناگەن، بەڵام ئەو چاوەکان دەرك دەکات، کەواته (إدراك) هەم بە مانای پێگەیشتن و هەم بە مانای پەی پێبردنی تەواویش دێت (الأحاطة الكاملة بالشيء) بەتەواویی دەورەی شتێك بدەی و بیزانی، هەر بۆیە خوا (عزّوجل) (إدراك)ی لە بارەی خۆیەوە نەفی کردووەو فەرمووییەتی چاوەکان دەرکی ناکەن.

3- (التصوّر) توێژەرەوەی قورئان (فخرالدین الرازي) لە بارەی وشەی (تصوّر)ەوە[1] دەڵێ: (إذا حصل وقوف القوة العاقلة على المعنى وأدركه بتمام فذلك هو التصور)، واته: ئەگەر عەقڵ لەسەر شتێك وەستاو بە تەواوی زانی ئەوە پێی دەگوترێ (تصور) دیارە کە دەشگوترێ (تَصَوَّرَهُ) واته: هێنانە نێو مێشکی خۆی.

4- (الحفظ) پاراستن (حافظة) بەشێکە لە دەماغ کە شتەکان لە خۆیدا دەپارێزێ، (الجرجاني) دەربارەی ئەم وشەیە گوتوویەتی: (الحفظ هو ضبط الصور المدركة)[2]. واته: (حفظ) بریتییە لە پاراستنی وێنەی شتە زانراوەکان، کەواته: بەشی (حافظة) لە

(2) ( الشعراء : 61 ).

(1) مفاتيح الغيب لاپەرە (282) بەرگی (1)

(2) مفاتيح الغيب لاپەرە (282) بەرگی (1)

مێشکدا ئەو بەشە گرنگەیە کە فۆتۆکۆپی شتە زانراوەکان دەپارێزێ و هەڵیان دەگرێ.

5- (التذكّر) وەك (الجرجاني) دەڵێ: بریتییە لە (أسترجاع الصور المحفوظة الزائلة عن القوة العاقلة)[1]، واتە: گێڕانەوەی وێنە پارێزراوەکانە دوای ئەوەی لە زەین چوونە دەرەوە دەگێڕرێنەوە بۆ نموونە تۆ کەسێك دەبینی: پێت دەڵێ: نامناسییەوە؟ تۆش ماوەیەك سەیری دەکەی و سەرنجی دەدەی ئەوە لەو کاتەدا (ذاکرة)ت خەریکی فایل هەڵدانەوەیەو وردە وردە لەگەڵ ئەو کەسەدا بەراوردیان دەکات پاشان زۆرجاران لە کەمتر لە چرکەیەکدا جاری وا هەیە لە 1/100 ی چرکەیەك (ذاکرة) ئەو پرۆسە (عملیة)یە ئەنجام دەدات و دوایی بەو کەسە دەڵێی تۆ فلان کەسی، کە ڕەنگە (20) ساڵ پێشتر تۆ ئەو کەسەت دیتبێ!!

6- (الفهم) تێگەیشتن، ئەمیش بەم شێوەیە پێناسەکراوە (تصوّر الشيء من لفظ المخاطب) حاڵی بوون لە شتێك لە بێژە (لفظ)ی ئەو کەسەی کە لەگەڵت دەدوێ، وشەی (إفهام)و (تفهیم)یش بریتییە لە گەیاندنی مانا بۆ تێگەیشتنی بیسەر، وەك (فخرالدین الرازي) لە تەفسیرەکەیدا پێناسەی کردوە[2]، خوای پەروەردگاریش دەربارەی

(1) مفاتيح الغيب لاپەرە (282) بەرگی (1)
(2) مفاتيح الغيب لاپەڕە (283)بەرگی (1)

(سليمان) - عليه السلام- دەفەرموێ: ﴿ فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ .﴾[3].
واتە: (سلێمان)مان تێگەیاندو لێمان حاڵی کرد.

7- (الفقه)یش بریتیە لە چاك تێگەیشتنی شت و بە قووڵی تێگەیشتنی شت، وەك خوای پەنهانبیــن دەفەرموێ: ﴿ فَمَا لِهَؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴾[1]. واتە: ئەو کۆمەڵە بۆچی ئاوان؟ هەر نزیکیش نین چاك لە قسە حاڵی بن، (فهم) بریتیە لە هەر جــۆرێك (مطلق)ی تێگەیشــتن، بەڵام (فقــه) ورد تێگەیشــتن وچاك تێگەیشتنە.

8- (العقل) ئەصڵی وشەی (عقل) بە مانای بەستنەوە (حبس) دێت، (عقال) بەو شتە دەگوترێ کە حوشتری پێ دەبەستریتەوە، (عقل)یش بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە ماناو زانیاری یەکان لە نێو خۆیدا دەبەستێتەوە، وە لەبەر ئەوەش ئینسان لە شتی خراپ دەگێڕێتەوەو دەبەستێتەوە، وە (عقل) ئاوا پێناسە کراوە لەلایەن (الجرجانی)یەوە: (العلم بصفات الأشياء من حسنها وقبحها وكمالها ونقصها) واتە: عەقڵ بریتیە لە دەرك كردنی شتان چاکیی و خراپییان، وە جوانیی و ناشیرینیان، وە تەواویی و ناتەواویی یان.

9- (الدراية) ئەو وشەیەش بریتیە لە زانین و ناسینی شــــتێك بە هۆی پێشەکییەك و بە هۆی لێورد بوونەوەوە.

---

(3) الأنبياء (79).

(1) النســاء (78).

10- (الرويَّة) ئەمیش بریتییە لەوە کە دوای بیرلێکردنەوە شتێك بزانیت.

11- (الحكمة) ئەمیش ئاوا پێناسە کراوە (الأصابة في القول والعمل)[2]. پێکان و هەنگاوتن و لە نیشانەدان لە قسەو لە کردەوەدا، (حکیم) کەسێکە هەم قسەی لە جێی خۆیدا بێ و هەم کردەوەی لە جێی خۆیدا بێ، خوای پەروەردگاریش (حکمة)ی بە شێکی زۆر گەورەو پەسند داناوەو فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾[1] واتە: وە هەر کەسێك حیکمەتی پێ ببەخشرێ خێرو چاکەیەکی زۆر مەزن و گەورەی پێ بەخشراوە.

12- (البديهة) مانای ئەم وشەیەش بریتیە لە: ناسین و زانینی شتێك بە بێ بیر لێکردنەوە، وەك دەگوترێ: ئەو شتە شتێکی (بدیهي)یە واتە بەڵگە نەویستە، وەك دوایی باسی دەکەین کە زانایان دەڵێن: لە عەقڵی ئینساندا کۆمەڵێك یاسا هەن پێیان دەگوتری بەڵگە نەویستەکانی عەقڵ (البديهيات العقلية) وەك ئەوە کە تۆ دەڵێی بەش(جزء) بچووکترە لە هەموو(کل)، واتە: بەشێکی شتێك بچووکترە لە شتەکە، یاخود دەڵێی: دوو شتی دژ بە یەك پێکەوە کۆنابێتەوە، بۆ نموونە: ناگونجێ شتێك هەشبێ و نەشبێ.

13- (الكياسة) ئەویش بریتیە لەوە کە عەقڵ لە ئەنجامی ڕامان و بیرکردنەوە بگاتە جۆرە ئەنجامگیریی (استنتاج)ێك کە سوودو

---

(2) (القاموس المحيط) لاپەرە (98) بەرگی (4) .
(1) ( البقـرة : 269 )

بەرژەوەندی تێدایە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (الكَيِّسُ مَنْ دان نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِما بعد الموت) واتە: (كَيِّسْ) كەسێكە خۆی سەركۆنە بكات و ئیش بۆ دوای مەرگ بكات، (كَيِّسْ)یش بابای عاقڵ و تێگەیشتوویە.

14- (الخُبْرة) واتە: شارەزایی، كە جاری وایە لە ڕێگای ئەزموون (تجربة)وە وەدەست دێ، ئەگەر بۆ ئینسان بێ، وەك دەڵێن: فلان كەس (خبیر)ە واتە: ئەزموونی زۆری هەیە لە كارەكەیداو شارەزایی و (خبرة)ی پەیدا بووە، جاری واش هەیە بەبێ ئەزموون كە دیارە ئەویش تایبەتە بە خوای پەروەردگار چونكە یەكێك لە سیفەتەكانی خوا (خبیر)ە، وەك دەفەرموویێت ﴿وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾[1]. چونكە خوای كاربەجێ بەبێ تەجرەبەو ئەزموون شارەزایی (مطلق)ی هەیە، ئەسڵی (خبرة)یش ئەوەیە كە نێوەوەی شت و دیوە پەنهانەكەی بزانێ، بۆیەش خوای پەنهانبین سیفەتی (خبیر)ی بۆ خۆی بەكارهێناوە.

15- (الفراسة) بەم جۆرە پێناسە كراوە: زانینی پەنهانی شتێك بە هۆی ڕواڵەتەكەیەوە (الإستدلال بالخَلْقِ الظاهر على الخُلُقِ الباطن)[2]. خوای بێهاوتاش دەفەرموێ ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ﴾[3] واتە: بە ڕاستی لەو بەسەر هاتەدا چەندان نیشانە هەن بۆ كەسانێك كە (فراسة)و (توسّم)یان هەبێت، (مُتوسِّم)یش هاو واتای

(1) الملك : 14
(2) مفاتيح الغيب ، ب 1 ل 285
(3) الحجر: 75

(متفرس)ە کە بە نیشانەکانی ڕواڵەت لە شتی پەنهان و نێوەوەو (باطن)ی شتان حاڵی بێت و تێ بگات.

ئەوە بە کورتی پێناسەی زانیاری (علم)و زانست (معرفة)و ئەو وشانەی کە لێیانەوە نزیکن، ئێستاش نۆرەی خاڵی دووەمە:-

## (خاڵی دووەم): تیۆری زانست (نظرية المعرفة) چی یە؟ وە لە کەیەوە سەری هەڵداوە؟!

لە کتێبەکانی ژیربێژی (منطق)و کتێبەکانی فەلسەفەو حیکمەتدا، وە لە کتێبەکانی (عقائد)ی خۆماندا، باسی ئەو مەسەلەی (تیۆری ناسین)[1]ە کراوە، بەڵام زانایانی پێشوومان بەو زاراوەیە، کە ئێستا باوە تەعبیریان لــێ نەکردوە، جا شایانی باسە، کە ئەو مەسەلەیە ئێستا یەکێك لە بابەتە هەرە گرنگەکانی فەلسەفەو حیکمەت و زانیاری و زانستە، کەواتە با سەرنج بدەین و بزانین ئەو بابەتە چی یەو چۆنەو لە کەیەوە سەری هەڵداوە، سەرەتا دەڵێین: لە زمانە ئەورووپاییەکاندا ئەم مەســـەلەیە پێی دەڵێن: (ئەبستمۆلۆژیا)، کە بەم شێوەیە پێناســـەیان کردوە، دەڵێن: تیۆری ناسین (نظرية المعرفة) ئەو جۆرە زانستەیە کە لە سەرەتاکانی (مبادیء)ی شت ناسین دەکۆڵێتەوە، واتە: ئینسان چۆن شت دەناسێ و پەی پێ دەبات، بنچینەکانی شت ناسین چین؟، سروشتی شت

(1) وشەی (معرفة) هەم بە مانای (زانست) و هەم بە مانای (ناسین) یش بەکاردێ.

ناسینی ئینسان چۆنەو چۆن دەتوانێ دەرك بە شتان بكات؟ سەرچاوەكەی چی یە؟ قیمەت و بەهای ئەو شت ناسینەی ئینسان تا چ ئەندازەیەكە؟ سنوورەكانی شت ناسین چین و ئینسان، تا چ ئەندازەو سنوورێك دەتوانێ شت بناسێ؟ پەیوەندی لە نێوان ئینسان كە خودی ناسەرەكەیە لەگەڵ شتە ناسراوەكەدا چۆنەو چ پەیوەندی یەك لە نێوانیاندا هەیە؟ وە ئایا تا چ ئەندازەیەك بۆچوونەكانی ئێمە پڕ بە پێستی ئەو واقیعەن كە دەیناسین؟[1] .

بەڵێ تیۆری ناسین لەو شتانە دەكۆڵێتەوە:-

ئێستاش بۆ ئەوەی زیاتر ئەو مەسەلەیە ڕوون بكەینەوە دەڵێین، دیارە ئینسان هەر لەو كاتەوە كە لەسەر زەوی دانراوە یەكەمین ئینسان (ئادەم) سەلامی خوای لەسەر بێ، دەستی كردوە بە تێوەڕامان و سەرنجدانی دەوروبەرو بوونەوەرو خۆی و ئەو شتانە كە دەیانبینێ و هەستیان پێ دەكات، كەواتە سەرنجدان و تێوەڕامان و تەماشاكردن و لێووردبونەوە یەكێكە لە تایبەتمەندی یەكانی ئینسان، چونكە ئینسان عەقڵی هەیەو هەر كەسێكیش عەقڵی هەبێ بەو عەقڵە سەرنج دەدات، سەرەتا لە ڕێی پێنج هەستەكانەوە، چاو دەیەوێ ببینێ، گوێ دەیەوێ ببیستێ، هەروەها هەستەكانی دیكەش دەیانەوێ دەركی شتەكان بكەن و بیانناسن و لێیان حاڵی بن، بەڵێ بێگومان هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی

(1) المعجم الفلسفي ل 478 ب 2 كتێبی (مصادر المعرفة في الفكر الديني والفلسفي) ل 50، لێی وەرگرتوە.

نهێنیەکان، وەخۆناسین‌و دەوروبەر ناسین و پاشان خوا ناسین، پاڵنەرێکە لە پاڵنەرو غەریزە خوارسك (فطري)ەکان کە خوای پەروەردگار لە دەروونی ئینساندا دایناوە وەك گەلێك غەریزەو هاندەری دیکەی، تاکو بە هۆیانەوە ئەرکی پێشیانیەتی و تاقیکرانەوەو هەڵگرتنی ئەمانەتی خوا جێبەجێ بکات.

دیارە لە ڕوانگەی ئێمەی مسوڵمانەوەش پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سەر قافڵەو پێشڕەوی ئەو ڕەوتە بوون کە ئەم بوون (وجود)ە بە خەڵك بناسێنن: ئایا بوونەوەر چیە؟ ئاسمان و زەوی چین؟! ئینسان چیە؟ لە کوێوە هاتوەو بۆچی و بۆ کوێ دەچێ؟ وە خوای باڵادەست چ (ذات)ێکەو سیفەتەکانی چین؟ وە ئایا دەبێ هەڵوێستمان لە بەرامبەر خوادا چی بێ وە چۆن بەندایەتی بۆ بکەین؟! وە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەو مەیدانەدا وەك زۆر مەیدانی دیکەش سەر قافڵەو پێشڕەوی مرۆڤایەتی بوون، وە خوای کاربەجێ دەربارەی یەکەمین ئینسان کە یەکەمین پێغەمبەریشە ئادەم (علیه السلام) دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ (البقرة: 31)، واتە: هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد، کەواتە لە ڕوانگەی ئێمەی مسوڵمان و ئیسلامییەو پێمان وایە کە سەرچاوەی زانیاری (علم)و زانست (معرفة) بە پلەی یەکەم لە خواوەیەو لە (وحي)و پەیام و دینەوەیە، بەڵام ئێمە جارێ باسی ئەوە دەکەین کە ئینسان وەك ئینسان بەبێ ئەوەی کە بەهرەمەند بووبێ لە هیدایەتی

خوا، ئایا لە کەیەوەو چۆن دەستی کردوە بەوە کە شت بزانێ و شت دەرك بکات، وە ئایا ئینسان بەبێ هاوکاریکردنی(وحي) خوای بەخشەرو بەبێ بەهرەمەندبوون لە هیدایەتی خوا (تبارك وتعالى) تا کوێ دەتوانێ شت بزانــێ و شـــت بناســێ و دەرکی شتان بکات؟! لە پێشەوە باسی ئەوە دەکەین، دوایی دێینە ســەر باســـی ئەوە کە لە ڕێی (وحي)یەوە چۆن مەتەڵەکان هــەموویان حەل دەبن و چۆن نهێنییەکــان هەموویان بۆ ئینسان ئاشکرا دەبن، هەڵبەتە ئەوەی کە خــوای کاربەجێ مەبەستی بێت و بیەوێ ئینســان لەم ژیانە سەرزەمینییەدا بیزانــێ.

ئاشکراو باوە کە (یۆنانی)یەکان یەکەمین کەســـانێك بوون کە بە فەلسەفەو حیکمەتەوە ناسراون بە پێی ئەو زانیاریانەی کە بۆ ئێمە تۆمارکراون و نوســـراون لە مێژوودا، ئەگەرنا بێگومان پێش ئەوانیش (ئیغرقیەکان)و پێش ئیغریقیەکانیش ئەکەدی یەکان و میصری یەکان و هندیش بوون، وشەی فەلسەفە بە مانای خۆشەویستی حیکمەت (حب الحكمة)ەو حیکمەتیش یەکێك لە ماناکانی ئەوەیە دەرکی نهێنی یەکان شتان بکەی.

وە یەکەمین فەیلەسوفێکی یۆنانی کە باسی ناسین (معرفة)و پەی بردن بە نهێنی یەکانی شتی کردوە (سوکرِات) بووەو کە لە ساڵی (399)ی پێش زاینی مردوە، واتە (400) ساڵ پێش ئەوەی (عیسی) (سەلامی خوای لەسەر بێ) لەدایك بێ (سوکرِات) مردوەو پێشتــر ژیاوە، کاکڵەی فەلسەفەو حیکمەتی (سوکرِات)یش ئەوە بوو کە

گوتوویەتی: (أعرف نفسك بنفسك) خۆت بناســـە بە هۆی خۆتەوە، وە (سوکرِات) یەکەم کەس بووە کە لەو بارەوە شتی نووسیوە، وە زۆر پشتی بە عەقڵ بەستوەو زۆر گرنگی بە پێنج هەستەکان نەداوە، لە دوای ئەو (ئەفلاطوون) کە فەیلەسوفێکی دیکەیەو قوتابی (سوکرِات) بووەو لەسەر هەمان رِچەی مامۆستاکەی رِۆیشتوە، ئەویش هیچ بایەخێکی بە پێنج هەستەکان نەداوەو بیردۆزەی ئایدیاکان (المُثُل)ی داناوە، کە ئەوە باس وخواسێکی درێـژی لەســــەر هەیەو کورتییـــەکەی ئەوەیە کە (ئەفلاطوون) پێ وابووە لەم بوونەوەرەدا هەر شتێك کە هەیەو دەبینرێ بریتیە لە خەیاڵ و ســــێبەری شتێکی رِاستەقینە لە جیهانی مەعناو رِووحـدا بە تەعبیری(ئەفلاتون) لە جیهانی ئایدیا (مثال)دا، جا لەسەر ئەوە زۆر نموونەی هێناونەوە بەڵام هەمووی شتی خەیاڵییـــە، ئەو بە حیسابی خۆی دەڵـێ: هەرچی ئێمە دەیبینین لە دونیای واقیعدا سێبەرو فۆتۆکۆپیەو نوسخە ئەصلی یەکەیان هەمووی لە عالـــەمی رِووح و مەعنــــادایە لای خوا (سبحانە و تعالی). هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەفلاتوون مەبەستی لەو قسـەیە ئەوە بوو کە ئەو شتانەی لای خواو لە عیلمی خوادا هەن، بەڵام لە رِاستیدا ئەو بە رِاشکاویی وای نەگوتوە ئەگـەرنا ئەگەر وا بڵـێ بێگومـان ئەو شـــتێکی رِاست و بەجێیە[1]، بە هەرحاڵ ئەفلاتوونیش هەر لەسەر رِچـــەی (سوکرِات) رِۆیشـــتوە لە

(1) کە لە قورِئاندا بە (لوح محفوظ) و (إمام مُبین) تەعبیـری لێداراوە: ﴿ بل هو قرآن مجيد في لوح محفوظ ﴾ البروج 21- 22 ﴿ وكل شيء أحصيناه في إمام مبين ﴾ (يس 12)

ڕووی ڕێبازو چۆنیەتی شت ناسین و دەرککردنی شتانەوەو گوتوویەتی ئینسان بەس بە عەقڵ شت دەزانێ.

بەڵام (ئەرستۆ) کە قوتابی ئەفلاطوون بووە، ئەو بە پێچەوانەوە گوتوویەتی ئینسان هەم بە عەقڵ شتان دەرك دەكات و هەم پێنج هەستەكانیش زۆر دەوریان هەیە لەوەدا، كە ئینسان شتیان پێ بناسێ و دەرك بكات و مەعلوومات بهێننەوە بۆ عەقڵ. بەڵام هیچ کام لە (سوکرات)و ئەفلاطوون و ئەرستۆ بە هیچ شێوەیەك باسی (وحي)و پێغەمبەرایەتی و پەیامو دینی خوایان نەکردوە، بە پێی ئەوە کە لەوانەوە پێمان گەیشتوە لە کتێب و بەرهەمە نووسراوەو تۆمارکراوەکانیاندا کە مەرجیش نیە هەموویان بن، چونکە وا دیارە لە سەردەمی ئەواندا هیچ پێغەمبەر نەهاتوون، یاخود ئەگەر هاتبیشن ئەو برادەرانە زۆر خۆیان پێ زانا بووەو گوێیان بۆ بانگی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەگرتوەو گرنگی یان پێ نەداون، وەك خوای زاناو شارەزا لە ئایەتێكدا لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ ﴾[1]، واتە: كاتێك پێغەمبەرەكانیان بە بەڵگەی ئاشكرا وە هاتنە لایان ئەوان دڵخۆش بوون بەو ئەندازە زانیاری یەی كە لە لایانەو گوێیان بە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) نەدا، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن لێرەدا مەبەست پێ فەیلەسووفەكانی

(1) غـافر: 83

یۆنانە چونکە هیچ نەتەوەو گەلێك نەبووە کە پێغەمبەری بۆ نەیەت[2]، هەندێکی دیکەش دەڵێن لەو ماوە کەمـــــەی کە(سـوکرات)و (ئەفلاطوون)و (ئەرِستۆی) تێدا ژیاون هیچ پێغەمبەری خوا نەهاتوون، پێغەمبەرەکانی دیکەش کە هاتوون بەرنامەکانیان تێکدراون و شـــێوێنراون و ئەفســـانەی زۆریان لەگەڵ تێکەڵ کراون، بۆیە ئەو فەیلەسووفانەش متمانەیان پێیان نەکردوەو ئیعتمادیان لەســـەر عەقڵی خۆیان کردوە بۆ ناسینی خواو ناسینی دەورووبەرو بوونەوەر.

بەهەرحاڵ ئێمە ئێستا باسی فەلسەفە ناکەین، باسی ئەوە دەکەین ئینسان چۆن هەوڵی داوە شت بزانێ و بناسێ، جا یەکەمین کەسانێك ئەو فەیلەسووفانە بوون کە لەوبارەوە دواون و قسەیان کردوە، وەك لە مێژوودا بۆمان تۆمارکراوە، دیارە زۆر نزیکە لە پێش وانیشدا خەڵکی دیکە بووبێ و شتی زۆر چاکی گوتبێ، بەڵام پێمان نەگەیشتوەو ئەوەی کە نووسرا بێت تەنها بەرهەمەکانی ئەوانەیە کە باســـمان کردن و هەمووشیان لە پێش مەسیح دا بوون (علیه الصلاة والسلام) .

پاشان هەروا لەسەر ئەو رِچەیە یۆنانی یەکانیش و رِۆمانی یەکانیش رِۆیشتوون، هەروەها ئەوروپایەکانیش، دیسان زۆرێك لە زانایانی ئایینی

(2) وەك خوای بە بەزەیی فەرموویەتی: ﴿ وإن من أمة إلا خلا فيها نذير﴾ (فاطر 24) ، واتە: وە هیچ کۆمەڵێك نەبووە، کە ئاگادار کەرەوەیەکی تێدا رِەوانە نەکرێ.

نەصرانیی هەتا دوای ســــــەدەکانی نێوەڕاست[1]، لەسەر ئەو ڕچەیە ڕۆیشتوون، تا لە ساڵی (1690)ی زایینیدا فەیلەسووفی ئینگلیزی (جۆن لوك) کتێبێکی چاپکرد ناوی نا: (وتارێك دەربارەی بیرو مێشکی ئینسان)، ئەو کابرایە هەستا شیتەڵی مێشکی ئینسانی کرد، کە مێشــکی ئینسان لەو بەشانە پێك دێت و ئاوا شت دەرك دەکات و مەعلووماتەکانی ئەوەندە جێی متمانەن و ... هتد، بۆیە ئەورووپاییەکان ئەو (جۆن لوك)ە بە دامەزرێنەری (تیۆری ناسین) لە قەڵەم دەدەن، هەر چەندە (ئیمانۆئێل کانت)یش یەکی دیکەیە لەو زاناو فەیلەسووفانەی کە لەو بوارەدا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە، شایانی باسیشە (کانت) لە ساڵی (1804)دا کۆچی دوایی کردوە واتە لە ســــەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا ژیاوەو مردوەو لێکۆڵەرەوان بە زەبر دەســــتترین کەسی دادەنێن لە دوای (جۆن لوك) کە تیۆری ناســـینی باش ڕوون کردۆتەوەو باسی کردوە کە ئینسان ئاوا شت دەزانێ‌و دەناسێ‌و عەقڵ ئەوەندە دەوری هەیەو هەستەکان ئەوەندە دەوریان هەیەو ...هتد، هەڵبەتە ئەوە بە پێی بیــروباوەری زانا ئەورپایی و ڕۆژئاواییەکان، ئەگەرنا بە پێی بیروباوەڕی ئێمەی مسوڵمان دەڵێین: جارێ هەر لە قورئاندا خوای پەروەردگار ناسین و دەرککردنی شتی زۆر بە جوانی بۆمان ڕوون کردۆتەوە وەك دوایی بە درێژی باسی دەکەین، وە زانایانی ئیسلام پێش (جۆن لوك) دەربارەی

---

(1) سەدەکانی نێوەڕاست بە نسبەت ئەورووپا ئەو دە سەدەیەن کە دەکەونە نێوان سەدەی پێنج و سەدەی شازدەوە .

تیۆری ناسین (نظرية المعرفة) زۆر شتیان گوتوەو نووسیوە، یەکێك لەوانە (عبدالجبار الهمداني) کتێبێکـــــی هەیە بە ناوی (المُغْني) کە چەند بەرگێکەو هەمووی دەربارەی عەقیدەیە بەرگێکـــــی کتێبەکەی بەم ناونیشانەیە (النظر والمعارف) (سەرنجدان و ناسینەکان) کە لە (70) وردە بەش پێك دێت و هەمووی دەربارەی ئەوەیە کە ئینسان چۆن شت دەزانێ و دەناسێ؟ عەقڵ چۆنە؟ پێنج هەستەکان چۆنن پەیوەندی یان بە (وحی)یەوە چۆنە؟ ئەوانە هەموو باس دەکات.

هەروەها (الباقلاني)یش لە کتێبی (التمهيد)دا دیسان پێشەکییەکی گرنگی لەو بارەوە نووسیوە، دیسان (فخرالدين الرازي) کتێبێکی هەیە بە ناوی (المحصول في علم الأصول) ئەویش بە هەمان شێوە باسی ئەو مەسەلەیەی کردوە، (عضـــــدالدين الأيجي)یش کتێبکی هەیە بە ناوی (المواقف) کە کتێبێکی بەناوبانگە ئەویش باسی ئەو بابەتەی کردوە، (شيخ الاسلام ابن يمية)ش کتێبێکی هەیە کە(10) بەرگە بە ناوی (درأ التعارض بين العقل والنقل)((لابردنی تێکگیرانی عەقڵ و نەقڵ))، واتە عەقڵ و(وحي) کە لە سەرجەم کتێبەکەدا باسی ئەو مەسەلەیە دەکات، جا بەڕێزان ئەوەی کە باسمان کرد شتێکی زۆر کورت و گوشراو بوو لە بارەی مێژووی پەیدا بوونی تیۆری ناسین (نظرية المعرفة)ەوە ئەگەر نا ئەو مەسەلەیە لق و پۆپی زۆرن و بابەتێکی قووڵ و بەرفراوانە.

## خاڵی سێیەم: ئایا زانین و ناسین بۆ ئینسان شتێکی گونجاوە ؟!

مەبەستمان لەو پرسیارە ئەوەیە کە ئایا ئینسان توانای ئەوەی پێ دراوە و شایستەیی ئەوەی هەیە کە پەی بە شتەکان بەرێت و دەرکیان بکات، وە تا چ ئەندازەیەك دەتوانێ، ئایا دەتوانێ بە مانای و شە پەی بەرێت بە ماهییەت و حەقیقەتیان، یان هەر وا دەتوانێ زانیاری یەکی کورتیان دەربارەی بزانێ؟

لەو بارەوە زاناو فەیلەسوفە ئەوروپایی و ڕۆژئاوایییەکان بوونەتە دوو بەش: بەشێکیان گوتوویانە بەڵێ ئینسان دەتوانێ شت بزانێ و بناسێ و توانای دەرککردنی حەقیقەتی شتانی هەیە، ئەوانە پێیان دەگوترێ بڕوادارەکان (الاعتقادیون) یاخود پێیان دەگوترێ : شوێن کەوتووانی ڕێبازی یەقین، بەشێکی دیکەیان گوتوویانە: نەخێر ئینسان ناتوانێ

هیچ شتێك بزانێ و هەرگیز سەری لە هیچ دەرناچێ، ئەوا ئەش پێ یان دەگوترێ گومانداره کان (الشکاکون) یان پێ یان دەگوترێ شوێنکەوتووانی ڕێبازی گومان، هەڵبەتە گومان (شك)یش دوو جۆرە: گومانی (مطلق) هەیەو گومانی بەرنامەیی (الشك المنهجي) یش، گومانی ڕەها فیکرەی ئەوانە بووە کە گوتوویانە ئینسان ناتوانێ هیچ شتێك بزانێ، ناتوانێ بڵێ ئەو شتە هەیە یان نیە، بۆ نموونە: لە باسی خوای پەروەردگاردا گوتوویانە: نازانین نە هەیە نە نا، یان ئەو خۆرە کە لەبەرچاوە گوتوویانە: نازانین نە هەیە نە نا، ڕەنگە چاومان بە هەڵەدا چوو بێت، ئەوە گومانی ڕەهایە، یان گومانی یەکجارەکی و ڕاستەقینە.

جۆرەکەی دیکەیان پێی دەگوترێ گومانی بەرنامەیی، دیارە ئەو جۆرەیان لە ئیسلام دا جێی دەبێتەوەو یەکێك لەو زانایانە کە گومانی بەرنامەیی کردۆتە ڕێبازێك و پێی دا گەیشتۆتە یەقین هەڵبەتە بە حیسابی خۆی و ئێمەش تا ئەندازەیەك پشتگیری دەکەین (أبو حامد الغزالی)یە کە خاوەنی چەندان کتێبە یەکێك لەوانە (احیاء علوم الدین)ە و غەزالی زانایەکی پایە بەرزی (زانیاریە شەرعیەکان) بووە لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیان دا لە نێوان تەمەنی (40- 50) ساڵی دا وەك خۆی باسی دەکات[1]. کەوتۆتە گومانەوەو لە دوو دڵی دا بووەو دوایی چۆن ڕزگاری بووە، دەڵێ: وام لێهات لە هەموو شتێك دوو دڵ بووم، ئایا ڕاستە چاوم ئەو شتانە دەبینێ؟ ڕاستە گوێم ئەو

(1) بڕوانە (المنقذ من الضلال) کە ئیمام غەزالی خوا لێی خۆش بێت بە درێژی بەسەرهاتی کەوتنە گومانی خۆی و گەڕان و پشکنینی و پاشان دەرباز بوونی گێڕاوەتەوە.

شتانە دەبیستیێ؟ عەقڵ دەڵێ ئەو شتە وایە ئایا ڕا ستە، ڕا ست نـ یە؟ پاشان دەڵێ لە ئەنجامی زۆر بیر کردنەوەدا خوای پەروەردگار هیدایەتی دام و دووبارە گەڕامەوە سەر ئەوەی کە متمانەم بە عەقڵ و هە ستەکانم هەبێت، وە سەرنجام گەیشتمە یەقین، جا ئەو دەڵێ لە مەعری فەتێکی دەروونییەوە گەیشتمە یەقین، کە بێگو مان ئە گەر گوت بای لە مەعریفەتی (و حي) یەوە زۆر تەعبیرە کەی با شتر بوو، نەك لە مەعریفەتی دڵی (قلبـي)یەوە، جا دیارە ئەو ز یاتر پە سندی ڕێ بازی (تصوف) دەکات کە دەڵێ بە هۆی (تصوف) و (عر فان)ەوە لە ڕ ێی دڵەوە من گەیشتمە دڵنیایی (یقین)، جا هەر چەندە ئەو وای گو تووە بەڵام لە ڕاستیدا لە ڕێی (وحي) یەوە پ ێی گەی شتوە، ئە گەر نا دڵ چووزانێ ڕێبازی هیدایەت چیەو چۆنە، ئەگەر (وحي) بەرچاوی ڕۆ شن نەکاتەوە، بە هەرحاڵ لێرەدا مەبەستمان نیە زۆر باسی ئەو مە سەلەیە بکەین و تەنها ویستم ئاماژەیەکی پێ بکەم.

یەکێك لە فەیلەسووفە ڕۆژئاواییەکانیش کە زۆر بە خەستی و قووڵی گیرۆدەی ئەو دوو دڵییە بووە (دیکارت)ە، کە لە ساڵی (1650)م مردووەو فەیلەسووفێکی فەڕەنسی بووە، جا (دیکارت)یش بە سەرهاتی کەوتنە گومانی خۆی دەگێڕێتەوەو باس دە کات کە لە یەکێك لە قۆناغەکانی کەوتنە گومانی وای لێ هاتوە کە لە هەموو شتێکدا کەوتۆتە دوو دڵییەوە، تەنانەت بوون (وجود)ی خۆیشی.

دوایی بەوە خۆی ڕزگارکردوە کە گوتوو یەتی ( من بیر دەکە مەوە کەواتە من هەم) (أنا أفكر إذاً أنا موجود)، دیارە ئەو جۆرە کەوتنە دوو

دڵـی و گومانەش هەرچەندە ئەنجام و بەرهەمی بیرکرد نەوەی قوو ڵە، بەڵام حاڵەتێکی سەیرو دەگمەنەو جۆرە نەخۆشییەکی فیکرییە شە، بە هەرحاڵ (دیکارت) سەرەتا دەربارەی بوونی خۆی گو مانی نەماوەو گەی شتۆتەوە یەقین، پا شان وردەوردە دەر بارەی شتەکانی دی کەش گەیشتۆتە دڵنیایی و لە کۆتاییشدا لە بارەی بوونی خوای بەدیهێنەریش گەیشتۆتە حاڵەتی دڵنیایی و (یقین).

کەواتە لە راستیدا ئەوانەی کە پێیان دە گوترێ: ( شوێنکەوتووانی رێبازی گومان و دوو دڵیی) تەنها گ یـرۆدە بوونی گو مانی رە ها دەگرێتەوە نەك کەسانێکی وەك (غەزالـی و دیکارت).

جا یەکێك لەو فەیلەسووفانەی کە خاوەنی گومانی رەها بووەو لە ساڵی (380) پێش زایینـدا مردووە ناوی (جۆرج یاث)ە چا تەما شا بکەن (جۆرجیاث) بیروبۆچوونی دەربارەی ناسین و زانینی شت چۆنە؟ دەڵـێ هیچ شتێك بوونی نیە، وە ئەگەر گریمان شتێکیش هەبێ ئینسان ناتوانێ بیزانێ و بیناسـێ، وە ئەگەر گر یمان ئین سان بیشینا سێ و پەیشی پێ بەرێ ناتوانێ بە خەڵکی دیکەی بگەیەنـێ[1].

یەکێکی دیکەش لەوانە کە رەنگە بە دامەزرێنەری رێبازی گو مان (مذهب الشك) دابنرێ فەیلەسووفێکی یۆنانییە بە ناوی (بیرون) کە لە ساڵی 275 پێش زایین مردووە، دەڵێ پێویستە متما نەمان بە پ ێنج هەستەکانمان نەبـێ، وە متمانەمان بە عەقڵیش نەبێ، وە پێویستە بە

(1) ( فلسـفتنا ) محمد باقر الصدر لا(109).

بێ بیـرورِا بمێنینەوە، وە پێویستە بڵێیـن ئەو شتە نە هەیەو نە نییە، یاخود دەبێ بڵێـین هەشە و نیشە!!

هەروەها (سوفسطائي)یەکان هەبوون، کە ئەوانیش لەوانەی رِابردوو نزیکن، ئەوانیش گوتوویانە: مرۆڤ لە هیچ شتێك نازانێ، تەنیا لە رِێی پێنج هەستەکانەوە شت دەزانێ و پێنج هەستەکانیش بە هەڵەدا دە چن، کەواتە متمانە بە هیچ شتێك ناکرێت، گوتوویانە پێنج هەستەکان بەم شێوەیە بە هەڵەدا دەچن، بۆ نموونە: قەڵەمێك لە نێو پەرداخێك ئاو بهاوێی سەیری دەکەی وا دەزانی کە ئەو قەڵەمە شکاوە کە چی واش نیە!، وە دەڵێن: سەیری مانگ بکەو سەیری خۆر بکە وا دەزانی کە بە ئەندازەی یەکدین لە قەبارەدا کەچی خۆر چەندان جار لە مانگ گەورەترە، دیارە ئەو کات ئەوەیان زانیوە کە خۆر لە مانگ و زەوی گەورەترە، ئنجا گوتوویانە: گوێ هەندێ شت دەبیستێ بەلاَم بە هەڵەدا دەچێ وە هەندێ شتیش هەر نابیستێ!! بە هەر حاڵ ئاوا لەو بارەوە شتیان گوتووە، کە پاشان ئێمە رِەدیان دەدەینەوە و باس دەکەین کە بە هەڵەداچوونی پێنج هەستەکان بەڵگە نییە لە سەر ئەوەی کە ئەو مەعلووماتانەی دەیهێنن هیچی جێی ئیعتبارو متمانە نییە. یەکی دیکەش لەو فەیلەسوفانە (ئەبیقور)ە کە لە ساڵی (270)ی پێش زایینی دا مردوەو ئەویش بە هەمان شێوە (سوفسطائي) بووەو متمانەی بە عەقڵ و پێنج هەستەکان نەبووە، هەروەها (رِەواقی)یەکانیش هەمان بیـروبۆچونیان هەبووە، شایانی باسیشە کە ئەو فەیلە سووفە لە

جیاتی زانا چاکتـر وایە بلێـین نەزانانە کە بڕوایان بەوە نەبووە ئینسان پەی بە هیچ شتێك بەرێ و هیچ شتێك بزانێ، سـێ بەش بوون:

یەکەم: (نەسەلمێنەکان) یان عینادی یەکان (العنادیّون) کە نکوولێیان لە حەقیقەتی شتەکان کردوەو گوتوویانە هەرچی دەبینرێ هەمووی وەهم و خەیاڵە .

دووەم: عیندیەکان (العندیة) کە گوتوویانە هەرشتێك کە هەیە، ئەگەر تۆ بلێی هەیە لای تۆ هەیە، لای منیش بە جۆرێکی دیکە هەیەو لای یەکێکی دیکەش بە جۆرێکی دی،کەواتە هیچ شتێك حەقیقەتێکی چەسپاو (ثابت)ی نیە، لای من مادام شتەکە دەزانم، هەیە لای یەکێکی دیکەش کە شتێکی لێ دەزانێ تا رادەیـــەك هەیە، بەڵام لای ئەو کەسەی کە هیچی لـێ نازانێ، شتەکە بوونی نیە.

سێیەم: نازانییەکان (اللاأدارية) ئەمانەش بە شێوەیەك بوون ئەگەر لێیانت پرسیبایە ئایا ئەو شتە هەیە؟ دەیگوت نازانم نە هەیە نە نیە، نازانم و ناڵێم هەیە یان نا.

ئەوە سەرجەم بیروڕای فەیلەسووف و ڕۆژئاواییەکان بەگشتی سەبارەت بەوەی کە ئایا ئینسان دەتوانێ شت بزانێ و بناسـێ یان ناتوانێ؟!

ئنجا ئایا لای ئەو زانا و فەیلەسووفە ڕۆژئاوایی یانە کە قەناعەتیان وابووە مرۆڤ شت بزانێ، ئایا چۆن چۆنی و لە چ ڕێیەکەوە دەتوانێ شتان بناسێ و بزانێ و پەییان پێ بەرێ، وە ئایا لە چ ڕێیەکەوە ناتوانێ و بۆی

مەیسەر نابێ؟ وە ئایا عەقڵ تا چ ڕاددەیەك جێی متمانەیە؟ وە پێنج هەستەكان تا چ ئەندازەیەك جێی متمانەن؟! بە پشتیوانی خوا (تبارك وتعالى) وەڵامی ئەو پرسیارانە و چەند پرسیارێكی دیكەی هاو

# دەرســـی دووەم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على ر سول الله محمد خاتم النبيين والمهتدين بهديه المبين.

بەڕێزان:-
ئەم دەرسەمان تەواوکەری بابەتی دەرسی پێشوویەو خاڵی چوارەمی گرتۆتە خۆی:

**خـاڵی چوارەم: لە چ ڕێیەکەوە دەستمان لە زانیاری و زانست گیـردەبێ؟!**

خوا یاربێ لە چوار بڕگەدا ئەم خــــاڵە ڕون دەکەینەوەو وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەینەوە:
**یەکـەم:** لە سۆنگەی ئەوەوە کە فەیلەسووفەکانی یۆنان هیچ ئاشنایەتی یەکیان لەگەڵ دینێکی ڕاســـت و دروستی خوایی نەبووە، بۆیە لە

کتێبەکانی خۆیاندا کەم و زۆر باسی (وحي)و پەیامی خوای پەروەردگاریان نەکردوە.

جا مێژوونووسان دوو شیکردنەوە (تحلیل)یان بۆ ئەو دیاردەیە هەیە: دەڵێن: یان ئەوەتا کە هەندێك مەعلوومات و زانیارییان دەربارەی (دین) پێگەیشتوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو دینەی کە بەوان گەیشتوە تێکدراوەو شێوێندراوەو شتی وای تێدا بووە کە پێچەوانەی عەقڵ و ژیری بووە، بۆیە هەرچی پێیان گەیشتوە لەو مەعلووماتە دینییە ڕەتیان کردۆتەوە، ئەمە قسەی هەندێك لە مێژوونووسانە.

هەندێکیشیان دەڵێن: لە سەردەمی (سوکرات و ئەفلاطوون و ئەرستۆ)دا کە بە چاخی زێڕینی فەلسەفە دادەنرێ، خوای بەرزو مەزن هیچ پێغەمبەرێکی بۆ شوێنی ئەوان ڕەوانە نەکردوە کە ئەوان لە (ئەسینا) پایتەختی ئێستای (یۆنان) بوون.

واش پێ دەچێ کە بۆچونی یەکەم ڕاستتر بێت و شتێکیان پێ گەیشتبێت و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە سەردەمی ئەوانیشدا بوو بن، بەڵام وەك چۆن ئێستا خەڵك بە هۆی بەرەو پێشچوونی زانست و تەکنەلۆجیاو پیشەسازییەوە گیرۆدەی لەخۆباییبوون بوون و خەڵکێکی عەلمانی گوێ نادات بە (وحي)و پەیامی خوای کاربەجێ وە بۆ خۆیان لە گێژاوی بیردۆزان دا دەخولێنەوە، دەگونجێ ئەو کاتیش هەروا بووبێت، ئەم دوو ئایەتەش بە بەڵگە دێنینەوە کە خوا تێیاندا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ

الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُون ، فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ﴾[1] واته: کاتێك که پێغەمبەرانی خۆیان بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراوە هاتن بۆ لایان، بەو کەمە زانیاری یەی کە لە لایان بوو دڵخۆش بوون و پشتیان لە پەیام و بەرنامەی خوا کردو سەرەنجام سزای ئەوە کە گاڵتەیان پێ دەکرد دەورەی دان، جا کاتێك کە سزاو تۆڵەی ئێمەیان بینی گوتیان: ئەوە ئیمانمان تەنیا بە خوا هێنا، وە هەرچی کە پێشتر هاوبەشمان بۆ خوا بڕیاردەدا ئەوە کوفرمان پێی کرد، بەڵام بێگومان ئەوکاتە (چ حاڵەتی سەرەمەرگ بووبێ چ حاڵەتی لەنێوچوون بوو بێ) ئیمانەکەیان هیچ ئیعتبارێکی بۆ دانەنراوە، چونکە بە ناچاری بووە.

جا بە هەرحاڵ چ بێئاگایی بووبێ، یان خۆ گێلکردن بووبێ، گرنگ ئەوەیە کە لە بەرهەم وکتێبی فەیلەسووفەکانی یۆناندا باسی (وحي)و پەیامی خواو ئەو زانیاریانەی کە لە ڕێی پێغەمبەرایەتی یەوە وەدەست دێن، نەکراوە.

وە یۆنانییەکان ئیعتیمادیان لەسەر دوو شتان بووە بۆ وەدەست هێنانی زانیاری و زانست، یەکەم: عەقڵ، دووەم هەستەکان، ئنجا لە نێو خۆشیاندا لەسەر ئەوە کە ئایا عەقڵ پێش بخەن یان هەستەکان، یان هەردووکیان وەك یەك دابنێن؟! وەکو (سوکرات)و (ئەفلاطوون) کە پێشتریش باسمان کرد بە بێبایەخی یەوە تەماشای ئەو زانیارییانەیان

---

(1) (غـافـر 83 ـ 84).

دەکرد کە لە ڕێی هەستەکانەوە دەستگیر دەبن، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەوان عەقڵ گەرا بوون و تەنیا پشتیان بە عەقڵ بەستوە.

کەچی (ئەرِستۆ) پشتی بە هەردووکیان بەستوە، وە هەندێکیشیان بوون کە پشتیان تەنیا بە هەستەکان بەستوە، وەك (سوفسطائي)یەکان کە هیچ گوێیان بە عەقڵ نەداوە، ئەوە سەبارەت بە یۆنانییەکان ئاوا بووە.

**دووەم:** لە سەدەکانی نێوەڕاستدا (العصور الوسطی)، دەربارەی ئەوە کە ئایا ئینسان لە چ ڕێیەکەوە زانیاری وەدەست بێنێ؟ فەیلەسووف و زاناکانی ئایینی نەصرانی، واتە ئایینی تێکدراو و شێوێندراوی مەسیح (علیە السلام) چەند ڕایەکیان لەو بارەیەوە هەبووە:

1- هەندێکیان پێیان وابووە کە حەق و زانیاری و مەعریفەت تەنیا لە (وحي) خوادایە وە پێویستیان نە بەعەقڵەو نەبە پێنج هەستەکانە، وە نە بە هیچ شتێکە، واتە: تەنیا ئەوەیان بە زانیاری زانیوە کە لە ڕێی وەحییەوە دەستگیر دەبێت، دیارە ئەو (وحي)یەی ئەوانیش ئیعتیمادیان لەسەری بووە بریتی بووە لە تەوراِت و لە ئینجیلەکان، خوا هەر (ئینجیلێکی) ناردوە بۆ (عیسی)(سەلامی خوای لەسەر بێ)، بەڵام دوایی هەندێك لە قوتابیەکانی(عیسی) یاخود قوتابی قوتابیەکانی هاتن ئەو ڕیوایات و بەسەرهاتانەی کە لە (عیسی)وە دەماودەم گێڕدرابوونەوە کۆیان کردنەوەو گوتیان ئا ئەوە ئینجیلی (عیسی)یە!! کەواتە: با باش سەرنجی ئەو مەسەلەیە بدەین تاکو

بۆمان ڕوون بێتەوەو بزانین کە خەڵکی ئەوروپا بۆچی لە (دین) دوورکەوتنەوە؟! خەڵکی زاناو فەیلەسووف دەیانگوت باشە خوا هەر یەك ئینجیلی ناردوە، ئەدی ئەی پیاوانی کڵێسا ئێوە ئەم هەموو ئەو ئینجیلانەتان لە کوێ هێناوە؟! چونکە هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن ژمارەی ئینجیلەکان پەنجا (50)یان حەفتا (70) بوون، دیارە هەر کام لە خاوەن ئینجیلەکانیش هی خۆی پێ ڕاست بوو! بەڵام سـەرەنجام نەصرانیەکانی دنیا چەند کۆبوونەوەیەکیان سازداو هەموویان لەسەر(4) چوار ئینجیل ڕێککەوتن کە ئەمانەن (متَّى و مَرْقَص و لۆقا و يُوحنّا) بەڵام ئینجیلێکی پێنجەمیش هەبوو بە ناوی (برنابا) کە ئەمەیان بە بۆچوونی زۆرێك لە مێژوونووسان و لێکۆڵەوەران ڕاستترین ئینجیلە، کە تێیدا باسی پێغەمبەرمان ﷺ کراوە بە هەموو سیفەتەکانییەوە.

بەڵام نەصرانیەکان ئەو ئینجیلەیان نەهێشت و بزریان کرد، دوا یی کابرایەکی میصری ئەو ئینجیلەی دە ستکەوتەوەو بڵاوی کردۆتەوەو ئێستاش بە چاپکراوی هەیە.

وە (بۆڵس) یەکەم کەس بوو کە لە ئایینی مەسیح دا (ثالوث)ی داهێنا، واتە: فیکرەی سێ پەرستراوی هێنایە نێو ئایینی مەسیحەوە کە گەورەترین ئەفسانەو خورافیاتە، (بۆڵس) ئەوەی داهێنا کە گوتی (عیسی) پەرستراوەو (روح القدس)یش بە هەمان شێوەو خوای پەروەردگاریش سێیەمی ئەو سێ پەرستراو (إله)ەیە! شایانی باسیشە

(بۆلس) کابرایەکی جوولەکە بوو، پاشان بو بە نەصرانی تاکو ئاینی مەسیح لە ڕیشەوە دەربهێنێ و پڕی بکات لە ئەفسانەو شتی پڕو پووچ، جا لە ڕاستیدا کارەکەشی ئەنجامداو ئەوەی کردی کردی، کاتێك کە ئەم (ثالوث)ی داهێنا زۆرلە زانا یانی مە سیحی ئەوەیان ڕەت کردەوەو گوتیان: خەڵکینە ئایینی مەسیح بۆ خوا بە یەکگرتن هاتوەو (عیسی) بۆ خۆی دەڵـێ من بەندەی خوام، ئیتر ئەوە چۆن قبووڵ دەکەن (عیسی)و دایکی یان (عیسا)و (روح القدس) بە پەر ستراو (إ لە) داب نرێن و (عیسا) بە کوڕی خوا لە قەڵەم بدرێت؟!

دوایی بە دەستی دەسەڵات داران زۆرێك لەو زانایانە کوژران و زۆریان خۆیان پەنادا لە ئە شکەوتەکاندا و سەرەنجام تێ کدران و گۆڕدران (تحریف)ی ئایین و بەرنامەی (مەسیح) (علیه السلام) سەری گرت، دیارە جوولەکەکان هەر لە سەرەتاوە کەوتنە دژایەتی (عیسی) و ئاینی (مەسیح) چونکە (عیسی) (علیه الصلاة وال سلام) زۆر لە هە ڵەو پەڵەکانی جوولەکایەتی (یهودیة)ی ڕاست کردبۆوە، بۆیە ئیمانیان پێ نەهێناو لە لای (قەیسەر)یش لێی دوان و ئەوەبوو وی ستیان بی کوژن، بەڵام خوای زاڵ و کاربەجێ بۆ لای خۆی بەرز کردەوەو دەربازی کرد، وەك خوای باڵادەسـت فەرموویەتی ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ، بَل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ (النساء 157-158) ، بەڵـێ جا لە ئەنجامی ئەوەدا، کە پێشتر چەندەها ئینجیل هەبوون و دوایی بوونە چوارو هەر چوارەکەشیان

زۆر شتی هەڵەو ئەفسانەیان تێکەوت و ئێستاش هەر چواریان دان بەوەدا دەنێن کە (عیسی) کوڕی خوایە!!.

کەواتە ئەو زاناو فەیلەسووفانەی ڕۆژئاوا کە قەناعەتیان وا بووە بۆ وەدەست هێنانی زانیاری و زانست گوتوویانە پێویستە تەنها پشت بە (وحي)و پەیامی خوا ببەستریٚ، وە ئەو (وحي) یەی کە ئەوان لەبەردەستیان بووە بریتی بووە لەوەی کە ئێستا پێی دەڵێن کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس) کە ئەویش دابەش دەبێ بۆ پەیمانی کۆن و پەیمانی نویٚ (العهد القدیم والعهد الجدید)، شایانی باسیشە بە شێك لە پەیمانی کۆن تەوراتە و بەشێکی پەیمانی نوێش ئەو چوار ئینجیلەن کە باسمان کردن و کتێبەکانی نێو پەیمانی کۆنیش بە تەوراتیشەوە لە ڕووی هەڵەوپەڵەو بێسەرەوبەرەییەوە زۆر لە چوار ئینجیلەکان خراپترن و من هەموو ئەو کتێبانەش کە دەوری سێ هەزار (3000) لاپەڕەن بە وردی خوێندوومنەوە .

2- هەندێکیشیان گوتوویانە (وحي) ئامانجەو عەقڵ هۆیە، لە ڕێی عەقڵەوە (وحي) وەردەگرین بەڵام دەبێ عەقڵ خزمەت کاری (وحي) بێت کاری عەقڵ ئەوەیە وەری بگریٚ و لێی تێ بگات، کە ئەوە بۆچوونێکی ڕاستەو مسوڵمانانیش ئیمان و عەقیدەیان ئاوایە سەبارەت بە (وحي) ڕاستی خوا، بەڵام گرفتی ئەوان ئەوە بوو کە (وحي)یەکەیان شێواندرابوو.

3- هەندێکی دیکەیان پێیان وا بوو کە هەر کام لە عەقڵ و (وحي) بواری تایبەتی خۆی هەیە و عەقڵ بۆ پەیپێبردنی ئەو ڕاستییانەیە کە لەو دیوی سروشتەوە (ما وراء الطبيعة)ن[1]، ئەوەش تا ئەندازەیەك بۆچوونێکی بەجێیە.

4- هەندێکی دیکەش پێیان وابووە کە با عەقڵ و (وحي) هەردووکیان هەبن، بەڵام عەقڵ جێگای متمانەیەو لە هەر شوێنێك ئایەتێکی (وحي) واتە: پەیمانی کۆن و نوێ لەگەڵ بنچینەیەکی عەقڵی تێك بگیرێن دەبێ ئایەتەکە لابەرین، شایانی باسیشە کە هەرگیز وەحی ڕاست و عەقڵی دروست تێك ناگیرێن، کەواتە: ئەوانەی ڕایان وابوو بۆ زانین و ناسینی شتیان، پشت بە وەحی ببەسترێ، ئەو چوار جۆرە بوون، هەشیان بوو کە تەنیا بڕوای بە عەقڵ و پێنج هەستەکان هەبوو و ئەوەی لە ڕێگای ئەوانەوە وە دەست نەهێنرابایە جێی ئیعتباریان نەبوو وهیچ حیسابیان بۆ (وحي) نەدەکرد.

بەڵام ئەمانەش لەسەر یەك ڕا نەبوون و هەر لە سەرەتاوە لە بەرامبەر ئەوانەدا کە زیاتر پشتیان بە عەقڵ دەبەست واتە: عەقڵ گەرایەکان (العقلانيون) کەسانێك هەبوون کە پێیان دەگوتن هەست گەرا (الحسيون) کە پشتیان بە پێنج هەستەکان دەبەست، یاخود لە دواییدا کە زیاتر زانیارییە سروشتییەکان بەرەو پێش چوون پێیان

(1) (میتافیزیك) واتە: ئەو دیوی سروشت، کە مەبەست پێی جیهانی مەعنەوی و هەست پێ نەکراوە.

گوترا: ئەزموون گەرایەکان (التجربیون) کە دەیانگوت هەر شتێك لە تاقیگە (مختبر) دەرنەچێ کە ڕاستە، ئەوە جێگای متمانە نیە!

جا هەر لە سەرەتاوە کێشە هەبوو لە نێوان عەقلێ گەرا و هەستگەرایەکاندا، ئەوە لە لایەکەوە لە لایەکی دیکەشەوە لەبەر ئەوەی کە ئایینی مەسیح وەك گوتمان گۆڕدرا بوو، بە تایبەت کە لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری هەر تێدا نەمابوو، هەروەها زۆر ڕاستی (و حي) ئەو دیو سروشتی تێدا شێوێنرابوو و گۆڕابوو، بۆیە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشایی(فراغ)یە، دەستەو دایەرەی کڵێسا نا چار بوون کە تەبەنني فەلسەفەی یۆنانی بکەن بە تایبەتی ئەوەی کە (ئەفلاطوون و ئەرستۆ) گوتوویانەو هەستان کتێبەکانی ئەوانیان وەك (وحي) خوایی حیساب کردو گوتیان ئەوەش بەشێکە لە دینی مەسیح! وە هەر کەسێك قسەیەکی کردبایە پێچەوانەی قسەیەکی (ئەفلاطوون و ئەرستۆ، لە جیاتی بڵێین: ئەوە سەرپێچی لە قسەی (ئەفلاطوون و ئەرستۆ) کردوە، دەیانگوت سەرپێچی کەنیسەی کردوە!!

لەبەرئەوە ئەو زانایانەی کە لە دیاردە سروشتییەکانیان دەکۆڵییەوەو لە ڕێی هەستەکانەوە هەوڵی شت زانین و ناسینیان دەداو پشتیان بە ئەزموون بەستبوو، زۆر تەنگیان پێ هەڵچنرا، بۆ نموونە: زانای ئیتالی (برۆنۆ) چونکە گوتی زەوی دەسووڕێتەوە، چیخێکیان تێی وەرپێ چاو نەوتیان پێدا کردو بە زیندوویی سوتاندیان!! هەروەها (گالیلۆ) هەر لەسەر ئەوەی کە گوتی زەوی خڕەو دەسووڕێتەوە، بردیان بۆ لای (پاپا)و

داوای پەشیمان بوونەوەیان لێی کردو ناچار پەشیمانی دەربڕی و گوتی: نەخێر زەوی هەرگیز خڕ نەبووەو خڕیش نابیّ!!

هەروەها بۆ زانایانی گەردوونناس و سرو شت ناس بە هەموو جۆرەکانیانەوە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا سانسۆریی عەقیدەیی ( محاكم التفتيش)یان بۆ دروست کردن و هەر کەسێك شتێکی گوتبا پێچەوانەی قسەیەکی ئینجیل و تەوراتی شێوێندراو بوایە یەکسەر دەیانکو شت و دەیانسووتاندو سەدان زانایان کوشت و سووتاند!!

دیارە ئێستاکەش عەلمانیەکانی وڵاتی خۆمان دەڵێن : دین پێچەوانەو دژی زانیارییەو ئەگەر دین بەرەو پێش بچیّ زانیاری بەرە و پاش دەچیّ!! ئەوە هەموو قیاسی (کەشك)یّ لە (مەشك)یّ دەکەن! چونکە دەبێ ستن کە کاتی خۆی دامودەزگاکانی کلێساو پیاوانی بە ناو زانای ئاینی نەصرانی و قەشەو پاپاکان دژی زانست و زانیاری بوون و زانا و فەیلەسووفەکانیان کوشتوەو ڕاوەدوونراوەو ئەفسانەو خورافاتیان پەرە پێداوە، ئنجا واشـــیان زانیوە کە ئیســـلام و نەصرانیەت کتومت وەك یەکن و دوو کاڵەکی بڕکێکن! ئیدی لەوەوە ☐ واتە لەو پێشەکی یە هەڵانەوە- گەیشـــتوونەتە ئەنجامێکی هەڵەو وایان زانیوە، کە ئیسلامیش وەك نەصرانییەت دژو پێچەوانەی زانیاری و زانست و پێشـــکەوتنی ژیان و گوزەرانە!!

بەڵـێ لە سەدەکانی نێوەڕاست دا دامودەزگاکانی (کلێسا) ئەوەی کردوویانە کردوویانە، لە دژایەتی زانستوزانیاری و فرۆشتنی بەهەشت و

دۆزەخ و پسوولەی لێخۆشبوون و سزادانی دوا ڕۆژو ... هتد، بەڵام کاتێك کە جیهانی نەصرانیەت ئەوەحاڵی بوو و ئەورووپاو ڕۆژئاوا لەو پەڕی دواکەوتوویی و نەفامیدا دەیناڵاندو حاڵی ئاوا بوو، هەر هێندە کە ڕۆژئاوا تیشکێك لە خۆری پڕشنگداری ئیسلامی بەرکەوت، ڕاپەڕینی زانیاری و زانست (ڕێنسانس)ی تێدا پەیدابوو، بەدان پێداهێنانی مێژوو نووسانی ڕۆژئاوایی خۆیان، ئنجا بێگومان لە حاڵێکی ئاوادا کە ئەورووپای تێدا بوو، هەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و ئەزموونی و هەر پشت بەستنێك بە هەستەکان بە زیانی ئەفسانەو خوڕافیات تەواو دەبێت، چونکە وەك ئاماژەمان پێکرد هەردووك پەیمانی کۆن و نوێ بە تەورات و ئینجیلەکانیشەوە هەڵاخنرابوون لە ئەفسانەو شتی بێ جێ، دیارە هەمیشەش زانیاری و ئەفسانە تێك دەگیرێن بۆیە پیاوانی کڵێسا پێیان ناخۆش بوو زانیاری و زانست بەرەو پێش بچێ و ئەو بازاڕەی خوڕافاتیان لێ تێك بچێ.

**سێیەم:** بەڵام بێگومان وەك گوتراوە هەرچەندە دنیا زۆر تاریك بێت ڕۆشناییەك لە شوێنێکەوە هەر پەیدا دەبێت و سەرەنجام ڕۆژئاواییەکان بە هۆی لێکخشان لەگەڵ مسوڵمانانیدا، چ لە ڕێی جەنگەکانی خاچ پەرستەکانەوە لەگەڵ مسوڵمانانیدا، چ لە ڕێی دەوڵەتی ئیسلامی یەوە لە (ئەندەلوس) ئیسپانیای ئێستاو چ بە هۆی گەڕیدەکانیانەوە کە دەهاتن بۆ زانکۆکانی (المستنصرية و الأزهر والزيتونة) کە زانایانی ئیسلامیان دەبینی و لەسەر دەستیان

زانست و زانیاری یان وەردەگرت، وردە وردە خەڵکی ئەورووپا بەئاگاهاتن و بیدار بۆوەو ئاگاداربوونەوە کە ئەوان لە چ حاڵێك دا دەژین و موسڵمانانیش لە چ جیهانێکی پڕ لە زانست و زانیاری دان !! ئیدی پاش تەفاعول کردنی هەندێك لە زانا ئەورووپاییەکان لەگەڵ ئەو زانیاری و زانستەی کە لە جیهانی ئیسلامییدا هەبوو وردە وردە چاویان کرایەوەو هەندێك خەڵکی زاناو بلیمەتیان لە نێودا پەیدابوون و پێگەیشتن، وەك: فەیلەسووفی ئینگلیزی (ڕۆجەر بیکون) کە لە ساڵی (1294)دا مردوە، وە زانای ئینگلیزی (ویلیام ئوکام) کە لە ساڵی (1349)دا مردوە، ئەوانە پەیدابوون و بانگەشەیان دەکرد بۆ گرنگی و بایەخی زانیاریە ئەزموونییەکان (العلوم التجريبية) ئەو زانیاریانەی کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە وەدەست دێن، بە دانپێداهێنانی زۆربەی مێژوونووسان (ڕۆجەر بیکۆن) لە ئەنجامی وەرگێڕانی کتێب و بەرهەمەکانی زاناو پێشەوایانی ئیسلامەوە ئەو بیروبۆچوونەی تازەیەی بۆ پەیدا بووە.

بەڵێ بەڕێزان:

ئەو خولانەوەیەی ئەورووپا لە گێژاوی ئەفسانەدا هەر بەردەوام بوو تاکو چاخی ڕاپەڕینی زانیاری (عصر النهضة العلمية)[1] کە لە سەدەی شازدە بەرەو ئەملا دەستی پێکرد، وە زانیاری ئەزمونی (العلم

(1) کە ئەورووپاییەکان (ڕێنسانس)ی پێدەڵێن.

التجريبـــي) وردە وردە گەشەی سەندو بوو بە ڕێبازو فەلسەفەیەك و لەسەر پێی خۆی وەستا، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە سێ زاناو فەیلەسووفی ئەورووپایی پەیدا بوون: یەکەم (فرانسس بیکۆن) کە زۆر کابرایەکی ناودارەو لە ساڵی (1626)ز مردوە، دووەم: (جۆن لۆك) کە لە ساڵی (1704)ز مردوە، سێیەم: (دیڤید هیۆم) کە لە ساڵی (1776)ز مردوە، یەکەمیان: (فرانسس بیکۆن) ڕێگای خۆش کرد بۆ ڕێڕەوی ئەزمونی (الإتجاه التجريبـــي)و ڕەخنەی گرت لەوەی کە هەر قسەی عەقڵی ڕووت بە بێ ئەوەی ئەزموونی بکەی لە دونیای واقیعدا حیسابی لەسەر بکرێ و پشتی پێ ببەسترێ، هەروا خەڵکی هاندا کە شت بجەرِبێنن. دووەمیان: (جۆن لۆك) هێرشێکی زۆر سەختی کردە سەر ڕێبازی عەقڵ گەرایی و نکوولّی لەوە کرد کە سەرەتایە فیتریەکان لە عەقڵدا هەبن و گوتی: عەقڵ وەك لاپەڕەیەکی سپی وایەو لە ڕێی ئەو زانیاریانەی کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە نەقڵ دەبن و دەستگیر دەبن، لە عەقڵدا شت تۆمار دەکرێت، ئەگەرنا عەقڵ هیچ شتێکی تێدا نیە. هەڵبەتە ئەوە وا نیە، وەك دوایش بۆتان باس دەکەم، بەلاّم ئەو لە کاردانەوەی بیـرکردنەوەی ئەفسانەیی (کلێسا)دا گوتی هەرگیز عەقڵ ئیعتیمادی لەسەر ناکرێ، بەڵکو تەنیا لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە زانیاری ئیعتیباری پێ دەکرێ و غەیری ئەوە جێگای ئیعتیبار نیە. سێیەمیشـیان: (دیڤید هیۆم) زۆر زانستی ئینسانی شیتەڵ کردەوە و هەموو شتێکی گێڕایەوە بۆ پێنج هەستەکان، وە گوتی: هەر شتێك بە

پێنج هەستەکان هەستی پێ نەکرێ نییە، دیارە ئەو جۆرە بیر کردنەوەیەش سەرئەنجام سەری کێشا بۆ نکوولیکردنی هەبوونی غەیری جیهانی ماددەو شتە بەرهەستەکان، وەك خوای پەروەردگارو قیامەت و ڕووح و...هتد. بە زاراوەی خۆیان (میتافیزیکا) ئەو دیوی سروشت، ئنجا پاش ئەوەی کە ڕێڕەوی ئەزموونکاریی (الإتجاه التجریبی) لە بەرامبەر ڕێڕەوی عەقلّی (الإتجاه العقلي)دا سەرکەوت، هەر زانایەك قسەیەکی کردبایە پێیان دەگوت بەڵگەت چیە؟ ئایا ئەو شتە لە تاقیگەدا دەردەچێت؟ ئایا بە پێنج هەستەکان هەستی پێ دەکرێت؟ ئایا بەڵگەی سەلمێنەری بەرهەستت بەدەستەوە هەیە؟ ئەگەر ئا ئەوە باشە، ئەگەر نا کەس گوێی لێ نەدەگرت، تا وای لێهات کە پشت بەستن بە عەقلّ و بەرهەممەکانی زۆر لاواز بوو، بە تایبەت دوای ئەوەی کە لە ڕێی ئیعتیمادکردن لەسەر ئەزموون و پێنج هەستەکان، زانست بەرەو پێشەوە چوو، هێزی هەلّم (قوة البخار) دۆزرایەوەو، پاشان زانایانی دیکە نهێنی دیکەیان دۆزیەوەو، وردە وردە زۆرێك لە یاسا سروشتییەکان دۆزرانەوەو ژیانی خەلّك گۆڕا، پێشتر کە ئەورووپا لە زەلکاوی نەفامیدا دەینالاّند، ئالّوگۆڕی بەسەرداهات و داهێنانی پیشەسازی دەستی پێکردو لە لایەنی ئابووری و سەربازیو سیاسیو ئیداری و کۆمەلاّیەتی و فەرهەنگی ... هتددا ژیانی خەلّك بەرەو پێش چوو.

زۆر لەو زانا و فەیلەسووفانەی، کە لە نێو ئەورووپاییەکان جێگای ئیعتیبار بوون و ڕێزێکی تایبەتییان هەبوو، ئەوانەش هەموویان پشتی

ڕێرەوی ئەزمونگەرایی‌یان گرت، وەك (جیرلی بنتام) کە لە ساڵی (1832) مردووەو (جیمس مل)، کە لە ساڵی (1836) مردوەو (جۆن ستیوارت مل)، کە لە ساڵی (1827) مردوەو، (هربنت سبنسر)، کە لە ساڵی (1903) مردوە، هەروەها زۆری دیکەش ئەوانە هەموویان پشتگیری ئەو ڕێرەوەیان کرد.

سەرەنجام لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا سێ قوتابخانە لەسەر بناغەی ڕێرەوی (ئەزموون گەرایی) بنیات نران، کە گەورەترین کاریگەری‌یان هەبوو لەوەدا کە ئەورووپا بە گشتی بەرەو بێدینی و ئیلحاد بڕوات.

یەکەم/ قوتابخانەی وەزعی (المدرسة الوضعية) کە یەکێك لە زانایان بە ناوی (ئۆجست کۆنت) لە ساڵی (1798)ز دا بنیاتی نا پوختەکەیشی ئەوەیە: کە هەر شتێك بە پێنج هەستەکان هەست پێ نەکرێ بە هەبوو (موجود) دانانرێ، وە بڕواشی بەوە نییە کە عەقڵ بەڵگەنەویستەکان (البديهيات)ی تێدا هەن، بەڵکو بڕوای وایە کە عەقڵ لاپەرەیەکی سپییەو هەر شتێك لە ڕێی هەستەکانەوە تێیدا تۆمار نەکرێ، تێیدا نییە وە بە هیچ جۆرو شێوەیەکیش بڕوای بە جیهانی پەنهایی (غيب) نیە .

جا پەیڕەوانی ئەو قوتابخانەیە بە حیسابی خۆیان پێیان وایە کە مرۆڤایەتی بە سێ قۆناغ دا تێپەڕیوە:-

1) قۆناغی (لاهووتی) دەڵێن: لەم قۆناغەدا هەر شتێك ڕووی داوە ئینسان گوتوویەتی: ئەوە خوا وا دەكات، ئەوە جۆری بیركردنەوەی مرۆڤ و شیكردنەوە (تحليل)ی بووە بۆ ڕووداو و كارەساتەكان بە خەیاڵی (ئەو قوتابخانەیە) چونكە ئینسان لە قۆناغی سەرەتاییدا بووە!

2) قۆناغی (میتافیزیكی) دەڵێن: لەم قۆناغەدا ئینسان لە جیاتی خوا پەنای بردۆتە بەر هەندێك زاراوەی مەعنەویی بۆ تەفسیركردنی هۆی پەیدا بوونی دیاردە سروشتی یەكان، وەك (ماهیەت، عەقڵ، هۆكار، نەفس، ڕووح) واتە: ئینسان گوتوویەتی ئەو شتانە دیاردە ڕوا ڵەتی یەكان پەیدا دەكەن، هەڵیان دەسووڕێنن و دەیانگێڕن.

3) قۆناغی (واقیعی) كە دەڵێ ئینسان پێویستە تەنیا سەرگەرمی ئەوە بێ كە بە پێنج هەستەكانی هەستی پێ دەكات و گوێ بە شتە نا بەرهەستەكان و پەنهانەكان نەدات، جا پەیڕەوانی قوتابخانەی ناوبراوی ئەو قۆناغە دەڵێن: ئەو قۆناغەش ئەوەیە كە ئێستا ئینسان پێی گەیشتوەو پێشتر ئینسان هەر لە ئەفسانەدا ژیاوە.

شایانی باسیشە كە قوتابخانەی ناوبراو كاریگەرییەكی زۆری هەبوو لەوەدا كە ئەوروپا پەلكێش بكات بەرەو كوفرو ئیلحادو بڕوا نەكردن بە هیچ دینێك، چونكە ئەو دینەی ئەوان پ ێی ئا شنا بوون شێوێنراوو هەڵاخنەراو بوو لە ئەفسانەو، لە ئایینی راست (ئیسلام)یش بێئا گا

بوون و وایان زانیوە، کە دین هەمووی وەك ئەوەی وان وایە!، وە (مارکس) کە گوتوویەتی، (ئاین تلیاکی گەلانە) بە نسبەت نەصرانیەتەوە تا رادەیەکی زۆر پێکاویەتی و ڕاستی کردوە، بەڵام بە نسبەت ئیسلامەوە کە ئەو لێی بێئاگاو هەواڵ بووە بە هەڵەدا چووە، ئەگەرنا ڕاستە کاتی خۆی قەشەو پاپایەکانی نەصرانیی لە گەڵ دەرەبەگ و پاشاکاندا ڕێککەوتبوون و خەڵکیان دەچەوساندەوە[1].

دووەم/ قوتابخانەی (ماکسیزم) کە ئەویش لە سەدەی نۆزدەهەم دا پەیدا بوو و(مارکس) بە هاوکاری (ئەنگلس) بنیاتی نا، کە ئەمیش هەر لەسەر بناغەی قوتابخانەی وەزعی بنیات نرا، بەڵام (مارکس) هەستا مەسەلەی ئابووری و گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئەوانەشی تێکەڵ کرد، بۆ ئەوەی لە واقیعی ژایاندا چاکتر بیچەسپێنن، و لە ڕاستیشدا ئەوەی کە پێشتر قوتابخانەی وەزعی بە شێوەی تیۆری (نظري)ی دەیگوت (مارکسیزم) لەسەر زەمینەی واقیع چەسپاندی، وە دوو شۆڕشی گەورەی لەسەر بناغە بەرپاکران: یەکێك لە ڕووسیا کە شۆڕشی ئۆکتۆبەرەو لە ساڵی (1917)دا (لینین) لە سەر بناغەی مارکسیزم بەرپای کرد، وە دووەمیشیان لە چین (ماوتسی تۆنگ) هەر لەسەر بناغەی ئەو بیردۆزەیە بەرپای کرد، جا بە هۆی بەرپابوونی ئەو دوو شۆڕشە گۆڕانکارییەکی زۆر لە دونیادا سەری

---

(1) لە کتێبی (ئیسلام و ڕێچکان) دا ئەو بابەتەمان توێژیوەتەوە، بڕوانە لاپەڕە (97-152) وتوێژی سێیەم (ئیسلام ووریا کەرەوەیە نەك تلیاك) چاپی سێیەم 2006ز .

هەڵدا لە دژی سیستەمی ئابووری سەرمایەداریی (کاپیتالیزم)و بە حیساب بۆ لەسەرکردنەوەی چینی پرۆلیتاریاو خەڵکی ڕەش و ڕووت و بەش خوراو، بەڵام لە حەقیقەتدا وانەبوو، بەڵکو ئەویش هەمووی لە خزمەتی چینێکی نوێ دابوو کە چین (طبقة )ی بەرپرسانی حیزب بوو!، بۆیەش لە دواییدا هەموو ئەو قەوارەو دەوڵەتانەی کە لە سەر بناغەی فەلسەفەی (مارکسیزم) و (ماتریالیزم) بنیات نرابوون، تێکرایان لەژێر کاریگەری فیترەت و عەقڵ و واقیعی ژیان و داخوازیی یە سروشتی یەکانی ئینساندا لەبەریەك هەڵوەشان و خەڵك توڕی دان و فڕێی دان.

بەڵێ بەڕێزان !

مارکسیزم ڕەهەند (بعد )ێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەخشی بە مەسەلەی ماددیگەرایی و ئیلحادو بێدینایەتی، ئەویش ئەوە بوو کە گوتی هەموو شتێك بریتیە لە ئابووری، وە هۆیەکانی بەرهەمهێنان مەکینەو داینەمۆی وەگەڕخستن و جووڵاندنی مێژوون و هەرچی کێشەو هەرایە هەمووی لەسەر ئابووری و گەدەو گیرفانە، واتە (مارکس) و فەلسەفەکەی کێشەو هەرای ئینسانی هەموو هێنایەوە سەر کێشەی

چینەکان، لەسەر هۆیەکانی بەرهەم هێنان، لەسەر ئەوە کە کێ پارووی چەورتر بێ و کێ جێگای گەرم و نەرمتر بێ [1]!!

سێیەم/ قوتابخانەی کۆمەڵایەتی (المدرسة الإجتماعیة) ئەمیش لەسەر دەستی کۆمەڵێك زانای کۆمەڵناس پێك هات کە لە سەرووی هەموویانەوە (ئەمیل دورکایم) بوو کە کابرا یەکی فەیلە سووفی فەرەنسی بوو و لە ساڵی (1917 )زدا مردوە.

قوتابخانەی کۆمەڵایەتی پێی وایە، کە کۆمەڵگایە هەست و شعورو هەموو شتێکی تاك (فرد ) دروست دەکات و بە کورتی ئینسان و تاك بە سابوونێك دەشوبهێنی کە لە قاڵبی سابوون دەردەچێ، دەڵێ هیچ ئیرادەو ئیختیارێکی نیە لە بەرانبەر کۆمەڵگادا !!.

هەڵبەتە ئێمە لێرەدا کاتی ئەوەمان نیە و نامانەوێ خۆمان بە پووچاندنەوەی ئەو فیکرە و بیردۆزانە خەریك بکەین، ئەگەر نا پێمان وەك ئاو خواردنەوە وایە[1]، بەڵکو ئێمە لێرەدا تەنها مەبەستمان ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەو تەوژمە فیکرییانەیە کە لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا سەریان هەڵدا، لە کاتێکدا کە دەگەڕان بەدوای

---

(1) لە کتێبی (ئیسلام و ڕێچکان) دا تا ڕادەیەکی باش بەرپەرچی ئەو وڕێنانەی مارکس و سەرجەم ماددیگەرایەکان دراوەتەوە، بڕوانە چاپی سێیەم/2006، نوسینگەی تەفسیر.

(1) لە کتێبی (خواناسیی، ئاین، ئیمان) چاپی یەکەم / نوسینگەی تەفسیر، تا ڕاددەیەك بەرپەرچی ئەو جۆرە بیردۆزانە دراوەتەوە .

دۆزینەوەی سەرچاوەکانی زانیاری و زانستدا پاش ئەوەی لە ئایینی شێوێنراوی نەصرانی نا ئومێدو تەما بڕاو بوون.

شایانی باسیشە وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا کە ئەوروپاو ڕۆژئاواش میراتگرو درێژە پێدەری ئەو بیرو فەلسەفەیەن کە لە نێو ئیغرق یەکان و ڕۆمانی یەکان و یۆنانی یەکاندا هەبوو، ئەوانیش هەر لە سەرەتاوە کێشەیان بووە لەگەڵ دین(2)(وحي)دا، لەگەڵ ئەو زانیاری یە بێهە لەو پەڵەیەی کە لە لایەن خواوە بۆ پێغەمبەران (علیه ال صلاة وال سلام) هاتوە جا دیارە ئەو حاڵەتەش گەلێك هۆکاری هەبوون، یەکەمیان ئەوە بوو کە ئەو ئایینەی لە نێو ئەوان دابووە ئایینی مەسیح (علیه الصلاة و السلام) بوو، جاریَ ئەوروپاییەکان دینەکەیان هەر لە سەرەتاوە قبووڵ نەکردو (عیسی) (سەلامی خوای لەسەر بێ) بە درێژایی ژیانی هەر چەوساوەو ڕاوەدوونراو بوو، جوولەکەکان بەرنامە و شەریعەتی عیسایان قبولْ نەکرد، چونکە زۆر لە هەڵەکانی ئەوانی ڕا ست دە کردەوەو ئەو کاتەش جوولەکەکان تا بناگویَ بە دونیاپەر ستی و ئارەزووپەر ستی و فێڵ و تەڵەکەدا نوقم ببوون. بەڵام (عیسی) بانگەشەی دەکرد بۆ دوارِۆژ و بەکەم سەیرکردنی دونیاو بۆ ژیانی مەعنەویی و ڕووحی، بۆ برا یەتی و خۆشەویستی و دژی ئەو ڕێرەوە ماددی و ئاژەڵییە بوو کە ئەو کا تە ڕۆ مانی یەکان تێ یدا بوون، هەروەها ڕۆمانیە یەکانیش بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەچوون، دیارە (عیسا)ش (علیه ال سلام) دە سەڵاتی

(2) واتە (دین) بە چەمك و واتا باوو عورفی یەکەی کە بریتی یە لە بەرنامە و پەیامی خوا بۆ مرۆڤـ .

نەبوو چونكە تەنیا كۆمەڵێك هاوەڵ (حواري) كەمی لەگەڵ دا بوون، بۆیەش ئیعلانی جەنگی نەكرد، پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة و السلام) خوای پەروەردگار هەر ئەوەندەی داوا لێ‌كردوون كە لە توانایاندا بووە، (عیسا)ش (علیه السلام) ئەوەندەی خەڵك لە گەڵ نەبووە كە بتوانن كۆمەڵگا بگۆڕن هەر چەندە كەمتەرخەمیشی نەكردوە بۆیە هەر بە چەوساوەیی ماوەتەوە.

بەڵام پێتان وا نەبێ كە گرفت و كێشەی ئایینی مەسیح هەر ئەوەندە بوو، بەڵكو سەرباری ئەوەش پاش عیسا زۆریان گۆڕی و دەستكاری كرد، تاكو لەگەڵ فەلسەفەو نەریتی خۆیان بگونجێ!! جا ئێستا تاكو بۆتان دەربكەوێ ئەو ئایینە بە چ دەردێك چووەو چی بەسەر هاتوە سەیر بكەن ئێستا لە ڕۆژئاوا داوێن پیسی بە هەموو شێوەكانی یەوە ڕەوا یە، وە هەرچی گوناح و تاوان و سەرپێچی هەیە مەگەر چۆن دەنا هەمووی ڕەوایە، كە چی دام و دەزگای كڵێسا بێدەنگە و دژی ناوەستێ، بۆ چی؟ چونكە ئاواش خەڵك ئامادە نیە نەصرانیەت قبوڵ بكات، دامودەزگای كڵێساش دەیەوێ ئەگەر ئاواش بێت هەرچۆنێك بێت خەڵك هەر خۆی پێ هەڵبواسێ و بازاڕی گەرم بێ! ئەگەر نا نەصرانیەت كارێكی پێكراوە كە قەشە و پاپایەكان زۆربەیان خۆشیان بڕواو قەناعەتیان پێی نیە، چونكە دینی حەق نەبێ لە دڵ و مێشكی ئینسان دا ناچەسپێ و ئینسان قەناعەتی تەواوی پێ نایەت.

كورتەی قسان:

لە سەدەكانی نێوەڕاست دا زانا و فەیلە سووفەكان تا ئەندازە یەك حسابیان بۆ ئایین و (وحي) كردوە، بەڵام پاشان كە ڕێڕەوی عەقڵیی زاڵ بووە كڵێسا و پیاوەكانی لە بەرانبەری دا بە چۆك داهاتوون وتە سلیمی بوون و خەڵكیش بە گشتی لە ژیانیاندا هێدی هێدی تەبەننی یان كردوەو ئەزموون گەرایی بەهێز بووە، یەكجاری پیاوانی كڵێسا تەسلیم بوون و چەكیان فڕێ داوەو بۆ خۆ یان چوونەتە گۆ شەو كەنارەكا نەوە، بە تایبەتیش دوای شۆڕشی فەڕەنسا لە ساڵی (1789)ز كە یەكێك لە دروشمە زەقەكانیان ئەوە بوو دەیانگوت (دوایین پاشای ستەم كار بە ڕیخۆڵەی دوایین قەشە لە سێدارە بدەن) چونكە دەیانگوت ئەوانە وا تە: پاشاو پاپا هەردووكیان دژی میللەت یەكیان گرتوە، كە لە ڕاستیشدا وابوو.

كەواتە خەڵكی ئەورووپاو ڕۆژئاوا كە ڕوویان لە (سیكۆلاریزم) كرد بۆ ئەوان كات ێك سەیری هەلومەرجە كەیان دە كەین و شیكردنەوە (تحلیل)ێكی بابەتی یانەی بۆ دەكەین، شتێكی ئاسایی یەو سەیر نییە، بەڵام عەلمانی یەكانی لای خۆمان كە لەگەڵ دینێك ڕووبەڕووبونەتەوە، نە پێچەوانەی زانیاری و عەقڵەو نە ڕێگا لە زانیاری و عەقڵ دەگرێ بەڵكو بیـركردنەوەو وەدەستهێنانی زانیاری فەرزیش دەكات، وەك لە چەندان ئایەت و فەرموودەدا هاتوە، پاشان ئەو دینە حەقە نەك هەر چەكی دەستی ستەمكاران نەبووە بۆ گیانی هەژاران، بەڵكو زیاتر دینی چینی

ڕەش و ڕووتە و ڕێگا لە چەوساندنەوە دەگرێ و دژی چینی ستەمکارو چەوسێنەرەوەیە، هەڵوێست وەرگرتنی سەلبی ئەوان (واتە عەلمانییەکان) لە بەرانبەر ئیسلام دا هەڵویستێکی نا مەنتیقی و بێماناو سەیرە!!

وە هەڵوێستەکەیان وەك ئەوە وایە کەسێك ببینی کە دان ئێشەی لێ بێت و لەتاو ئازاری ددانی سەری خۆی بە دارو دیواردا بکێشێ، ئەویش یەکسەر بێ ئەوەی دانی بێشی سەری خۆی بەدارو دیواردا بکێشێ تەنیا لەبەر چاولێکەریی!!

ئاخر باباى ڕۆژئاوایی کە پەنای بۆ (سیکۆلاریزم) بردوە ناچار بووە، بەڵام برادەری عەلمانی کورد خۆ تۆ ناچار نی!!

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ: کە ڕێرەوی ماددی گەرایی و هەستگەرایی و ئەزموون گەرایی، لە دوادوای سەدەی نۆزدە یەم و سەرەتای نیوەی سەدەی بیستەمدا وردە وردە بازاڕی شکاو سارد بۆوە، بۆچی؟ چونکە لە سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەم و نۆزدەیەمدا زانیاری تازە لە سەردەمی گڕو گاڵ دا بوو، سەرەتای دۆزینەوەی یا ساو نهێنییەکانی سروشت بوو، کە بووە هۆی بەرەوپێش چوونی پیشەسازی و ژمارەیەکی زۆر ئامێرو کەلوپەل داهێنران، بۆیە خەڵکەکە بە گ شتی و بە تایبەتی زانایان زۆر لە خۆبایی بوون بە هۆی ئەو زانیارییە کە هەیان[1] بوو و حیسابێکی وایان بۆ خواو وەحی نەدەکرد، بەڵام پا شان پێ بەپێ کە زانیاری زیاتر قووڵ بۆوە، بە تایبەتی زانیاری فیزیاو کیمیا

(1) وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا جَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ ﴾ غافر 83

سەیریان کرد مادده کە پێیان وا بوو ئەسڵی بوون (وجود)ە و ناسینی لە هەموو شتێك ئاسانترە، هەتا زیاتر پێیدا دەچ نـە خوارەوەو ل ێی ورد دەبنەوە لێیان ئالۆزترو مەتەڵاوی تر دەبێ، بە تایبەت پەیوەندی ن ێوان وزەو ماددەو کامیان ئەسڵە و... هتد؟!

بەڵـێ پاش ئەوەی زیاتر بە زانیاریدا قووڵ بوو نەوە، زۆر ێك لە زانایانی گەورە گەورە پەیدا بوون کەسانی وەك (برگسۆن) کە لە ساڵی (1941)ز دا مردوە کە بڕوای وا بوو ئین سان وەك لە ڕێی دڵ و دەروونەوە دەتوانێ زانیاری وەدەست بێنـێ و پەی بە شتان بەرێ لە ڕێ پێنج هەستەکان و عەقڵەوە ناتوانێ، واتە (برگسۆن) بڕوای بەجۆرێك لە ئیلهام بووە، کە پێی دەڵـێ (الحَدَس) و لە سەرەتای دەر سی یەکە مەوە پێناسەی (حَدْس)مان کرد.

وە هەروەها (ئەنیشتاین) زانایەکی دیکە یە لەو جۆرە زانایا نەو خاوەنی بیردۆزەی نیسبی یەو لە بارەی پەیوە ندی ن ێوان (د ین) و (زانیاری)و پێویستبوونی هەردووکیان گوتوویەتی: (ئایینی بێ زانست وەك پیاوی شەل وایەو زانستی بێ ئایینیش وەك پیاوی کوێر وایە) کە مەبەستی زانستی ئەزموونی و سروشتی یە، ئە گەرنا د ین بۆ خۆی گەورەترین جۆری زانستە.

وەیەکێکی دیکە لەوانە (ماکس پلانك)ە کە لە (1947) مردوە، یەکێکی دیکەیان (سیر جیمس ج ینس)ە کە هەرکامیان زا نای زۆر گەورەو بەناوبانگن لە فیزیاو گەردوون ناسیی دا، وە یەکێکی دی کەیان (ئالکسیس کاریل)ە کە خاوەنی خەڵاتی ( نوبڵ)ە لە ئاداب داو

کتێبێکی هەیە بە ناوی (مرۆڤ ئەو نەناسراوە) (الأنسان ذلك المجهول) هەروەها دەیان زاناو پسپۆڕی دیکە لە زانستە جیاجیاکاندا[1]، جا ئەوانە سەرجەم دانیان بەوەدا هێناوە کە بەڵێ: دنیاو بوون تەنیا ئەو ماددەو ڕواڵەتە نیە، بەڵکو جیهانێکی دیکەی ئەو دیو ئەم سرو شتە هەیە، خوا هەیە ڕووح هەیە.. هتد، جا دیارە ئەوانە زۆربەیان مسوڵمان نەبوونەو بگرە بە هیچ ئاینێکەوە پابەند نەبوونە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئایینەکەی خۆیان گۆڕدراوەو شێوێندراوەو لە ئەفسانە سیخناخ کراو بووەو بە ئیسلامیش ئاشنا نەبوون!

جا هەندێکیان گوتوویانە: ئێمە پێویست ناکات دینمان هەبێت و زانست و زانیاری شتمان بۆ ڕێك دەخات، بەڵام هەر دەبێ خوا بناسین و لایەنی ڕووحی و ئەخلاقیمان هەبێ، وەك گوتمان دینەکەیان ڕێگای لە زانیاری و عەقڵ دەگرت و پڕبوو لە ئەفســـانە، واتە: ئەوانە لە لایەك عەقڵ و زانیاری و (منطق) پێیان دەگوتن: پەروەردگارو بەدیهێنەرێـــك هەیەو ڕووح هەیەو ژیان تەنیا بریتی نیە لەو ڕواڵەتە ماددییانە! لە لایەکی دیکەشەوە هەر باسی خوایان کردبایە، کڵێسا بەهانەی دەست دەکەوت کە بڵــێ مادام وایە وەرن پابەند بن بە منەوە! کە گەڕابانەوەش بۆ کڵێسا دەبوو واز لە زانیاری بهێنن و دژی بوەستن و بڕوا بە ئەفسانە بێنن، بۆیە بە ناچاری گوتوویانە بڕوامان بە خوا هەیە بەڵام بە دین نا!

دیارە (دین)ی ڕاســـت و دروســـت کە ئیســـــلامە ئەگەر ئەو کات لەبەردەستیان دابایەو پێیان گەیشتبایە بێگومان هەموویان یان

(1) لە کتێبی ( الله یتجلّى في عصر العلم )دا باسی ژمارەیەکی زۆر لەو زانایانە کراوە .

زۆربەیان مسولْمان دەبوون، وەك ئێستا دەبینین زانایانی ڕۆژئاوا زۆربەیان کە ئیسلامیان دەکەوێتە بەرچاوو قورئان‌و سوننەتی ڕاستی پێغەمبەری ئیسلام دەبینن، بێ سێ و دوو ئیمان دەهێنن و کتێبی باش باش دەنووسن دەربارەی ڕاستییەکانی ئیسلام، کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین یەکێك لەوانە (ڕۆجیە گارودی)یە کە کاتی خۆی ناودارترین فەیلەسووفی بیری ماددی مارکسی بوو.

کەواتە: زانیاری هەتا سەر کێلْ و سادە (سطحي) بوو لە گڕوگاڵدا بوو، هەڵوێستی هەڵەو ناماقووڵی هەبوو لە بەرامبەر خوای پەروەردگارداو لە بەرامبەر دیندا بە گشتی، بەڵام کە وردەوردە کامڵ بووە فراوانتر بوو و بەرچاوی ڕوونتر بۆوە، پێ بە پێ گەڕایەوە بۆ ئەدەب و ڕێزو حورمەت نیشاندان بەرانبەر بە خوای پەروەردگارو بەرانبەر بە ئایین و بەرنامەی خوا، هەرچەندە ئەو زاناو شارەزایانە تێبینی وسەرنجی زۆریشیان هەبووە سەبارەت بەو دینەی کە لە نێویاندا باو بووە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا انت أستغفرك وأتوب إليك

# دەرسی سـێیەم و چـوارەم و پێنجـەم:

# ڕێـبـازو شـێوازی وەدەسـت هێنانی زانیاری و زانسـت لە ڕوانگـەی ئیسلامـەوە.

# دەرسی سـێیەم:
# ناسین و زانینی شـتـان لە ڕوانگەی ئیسـلامەوە

الحمدلله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم وبارك على خاتم الانبياء والمرسلين وعلى اله اجمعين.

بەرێزان: بەرلەوەی بچینە سەر ئەسڵی مەبەست، بە پێویستی دەزانم کە سێ ڕوونکردنەوەتان پێشکەش بکەم:

**یەکــەم:** چۆنیەتی هەڵگەرانەوە لە دین و لە خوا دووركەوتنەوەی خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوا بە گشتی، ئاوا بوو: سەرەتا لە كلێسا و پیاوەكانی هەڵگەڕانەوە، پاشان لە خودی دینی (نەصرانیی) هەڵگەڕانەوەو دواتر هەر لە خوای پەروەردگاریش هەڵگەڕانەوە، بە یەكجاری لە هەر شتێك دووركەوتنەوە كە هەر بۆنی دینی لێوەبێ و



پەیوەندی بە خواوە بێت، وە سەرەکیترین هۆکاری ئەم هەڵوێستەشیان دوو شت بوون:

(یەکەم): شێوێندران و گۆڕدران (تحریف وتغییر)ی ئەو کتێبە خواییانەی کە لەبەردەستیان بوون وەك (تەورات) و (ئینجیل)، دیارە خەڵکی ئەورووپاش بێجگە لەوانە وەك سەرچاوەی (وحي)و پەیامی خوا هیچ شتێکی دیکەیان لەبەردەست نەبوو، وەك پێشتر باسمان کرد کە یان ئیسلامیان هەر پێنەگەیشتبوو، یان ئەوانەی کە پێ شیان گەیشتبوو لەبەر دەمارگیری (تعصب) گوێیان پێ نەدا.

دیارە سەرباری دەردی گۆڕران و شێوێنران گرفت و نەخۆشی یەکی دیکەش ڕووی کردە ئاینی نەصرانیی ئەویش بریتی بوو لە ئاوێتە بوونی فەلسەفەی یۆنانی لەگەڵیدا بە تایبەت کتێب و بەرهەمەکانی (ئەفلاطوون و ئەرسطۆ) چونکە پیاوانی کڵێسا بۆ پڕکردنەوەی کەلێنو بۆشاییەکانی ئاینە گۆڕراوەکەیان، تەبەننی یان کردن لە حاڵێکدا کە پڕ بوون لە شتی پڕوپووچ و ئەفسانە!! ئنجا دەردێکی کوشندەی دیکەی سێیەمی نەصرانیەتیش ئەوەبوو کە چینی ئەکلیرۆس و دەزگای کڵێسا زۆر بە توندی ڕوو بەڕوو بۆوە لە گەڵ زانیاری یە سرو شتییەکان (الطبیعة)دا و هەر جۆرە بیرکردنەوەیەك لە بوونەوەرو دەوروبەر کە پێچەوانەی (تعالیم) و زانیارییەکانی نێو تەورات و ئینجیل بێت، لەبەر ئەوانە خەڵك لە دین دوور کەوتنەوە و ئەو کتێبانەی کە لەبەر دەستی ئەو خەڵکە بوون جێگەی متمانەو ئیعتیبار نەمان و بۆیان دەرکەوت کە

شتی هەڵەو نابەجێیان تێدایە کە لەگەڵ عەقڵ و زانست و مێژوودا ناگونجێ، ئەوە سەرەکی‌ترین هۆی لە خوا دوورکەوتنەوەی خەڵکی ئەورووپا و ڕۆژئاوا بوو.

(دووەم): دەست تێکەڵکردن و تەون تێك هەڵبەستنی پیاوانی کڵێسا لەگەڵ پادشاو دەرەبەگ و سەرمایەدارەکان، کە بێگومان مارکسیزم و جموجۆڵی کۆمۆنیزم لە کاردانەوەی ئەوەدا زیاتر پەیدا بوو، وە بۆیەش دوایی خەڵك جەنگێکی زۆر بێ ئامانیان لە دژی (دین) بە گشتی بەرپا کرد، چونکە دەیانبینی کابرا لە بەرگی دیندا بوو پیاوی(تر) دینی بوو کەچی لە خزمەتی پادشا و پارەدار و خاوەن زەوی یەکان دا بوو، بگرە هەندێك لە قەشەو (پاپا)یەکان زۆر لە مەلیك و پادشاکان پارەدارترو دەستەلاتدارتر بوون، هەتا هەندێك جار پادشا ئەگەر (پاپا) بۆی ئیمزا نەکردبایە و پشتگیری نەکردبایە نەدەبوو بە پادشا، وە جاری وا هەبووە کە ئەگەر پادشایەك لە (پاپا) هەڵگەڕابایەوە، یەکسەر ئەمری فەصڵ کردنی داوەو لە ڕیزی نەصرانییەتی دەر کردوە، تەنیا لەبەر ئەوەی بێ‌ئەمری (پاپا)ی کردوە، دوایی پادشا بە ناچاری چۆتەوە بۆ خزمەت (پاپا)و دەستی ماچ کردوەو پەشیمانی دەربڕیوە!! جا ئەو دەست تێکەڵکردنەی پیاوانی کڵێسا لەگەڵ دەسەلاتدارنی خۆسەپێن و دیکتاتۆرو دەوڵەمەندو ساماندارانی لە ڕێی حەرام سامان وەسەرێك نەرو هەژار چەوسێنەرو خەڵك چەوسێنەرەوە بە ناوی دینەوە، ئەوەش

(تر) پیاوانی ئایین (رجال الدين). زاراوەیەکی تایبەت بە نەصرانییەتە و لە ئیسلام دا هەموو پیاوانی مسوڵمان و ئافرەتانی مسوڵمان لە بەرامبەر (دین) دا بەرپرسیارن.

دەورێکی زۆری هەبوو لە دوورکەوتنەوەی خەڵك لە دین و بەرەو بێبڕوایی چووندا.

بەڵێ ئەم دوو هۆیە واتە: یەکەم: گۆڕران و شێوێنرانی کتێبەکان و متمانە نەمانی خەڵك بە (وحي)و پەیامی ئاسمانی، دووەم: بەناوی دینەوە خەڵك چەوساندنەوەو دەست تێکەڵکردنی پیاوانی کڵێسا لەگەڵ پادشاو دەستەڵاتدارەکان و دەوڵەمەندو ساماندارەکاندا ئەوە خەڵکی بێمتمانە کرد بەرامبەر بە ئەصڵی (دین)و لەو دام ودەزگایانەی کە بە ناوی دینەوە قسەیان دەکرد، بۆیە خەڵکی ڕۆژئاوا بە گشتی ڕووی لە کوفرو بێبڕوایی کرد.

**دووەم:** ئەوەیە کە خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوا چ لە بواری زانست و زانیاریدا و، چ لە بواری سیستەم و ڕژێمی سیاسی و پێکهێنانی دەوڵەتدا پشتیان لە دین کرد و ڕوویان لە بێدینی کرد، لە ڕاستیدا لە خۆشی خۆیان نەبوو و وەنەبێ ئیختیارێکیان بووبێ و سەرپشك بووبن کەوا بکەن یان وا نەکەن، چونکە دینی (نەصرانیی) بەکەڵکی ئەوە نەدەهات کە بینای دەوڵەتی لەسەر بکەن و کێشەو گرفتەکانی خۆیانی پێ چارەسەر بکەن لە سەرجەم بوارەکانی ئابووری، فیکری، سیاسی، کۆمەڵایەتی ... هتددا، کە لە هەموو ئەو بوارانەشدا کێشەی زۆریان هەبوو، بەڵێ هیچ چاریان نەبوو کە ڕوو لە شتێکی دیکە نەکەن، بەلآم بە تەئکید دەگونجا کە لە خوای پەروەردگار هەڵنەگەڕێنەوە وەك هەندێك لە عاقڵەکانیان دەیانگوت ئەو دینە ئەوە نیە کە خوا ناردوویەتی، کەواتە بۆچی نێوانی خۆمان

لەگەڵ خوا تێکبدەین و بۆچی دژایەتی ئەسڵی دین و وەحی بکەین و دژایەتی ئەو شتانە بکەین کە سروشت (فطرة)ی ئینسان داخوازیان دەکات!، بەڵام دیارە زۆربەیان ئەو دوور بینیی و لێکدانەوەو بیرکردنەوە بابەتی یانەیان نەبوو، بۆیە هەندێك لە فەیلەسووف و زاناکانیان کە باسی دروست بوونی ئینسانیان کردوە ڕەخنەیان لە بیردۆزەی (داروینیزم) گرتوەو زۆربەیان پێیان هەڵەو پەڵە بووەو گوتوویانە هەموو مەخلووقێك بە دانستە دروست بووە و هیچ ڕێی تێ ناچێ کە لە ئەنجامی گەشەکردن (تطور)دا لە گیاندارانی دیکەوە هاتبێ بە زۆر بەڵگەش ئەوەیان سەلماندوە، کەچی گوتوویانە: هەرچەند ڕێشی تێ ناچێ بەڵام ناچارین کە بیردۆزەی (داروینیزم) هەر قەبووڵ بکەین، چونکە هەرچەندە (داروین) هەڵەش بێ، بەڵام ئەگەر بڵێین ڕاست ناکات دەبێ بگەڕێینەوە بۆ لای پیاوانی (کڵێسا)و دووبارە پێڕی کڵێسا بێتەوە گۆڕێ! کەوابێ هەر چەندە زانیاری و عەقڵیش قبووڵی ناکات بەڵام بە ناچاری هەر دەڵێین (داروین) ڕاست دەکات، قەیدێ ناکات با هەر بڵێین ئێمە مەیموون زادەین گرنگ ئەوەیە چارێکی دی نە چینەوە بەردەستی قەشەو پاپاکان و نەمان چەوسێننەوە! ئنجا وەك پێشینانمان دەڵێن (ئەگەر ئینسان بە ڕووباری داچوو ناچار دەست بۆ پووشیش دەبات).
بەڕاستی خەڵکی ڕۆژئاواش ئاوای لێ‌هات، وە بۆ زانینتان دینی نەصرانیی هەر لە ئەصڵ و بنچینەشدا بۆیە نەهاتبوو کە کێشەو گیروگرفتەکانی مرۆڤایەتی حەل بکات لە دوای (عیسى) (علیه

الصلاة والسلام)، بە تایبەت لە دوای هاتنی پێغەمبەری کۆتایی (محمد)(علیه الصلاة والسلام)، چونکە بەرنامەی (مەسیح) لە ئەصڵدا بۆیە هاتبوو کە لە سەردەمی (عیسی) (علیه الصلاة و السلام) ئەو کەم وکووڕی و لادانەی کە جوولەکەکان لە دینداریدا پەیدایان کردبوو چارەسەریان بکات و ڕاستیان بکاتەوەو بەرەو خوایان گێڕێتەوە، بۆیە نە نێردرابوو کە لە سەدەکانی نێوەڕاست و لە سەدەی بیستەمدا گیروگرفتی خەڵك حەل بکات! بۆیە نەصرانییەت هەر لە ئەسڵ دا ئەوەی لە تواناذا نەبوو و ئەگەر نەشگۆڕرابایە کێشەکانی مرۆڤایەتی هەر پێ چارە سەر نەدەکرا لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیان دا چ جای ئەوەی کە گۆڕدرابووش!! تەنیا ئیسلام بۆ ئەوە نێررابوو کە ئەو کێشەو گیروگرفتانە چارەسەر بکات کەچی ئەوانیش بڕوایان بە ئیسلام نەهێناو لە بێبڕواییدا نغرۆ بوون و سەرەنجام هەڵسان بۆخۆیان (دین)ێکیان داهێنا کە بریتیە لە سیکۆلاریزم!

**سێیەم:** هەرچەندە هەم عەقڵ و فەلسەفە، هەم پێنج هەستەکان و زانیارییە ئەزموونییەکانیش لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ ماددەو دەوروبەرو کۆمەڵگادا تا ئەندازەیەك زادەو بەرهەمێکی باشیان هەبوو، بە تایبەتی زانیارییە سرو شتیەکان کە لە ئەنجامی ئەزموونکارییەوە وەدەست هاتن و سیماو ڕوخساری ژیانی ڕۆژئاواو ئەورووپایان گۆڕی، لەوپەڕی دواکەوتووییەوە، لە بواری پیشەسازی و ژیان و گوزەرانیان لە ڕووی ماددی یەوە، بۆ ئەوپەڕی پێشکەوتن،

بەڵام دیارە لە ڕووی ئینسانی و مەعنەویی و ئەخلاقی یەوە هەر لە دواکەوتوویی خۆیاندا مانەوە، بەڵکو زیاتریش بەرەو دوا چوونەوە، چونکە لە پێشدا لە ڕووی تەکنۆلۆجیاو پیشە سازی و ماددی یەوە بەڵێ لە دوا بوون، بەڵام لە ڕووی مەعنەویی و ئەخلاقی و ئینسانییەوە زۆر شتی باشیان هەبوو، چونکە (دین) هەرچەندە تێك بدرێ و بگۆڕدرێ هەر چۆن بێ هەر چاکترە لە بێدینی، بەڵام دوایی لە سۆنگەی ئەوەوە کە کەوتنە دژایەتی کردنێکی خەست و خۆڵی کڵێساو پیاوانی و لە پشت کڵێساشەوە لەگەڵ دیندا بەشەڕ هاتن و پاشان لەگەڵ خوای پەروەردگاریش نێوانی خۆیان تێکدا، لە ڕووی مەعنەویی و ئەخلاقی و ئینسانیی و لە ڕووی خە سڵەت و بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتی یەوە بەڕاستی زۆر بەرەو دوا چوونەوەو ئێستاش هەر بەرەو دوا دەچن، جا ئایا بۆ چی لەو ڕووا نەوە بەرەو دوا گەڕانەوە؟! چونکە چەکی ئەو مەیدانەیان پێ نەبوو کە بریتیە لە وەحی و پەیامی ڕاستەقینەی خوایی کە لە زانیاری بێسنووری خواوە سەرچاوە دە گرێ، پێش تریش با سمان کرد کە عەقڵ و پێنج هەستەکان دە توانن لە گەڵ ڕواڵە تە ماددی و بەرهە ستەکاندا هەڵسوکەوت بکەن، بەڵام بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو دیو ماددەو ئەودیو سروشت، پێویستیمان بە ئامرازێکی دیکە هەیە کە ئەوان پێیان نەبوو، بۆیە ڕۆژ ئاوایی یەکان مە گەر چۆن دە نا هەر قسەیەکیان کردبێ سەبارەت بە دینداریی و ئەو دیو سرو شت و

خوای پەروەردگار، نەك هەر نەیان پێكاوە بەڵكو زۆریشی لە سەر قەرزدار بوونەتەوە، چونكە وەك شاعیرێك دەڵێ:

(ترجوا النجاة ولم تسلك مسالكها

ان السفينة لا تجري على اليبس)

واتە: (بە تەمای رزگاربوونی بەڵام رێگا ئاساییەكەی خۆیت بۆ نەگرتوە، بێگومان كەشتی لەسەر وشكانی ناڕوات).

ئێستاش پاش ئەم سێ روونكردنەوەیە كە لە ڕاستیدا زیاتر تەئكیدكردنەوەو تیشكی زیادە خستنە سەر هەندێك بابەتی پێشوو بوون، با بچینە سەر ئەسڵی مەبەست و بزانین ئیسلام سەبارەت بە زانین و ناسینی شتەكان لە لایەن ئینسانەوە هەڵوێستی چیە؟!

## شت زانین و ناسینی مرۆڤ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

خوا پشتیوان بێ ئێمە ئەم بابەتە لە چوار خاڵی سەرەكیدا دەتوێژینەوە كە سێیان ئەم دەرسە دەیانگرێتە خۆی و چوارەمیشیان دەرسی داهاتووی بۆ تەرخان كراوە كە ئەمانەن:

1- شت زانین و شت ناسین بۆ ئینسان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە شتێكی ئاشكرا و روونە.
2- خوای زانا سەرچاوەی زانست و زانیاری و فێربوون و تێگەیشتنە.
3- رێ یەكانی وەدەست هێنانی زانیاری و زانست بەگشتی پێنج هەستەكان و عقلْ و (وحي)ین.

4- وەحی خوا بەرزترین و ڕاستترین و بێ هەڵەو پەڵەترین سەرچاوەی زانیاری و زانستە.

## خاڵی یەکەم:

## ( شت زانین و شت ناسین بۆ ئینسان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە شتێکی ئاشکرا و ڕوونە)

پێشتر باسمان کرد کە یەکێك لەو مەسەلە فیکریی و فەلسەفیانەی کە ماوەیەکی زۆر خەڵکی (یۆنان)و پاشان نەصرانییەکان لە سەدەکانی نێوەڕاستدا و دوایی خەڵکی ئەورووپای لە دوای سەدەکانی ناوەڕاستیشەوە زۆر مەشغوڵ و سەرقاڵ کردوو تووشی دەمەقاڵێ و مشتومڕی کردن، ئەوە بوو: ئایا ئینسان دەتوانێ شت بزانێ یان ناتوانێ؟ جا ئەوە بوو کە هەر کام لە گومان پەیدا کەرەکان (الشکاکون) بە هەموو جۆرەکانیانەوە بە (العنادیة، والعندیة، اللاأدریة ) هەروەها سوفسطائیەکان ئەوانە هەموویان ڕایان وابوو کە نەخێر ئینسان ناتوانێ

هیچ بزانێ و هیچ ئامرازێکی پێ نیە کە زانیاری یەکی متمانەپێکراوی پێ وەدەست بێنێ.

بەڵام لە ئیسلامدا هەر لە ڕێوە ئەو گرفتە چارەسەر کراوەو خوای بەدیهێنەر (سبحانەوتعالى) کە بەدیهێنەری ئینسان و دروستکەری عەقڵ و سروشت و پێنج هەستەکان و دروستکەری ئەو بوونەوەرە پان و پۆڕو پڕ وردەکاریی و فراوانەیە، هەر لە سەرەتاوە مەسەلەی ئەوە کە ئینسان دەتوانێ شت بزانێ بە شتێکی ڕوون و بێ چەندو چوونی داناوە، بۆیە لە ئیسلامدا مەگەر ئەوانەی کەوتبنە ژێر کاریگەری فەلسەفەی (یۆنان)ی ئەگەرنا هەرگیز کەسانی وەك: خاوەن گوماناکان (الشكاكون) و سەفسەطەچییەکان (السوفسطائیون) پەیدا نەبوون، ئەوانەی کە گومانیان هەبێ لەوەدا کە ئینسان بتوانێ شت بزانێ بەڵکو بە پێچەوانەوە کەسانی وەك (معتزلة) پەیدابوون، کە زێدەڕۆیی یان کردوە لە زۆر تێڕوانینی عەقڵ و لەبەر زۆر پشت بەستن بە عەقڵ، گیرۆدەی هەندێك هەڵەو لادانی فیکریی سەیربوون: بۆ نموونە گوتوویانە: هەر کاتێك (نقل) و (عقل) واتە دەق و عەقڵ، تێکگیران دەبێ عەقڵ سەر بخرێ! کە بێگومان ڕێڕەوەکەیان هەڵەیە، چونکە بەڵێ عەقڵ جێی متمانەیە بەڵام واشنا کە بەسەر (وحي)دا زاڵ بکرێ، چونکە (وحي) یانی زانیاری بێ سنووری خوا، عەقڵیش یانی زانیاری مرۆڤ، دیارە شتێکی زۆر ناماقووڵ و بێ مانایە کە تۆ زانیاری خۆت

بەسەر زانیاری بێ سنووری خوادا سەرخەی! مەبەست ئەوە یە کە لە ئیسلامداو لە گۆمەڵگەی ئیسلامیدا بە ئەندازەی ئەوەی کە مـ سوڵمان گوێڕایەڵی (وحي)و گوێڕایەڵی قورئان و سوننەت بووبن، هەرگیز ئەو مەسەلەیان نەهێناوەتە پێش کە ئایا دەگونجێ ئینسان شت بزا نێ یان ناگونجێ؟ بەڵکو ئەو پرسیارە هەر دروست نەبووە، چونکە لە ئیـ سلامدا شتێکی ڕوون و بەڵگەنەویستە کە ئینسان دەتوانێ شت بزانێ بە پـ ێنج هەستەکان مامەڵە لەگەڵ ماددە و دەورووبەری دا دەکات و بە عەقڵ دەتوانێ بیـر بکاتەوەو شت شی بکاتەوەو شت بزانێ وێڕای ڕێو هۆکاری (وحي) کە تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە (عليهم السلام).

جا ئەوە بێگومان مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە خوای کار بەجێ مسوڵمانانی پاراستوە لەوە کە خەریکی شەڕە دەندووکەو شەرە قسەی بێجێ بن لەسەر شتێکی روون و ئاشکرا، سەیر بکەن لە یەکەمین ئایەتدا کە بۆ پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) هاتوە خوای بەرزو مەزن ئەو مەسەلەیەی چارەسەر کردوەو هەڵبڕیوە، کە فەرمووـیەتی: ﴿إقــرأ باسم ربك الذي خلق﴾[1]. بخوێنەو فێربە بە ناوی ئەو پەروەردگارەت کە هەموو شتێکی دروستکردوە! کەواتە ئەوە کە مرۆ ڤ دەتوانێ شت بزانێ و بناسێ و زانیاری و زانست فێربێ و وەربگرێ شتێکی روون و ئاشکرایە، ئنجا وەك پێشتر بۆتانم باسکرد لە

(1) العلـق – 1– .

ئایەتەکانی قورئاندا زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێ کە لە ڕا ستیدا پا ساو (مبـرِّر)ی ئەوە کە ئینسان شایستەی ئەوە بێ لەم سەر زەوییەی خوادا جێنشینایەتی خوا بکات و سەر زەوی ئاوەدان بکاتەوەو ئەمانەتی خوا هەڵبگرێ، ئەوەیە کە توانای هەیە شت بزانێ و شایستەی ئەوەی هە یە کە شت فێر ببـێ، وەك خوای زانا(عزّوجل) لەم ئایە تەدا دە فەرمویێ: ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَ سْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (31) قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (32) قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَ مَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾(ت). دوای ئەوەی فریشتەکان لە ڕووی پرسیارکردن و بۆ ڕوون بوونەوە گوتیان: ئەی پەروەردگارمان چۆن ئینسانێك دە کەی بە جێنشین لەسەر زەوی کە ئاواوئاوا دەکات؟ خوای کاربەجێش لە وەڵا مدا فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم کە بۆچی ئادەم شایستەی ئەو ئەرکەیە ئێوە نایزانن، پاشان خوای بەرز حیکمەت و پاساوی ئەو جێنشینایەتیی یەی ئادەمی بەوە خستەڕوو کە ناوەکانی فێری ئادەم کرد، جا زانایان لە بارەی ئەو ناو فێرکرانەی (ئادەم) دوو ڕایان هەن:

(ت) ( البقـرة 31 - 33) .

یەکەم: (ابن عباس) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: خوای پەروەردگار ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد بە وردو درشتەوە، (ابن عباس) ناوی زۆر کەلوپەلی وردەشی بردووە(تر).

دووەم: کە من ئەمەی دووەمیانم پێ بەهێزترە دەڵێن: خوای زاناو بە توانا تواناو ئامادەیی (استعداد)ێکی وای لە (ئادەم)دا خوڵقاند کە بتوانێ ناو لە شت بنێ و ناو بۆ شت بدۆزێتەوە، بۆیەش گوتم ئەم ڕایەیان بەهێزترە، چونکە ئەگەر ئادەمیش ئەو ناوانەی کە لە سەردەمی خۆیدا هەبوون فێریان بووە، ئەدی دوایی چۆن ناوەکانی فێری ڕۆڵەکانی کردوە چونکە دوایی کە وردە وردە ڕۆڵەو نەوەکانی بەسەر زەویدا بڵاوبوونەوە، خۆ هەر زمانێك نەبووە!، پاشان ئێستا دەرکەوتوە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ئەو مێژوونووسانەی کە لە (فقه اللغة) دەکۆڵنەوە کە زمان ئینسان دایهێناوە، بەڵێ بەهۆی پەیام و فێرکردنی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) ئینسان هەموو شتێك کە بۆ ژیانی پێویست بێ فێر بووە، بەڵام ئینسان توانای هەیە ناو بۆ شت دابنێ ئنجا کە ناوی شی بۆ شت دانا، دەتوانێ دوایی ناوەکان پێکەوە ڕێك بخات بەهۆی کردار (فعل)ەوە، دیارە زمانیش لەو سێ شتانە پێکدێت: ناو و کردارو پیتێك کە بە یەکیانەوە دەبەستێتەوە، بە هەرحاڵ خوای بەخشەر هەموو ناوەکانی

(تر) وەك: تەور، بێڵ، گوریس، مەنجەڵ، قاپ ... هتد.

فێری ئادەم کرد، پاشان ڕاینواندن لەسەر فریشتەکان، فەرمووی هەواڵم پێ بدەن ئەو شتانە ناویان چیە ئەگەر ڕاست دەکەن ئێوە شایستەترن بە جێنشینایەتی؟! گوتیان پاکی بۆ تۆ ئێمە زانیاریمان نیە بێجگە لەوەی تۆ فێرمان دەکەی، زانایان دەڵێن: تایبەتمەندییەکی فریشتەکان ئەوەیە کە ئەوەی خوا فێری نەکردبن لە کاتی خوڵقاندنیان دا نایزانن[تر]، بەڵام ئینسان دەتوانی شت فێر بێت، خوا ئامادەیی (استعداد)یەکی وای بە ئینسان داوە کە بتوانێ شت فێر بێت، بەڵام فریشتەکان زانیارییان زیادو کەم ناکات و خوا چەندی پێداون هەر ئەوەندەیە، ئنجا دوای ئەوەی فریشتەکان گوتیان: ئێمە نازانین تەنیا ئەوە نەبێ کە تۆ فێرمان دەکەی، بێگومان هەر ئەتۆی زانای کاربەجێ، خوا فەرمووی: ئەی (ئادەم) هەواڵیان پێ بدە بە ناوی ئەو شتانە، جا کاتێك هەواڵی پێدان و ناوی شتەکانی پێگوتن، خوا (جلّ وعلا) فەرمووی: ئایا ئەی فریشتەکان من پێم نەگوتن کە نهێنیەکانی ئاسمان و زەوی دەزانم، وە دەزانم ئەوەی کە ئێوە ئاشکرای دەکەن وە ئەوەش کە دەیشارنەوە؟!.

کەواتە ئەوە کە (ئادەم) شایستەی ئەوەیە کە لەسەر زەوی ببێتە جێنشینی خوا، ئەوەیە کە دەتوانێ زانیاری و زانست وەدەست بێنێ و خوای بێوێنەش فەرمانی کردوە بە زانیار بوون و شت فێر بوون،

---

(تر) واتە: تواناى گەشەسەندن ( تطور )ى خودی ( ذاتي )یان نیە وەك مرۆڤ .

فەرمانی بە گەورەترین ئینسان کردوە کە (محمد)ە ﷺ : **(فاعلم انه لا اله الا الله)** [تر]، هەروەها پێی فەرموە: **﴿ وقل رّب زدنِي علماً ﴾** [یر].
واتە: بڵێ پەروەردگارم زانیاریم بۆ زیاد بکە، کەواتە ئینسان دەتوانێ شت فێر بێت و زانست و زانیاریش زیاد بکات.




## خـاڵی دووەم:

## خوای زانـا سـەرچـاوەی زانسـت و زانیـاری و فێربوون و تێگەیشـــتنە.

لەو ڕووەوە کە ئینسان عەقڵ و پێنج هەستەکانی هەن و خواش بەدیهێنەرو بەخشەری عەقڵ و پێنج هەستەکانەو لە ڕێی عەقڵ و هەستەکانیشەوە ئینسان دەتوانێ کۆمەڵێك زانیاری و مەعلومات کۆبکاتەوە، بۆیە دەڵێین خوا سەرچاوەی زانستە، وە لەو ڕووەشەوە کە

(تر) ( محمد، 19 ).
(یر) ( طه، 114 ).

خوا (جلّ جلاله) بە فریشتەكانیدا (وحي)و پەیامی خۆی ناردوە بۆ پێغەمبەران (علیهم الـ صلاة والـ سلام) ئەوانیش گەیاندوویانە بە ئینسانەكان، دیارە (وحي)ش لە (علم)ی بێ سنووری خواوە سەر چاوە دەگرێ و زانیاریەكی بێ هەڵەو پەڵەی تێدایە، كەواتە لەو ڕووە شەوە دیسان خوای بێ هاوەڵ سەرچاوەی زانیارییە، خوا (عزّوجل) سەر چاوەی زانیارییە وەك ئامرازەكانی كە عەقڵ و پێنج هەستەكانن، وە سەرچاوەی زانیاری یە وەك پەیام ناردنی خۆی كە زانیارییەكی بێ هە ڵەو پە ڵەی تێدایە، هەر بۆیەش فریشتەكان گوتوویانە: (سبحانك لا علم لنا الا ما علمتنا) پاكیی بۆ تۆ نازانین مەگەر ئەوەی تۆ فێر مان ب كەی، لە سەرەتاوە فێرمان بكەی یاخود ئامرازی وەدەست هێ نانی مان بخە یە دەست، كە بەو واتایە ئینسانیش دەگرێتەوە، هەروەها خوا (عزّ جل) فەرموویەتی: ﴿وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِ مَا شَاءَ﴾[تر]، هیچ كەسێك ناتوانێ هیچ شتێك لە زانیاری خوا بزانێ مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، بەڵێ، بە ئیــرادەو ویستی خوا نەبێ ئینسان ناتوانێ هیچ شتێك فێربێ، وشەی (علم) لێرەدا یان هەر بە مانای زانیاری (علم)ە، یاخود بە مانای زانراو (معلوم)ە، كەوا تە هیچ شتێك لە زانراوە كان دروستكراوەكان-ی خوا دەرك ناكرێن و نازانرێن مەگەر بە ویستی خوا.

بەڵام پێویستە بزانین كە زانیاری خوا (سبحانە وتعالی) لە قەدەر خوایەو زانیاری ئێمەش لە قەدەر ئێمەیە، لە ( صحیح)ی ( بخاري)دا

(تر) ( البقـرة 255 ).

هاتوە کە (موسى) (عليه الصلاة والسلام) ڕۆژێك وتاری بۆ (بني اسرائيل) دەدا، یەکێك لێی پرسی: کێ لە هەموو کەس زاناترە؟ گوتی: من، دیارە ڕاستە لە نێو خەڵکدا لە هەموان زاناتر بوو بە دین و پەیامی خوا، چونکە پێغەمبەری خوا بوو، بەڵام نەدەبوو ئاوا بە ڕەهایی گوتبای من، چونکە جۆرێك لە ڕەچاو نەکردنی ئەدەبی لە بەرامبەر خوای زانا تێدا بووە، بە هەر حاڵ خوای باڵادەست ویستی تێبیگەیەنێ کە ئەی (موسى) وا نیە کە پێت وابێ تۆ لە هەموو کەس زاناتربی، جا خوا پێی فەرموو کە من بەندە (عبد)ێکم هەیە لە هەندێك شتدا لە تۆ زاناترە! مووساش (عليه السلام) گوتی: حەز دەکەم بزانم ئەو بەندە زانایە لە کوێیە بۆ ئەوەی بچم بۆ لای و هەندێك لەو زانیارییەی لایەتی لێی فێر ببم، ئەوەبوو چو بۆ لای، بە هەرحاڵ بە سەرهاتەکەی دوورو درێژە خوای بەخشەر لە سوورەتی (الكهف)دا باسی فەرمووە، بەڵام مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە مووسا (عليه السلام) لە گەڵ ئەو بەندە زانایەی خوادا دەچن بۆ سەر لێواری دەریایەك ڕادەوەستن، سەیر دەکەن باڵندەیەك بە دەندووکە بچووکەکەی تۆزێك ئاوی لە دەریاکە هەڵگرت، ئەو عەبدە صالحە کە هەندێك دەڵێن ناوی (خضر)ە بە مووسا دەڵێ: ئەی مووسا! زانیاری من و تۆ لە قەدەر هی خوا وەك ئاوی دەندووکی ئەو باڵندەیە وایە لە چاو ئاوی دەریایەکە، واتە: دڵۆپێك لە دەریایەك، کەواتە زانیاری خوا لە قەدەر خوایەو زانیاری ئینسانیش لە قەدەر ئینسانە، ئینسان دروستکراوێکی بچووکی خوایەو زانیارییەکەشی لە

قەدەر خۆیەتی، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً ﴾ (تر)، واتە: کەمێك نەبێ زانیاریتان پێ نەدراوە، کەوا تە ئەوەش کە وەدەستتان هێناوە هی خۆتان نیەو بەخشراوە، مادام وایە نابێ ئینسان پێی وابێ بەوەندە زانیارییەی پێدراوەو ئەو عەقلّ و ئامرازانەی پێ دراون، دەتوانێ هەموو شتێکیان پێ بزانێ و هەموو مەتەڵەکانیان پێ حەل بکات و هەموو نهێنییەکانی بوونەوەریان پێ کەشف بکات!.

## خاڵی سـێیەم:

### ڕێیەکانی وەدەست هێنانی زانین و زانست بە گشتی: پێنج هەستەکان و عەقلّ و (وحی) خوای بەرز و مەزن:

بەڕێزان! ئەو مشتومڕو کێشەیەی کە پێشتر باسمان کرد لە نێوانی هەستگەرایەکان (الحسیون )و عەقلّ گەرایەکان (العقلانیون) لە لایەکەوەو لە لایەکی دیکەوە لە نێوان هەستگەراو عەقلّ گەرایەکان و دینییەکاندا (ئەوانەی دەیانگوت زانیاری بەس ئەوەیە کە لە ڕێی وەحی

(تر) ( الإسراء 85 ) .

خواوە دێت) ئەو کێشەو مشتومڕە لە ئیسلامدا دروست نەبووە، چونکە هەر لە ڕێوە خوای پەروەردگار لە دەیان ئایەتی قورئاندا فەرمانی کردوە بە مرۆڤ و لەسەری پێویست کردوە کە هەم پێنج هە ستەکان و هەم عەقڵیشی بەکار بێنێ، فەرموویەتی سەرنج بدەن! تەماشا بکەن! گوێ بگرن! بیـر بکەنەوە با ڕابمێنن! عەقڵی خۆتان بخەنە گەڕو بەکاری بێنن! وەك چۆن فەرمانیشی کردوە کە گوێ بۆ (وحي) بگرن و پەیامی خوا وەربگرن، بەڵێ خوای کاربەجێ هەر لە سەرەتاوە ئەو کێشەیەی چارەسەر کردوە، کە ئایا بۆ شت زانین و ناسین پشتمان تەنیا بە عەقڵ ببە ستین؟ یان بە پێنج هەستەکان؟ یاخود هەر متمانە بە وەحی ب کەین؟ یاخود گوێ نەدەین بە هیچ کامیان؟ خوای کاربەجێ ئەو مەسەلانەی بە ڕوونی بۆ چارەسەرکردوین و بۆی هەڵ بڕیوین بەو جۆرە کە هەر کام لە پ ێنج هەستەکان و عەقڵی بە جێی ئیعتبارو متمانە داناوەو وەحی و پەیامی خۆشی بە چڵەپۆپەو لووتکەی هەرە بەرزی زان یاری و زان ست دا ناوە، چونکە: پێنج هەستەکان کە چەند تۆڕو شەداوێکن دە توانن نێ چیری دەن گەکان و وێ نەکان و تام کراوە کان و بۆنکراوە کان و دە ست لـێدراوەکان، (الا صوات، وال صور، وا لمذوقات، والم شمومات، و الملموسات) بگرن، پێنج هەستەکانیش: هەستی دیتن، بیستن، تامکردن، بۆنکردن، دەست لـێ کوتان، خوای پەروەدگار لە چەندان ئایەتدا داوای لە مرۆڤ کردوە کە ئەو هەستانە بەکار بێنـێ.

ئنجا لە بارەی سەفسەتەچی یەکانیشەوە کە گوتوویانە: لە سۆنگەی ئەوەوە کە پێنج هەستەکان بە هەڵەدا دەچن، لەبەر ئەوە زانیارییان لێ وەرناگیرێ و متمانەیان پێ ناکرێ، ئێمە دەڵێین: بە پێچەوانەوە هەر خودی بە هەڵەداچوونی پێنج هەستەکان بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە زانیارییەکەیان جێگای متمانەیە، چونکە تۆ دەیان جار شت بە چاو دەبینی، جارێك ناڵێی چاوم بە هەڵەداچووەو جارێك لە جاران بە دەگمەن قەڵەمێك لەنێو پەرداخێك ئاودا دەبینی یان گۆچانێك لە ناو حەوزێکی ئاودا دەبینی لە پێش چاوت دەبینی شکاوەتەوەو دوایی بۆت دەردەکەوێ دەڵێی چاوم بەهەڵەدا چووە! جا ئایا چۆن زانیت ئەو جارەیان چاوت بەهەڵەدا چووە؟! چونکە سەدان جاری دیکە چاوت پێکاو یەتی بۆیە زانیت لێرەدا چاوت بەهەڵەدا چووە، واتە ئەگەر هەمیشە بەهەڵەدا چووبایە ئینسان لێی حاڵی نەدەبوو کە ئەو جارەیان بەهەڵەدا چووە، ئینسان کاتێك دەزانێ کە ئەو شتە سپییە کە شتی ڕەش لە بەرامبەریدا هەبێت، وە کاتێکیش دەزانێ ئەو شتە ڕاستە کە هەڵەی لە بەرامبەردا هەبێ، کەواتە: هەر بەهەڵەداچوونی پێنج هەستەکان بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە زۆرجاریش بە هەڵەدا ناچن، بە ڵێ جار جاریش بەهەڵەدا دەچن، بۆیەش خوای زاناو شارەزا نەیفەرمووە هەموو شتێك لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە وەربگرن!.

ئنجا عەقڵیش بە هەمان شێوە هەندێك شت هە ـیە ـلە عەقڵ دا جێگای نابێتەوە، بۆیە خوای بەرز (عزّوجل) نەیفەرمووە کە بۆ هەموو شتێك ئیعتیماد لەسەر عەقڵ بکرێ هەر بۆیەش (وحي) خۆی ناردوە تاکو چۆن عەقڵ هەڵەی پێنج هەستەکان ڕا ست دەکا تەوە وەحـ ییش هەڵەو پەڵەی عەقڵ ڕاست بکاتەوەو کەلێنەکانی پڕ بکاتەوە! ئەوە لە لایەك و لە لایەکی دیش: ئەزموون گەڕاو هەست گەڕایەکان لەوەدا بە هەڵەداچوون کە وا یان زان یوە عەقڵ لە گەڵ پ ێنج هە ستەکاندا دوژمنایەتییان هەیە! کە بێگومان وا نیە، بڵکو پێنج هە ستەکان لە خزمەتی عەقڵ دان و عەقڵ بەکاریان دێنێ، وە کاتێك پێنج هەستەکان بەهەڵەدا دەچن عەقڵ بۆیان ڕاست دەکاتەوە، بۆیە شتێکی زۆر هە ڵەو نارەوا یە کە ک یانی مرۆ ڤـ و پێکها تەکانی هە ندێکیان لە گەڵ هەندێکیاندا بەشەڕ بدەی، کە فەلسەفەی ڕۆژئاوایی عادەتی وا بووە، عەقڵ بەگژ ڕووحدا دەکات، پێنج هەستەکان بە گژ عەقڵ دا دە کات، (وحي) (شێوێنراو) بەگژ عەقڵ و زانست دا دەکات، سۆز (عاط فة) بەگژ بیـر (فکر)دا دەکات، دین بە گژ ژین دا دە کات، مادده بە گژ ڕووحدا دەکات!! بەڵام ئیسلام دەڵـێ نەخێر ئەوانە هەموویان بەیە کەوە پێکەوە گونجان (انسجام)یان هەیەو دەستبار بۆ یەکدی دەگرن، عەقڵ هاوکاری پێنج هەستەکان دەکات و سەرپەرشتی و چاودێری یان دەکات و

بەکاریان دێنێت، وە هەڵەشیان بۆ ڕاست دەکاتەوە، پێنج هەستەکانیش وەك سەربازێکی چالاك لە خزمەتی عەقڵ دان.

ئێستاش با سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئان بدەین کە خوای کاربەجێ تێیاندا فەرمان دەکات کە هەم پێنج هەستەکان و هەم عەقڵیش بەکاربهێنرێن و هەم هاوکاری یەکدیشیان پێ بکرێ و دەستباری یەکدیشیان پێ بگیرێ: ﴿ قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾[تر]، واتە: بڵێ خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی پێکەیاندوە، وە بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانی پێ داون بەڵام زۆر بەکەمی سوپاسی خوا دەکەن! وەك دەبینین خوای بەخشەر بەخشینی بیست و بینین و عەقڵ بە نیعمەتێکی هەرە گەورە دادەنێ، هەروەها هەر لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾[یر]. واتە بە دوای شتێك مەکەوە زانیاریت دەربارەی نیە، چونکە بیستن و دیتن و عەقڵ هەرکامێــــــك لەوانە لێی دەپرسرێتەوە، ئەم ئایەتە بە ڕاشکاویی ڕای دەگەیەنێ کە هەم لە ڕێگەی بیستنەوە زانیاری وەدەست دێ و هەم لە ڕێگەی دیتنەوەو هەم لە ڕێگەی عەقڵیشەوە، چونکە خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ئەی مرۆڤ بە دوای شتێك دا مەکەوە کە زانیاریت دەربارەی نیە، چونکە هەر کام لە بیستن و دیتن و عەقڵ بەرپرسیارن و

---

(تر) (الملك 23) .

(یر) (الإسراء 36) .

لێپرسینەوەیان لە بارەوە لە گەڵ مرۆ ڤـدا دە کرێ. دا خۆ زان یاری و شارەزایی ڕاست و بە سوودی پێ وەدەست هێناون یان نا؟! هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَاللّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ الْسَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾[تر]، واتە: خوا ئێوەی لە سك (منداڵدان)ی دایکتان دەرهێناوە هیچتان نەدەزانی، بەڵام پا شان بیستن و دیتن و عەقڵی پێتان بەخشیوە، جا بەرێزان ئەگەر تێبینی بکەن دەبینن هەمیشە خوای بێوێنە پێنج هەستەکان پێش عەقڵ دە خات، دوایی بۆتان ڕوون دەکەمەوە کە لەبەرچی وایە! هەروەها خوا (سبحانە و تعالى) فەرمانی کردوە کە ئینسان سەرنج بدات و هە ستی ب ینین بەکاربێنێت، بۆ نموونە دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ﴾[ير]. واتە: با مرۆڤ سەرنجی خۆراکەکەی بدات. وە دەفەرموێ: ﴿وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾[سم]، واتە: وە لە خۆتان دا نیـ شانە زۆرن بۆ چی سەرنج نادەن؟! وە دەربارەی بەکار هێنانی هەستی بیستنیش ئا یەت زۆرن، بۆ نموونە خوا دە فەرموێ: ﴿وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ قَالُوا سَمِعْنَا وَهُمْ لاَ يَسْمَعُونَ﴾[شم]، واتە: وەك ئەوانە مەبن کە گوتیان ئەوە بیستمان بەڵام نەشیان بیست، یان دەفەرموێ: ﴿خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُواْ﴾[له].

---

(تر) (النحل 78) .

(ير) (عبس 24) .

(سم) (الذاريات 21).

(شم) (انفال 21) .

(له) (البقرة 93) .

واتە: ئەوەی پێمان بەخشیون لە (وحي) وەریبگرن بەهێزەوە، وە ببیستن، ئەگەر سەرنجتان دابێ لە قورئاندا بە زۆری لە پێنج هەستەکان هەر باسی بیستن و دیتن (السمع والبصر) دەکرێ، چونکە بیستن (سمع) هەرچی لە ڕابردوودا بووە، پێی دەزانێ و دیتن (بصر)یش هەر چی لە ئێستادا هەیە پێی دەزانێ، (وحي)یش ئەوەی ئێستاو ئەوەی ڕابردوو ئەوەی داهاتووی پێ دەزانێ، بەڵێ هێزی (بیستن) ئەوەی لە ڕابردوودا بووە پێی دەزانێ جا چ لە ڕێگەی گوێگرتن بۆ خوێندنەوەی مێژوو یان گەڕان و پشکنینی زانایان، پێش هەموو شی ئەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەی هەواڵیان پێداوین دەربارەی ڕابردوو گوێی لێ ڕابگرین، وە بۆ داهاتووش هەروا، چاو (بصر)یش ئەو شتانەی کە ئێستا هەن شتە ماددیەکان دەتوانێ بیان بینێ و سەرنجیان بدات.

بەڵام سێ هەستەکانی تری، بۆنکردن و تامکردن و دەستلێدان، بەو جۆرە نین و زانیاری زۆریان پێ وەدەست نایەت، بۆیەش خوای کاربەجێ باسی نەکردوون.

ئنجا نەك هەر ئەوەندە کە خوای پەروەردگار فەرمانی کردوە، پێنج هەستەکان بەکار بێنین و عەقڵ بەکار بێنین بۆ وەدەستهێنانی زانیاری، بەڵکو فەرموویەتی کەسانێك کە پێنج هەستەکان و عەقڵی خۆیان ناخەنە گەڕ و بەکاریان ناهێنن بۆ دۆزەخ ئامادەکراون وەك فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ

يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ (تر)، واتە: خەڵكی زۆرمان لە ئادەمی و جنۆكە بۆ دۆزەخ ئامادە كردوە، چونكە دڵیان(یر) هەیە پێی تێ ناگەن، وە گوێیان هەن پێیان نابیستن، چاویان هەن پێیان نابینن!! وە سەرەنجام بە هۆی ئەوەی كە دەزگاكانی وەرگرتن (اجهزة الاستقبال) یان لە خۆیاندا لە كار خستوە زۆر خراپیان بەسەر هاتوە ﴿أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ ئەوا نە وەك ئاژەڵ وان، بەڵكو گومڕاتریشن ئەوانەن بێئاگایان، چونكە ئاژەڵ حەواڵەی عەقڵ و دیتن و بیستنی خۆی نەكراوە بەڵكو مەحكوومی غەریزەكانیەتیو هەر چۆن بێ حاڵی لە هی مرۆڤێكی بێئاگای بەهرە وەرنەگرتوو لە عەقڵ و چاو و گوێی هەر چاكترە.!

كەواتە وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەو كێشەو مشتومڕەی نێوان عەقلانییەكان و هەستییەكان (الحسیون) شتێكی بۆش و بەتاڵە، (فرانسیس بیكۆن) كە یەكێكە لە زانا ئەورووپاییەكان لەو بارەوە نموونەیەكی جوان دەهێنێتەوە، دەڵێ: (ئەوانەی كە پشتیان بە پێنج هەستەكان بەستوەو تەنیا ئەو

---

(تر) (الاعـراف 159) .

(یر) دڵ (قلب) لە بەكارهێنانی قورئاندا ئاوەز (عقل )یش دەگرێتەوە كە مەڵبەند و كانگای بیرە،(قلب)یش دەگرێتەوە كە مەڵبەندی سۆز ( عاطفة )و ئیرادەو ویستن نەویستن و ڕەفز و قەبووڵە.

زانیارییانەیان پێ ڕاستە کە لە ڕێی پێنج هەستەکان وەدەست دێن، وەك (مێروولە) بیر دەکەنەوە کە تەنیا لە دەرەوەی خۆیەوە دانەوێڵەو شت دێنێت بۆ نێو شارە مێروولەکەی خۆی و کۆی دەکاتەوە، وە ئەوانەش کە پێیان وایە ئینسان تەنیا بە عەقڵ دەتوانێ زانیاری وەدەست بێنێ و دەرکی شت بکات وەکو (جاڵجاڵۆکە) وانە کە تەنیا لە نێو هەناوی خۆیداو لە (لیك)ی خۆی خانووی خۆی دەتەنێ و دەچنێ، یاخود کرمی (ئاوریشم) کە لە (لیك)ی خۆی قۆزاخە بە دەوری خۆیدا دەتەنێ! بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن: مرۆڤ هەم لە ڕێی پێنج هەستەکانەوەو هەم لە ڕێی عەقڵەوە دەتوانێ زانیاری وەدەست بێنێ، وەك (مێش هەنگ) وان کە هەم لە دەورەی خۆی شت دێنێ کە شیلەی گوڵان دەمژێ و هەم لە نێو خۆشی دا کارلێك (تفاعل)ی کیمیایی دروست دەکات و لە ئەنجامدا هەنگوین دروست دەکات! جا ئایین و بەرنامەی ڕاستی خوا ویستوویەتی ئینسان وەك (مێش هەنگوین) بێت، نەك وەك (جاڵجاڵۆکە)و (کرمی ئاوریشم) یان (مێروولە)!! ئنجا ئەوانەی کە بۆ سەرخستنی ڕێچکەی ئەزموون گەرایی ڕەخنەیان لە عەقڵ و لە سەرەتا عەقڵییەکان (الأوليات العلقية) یاخود بەڵگەنەویستە خوا ڕسکەکان (البديهيات الفطرية) گرتوە، هەڵوێستەکەیان تێپەڕاند (افراط)ێکی زۆری تێدایە. هەم لەوەدا کە گوتوویانە (عەقڵ) وەك کاغەزێکی سپی وایە و هیچی تێدا نیەو هیچی لە باراندا نیە. هەم کە ڕەخنەیان لە سەرەتا ڕۆشن و

بەڵگەنەویستە عەقڵیەکان گرتوە کە هیچ خاوەن عەقڵێکی بە و یژدان لام و جیمی یان تێدا ناکات، بۆ نموونە: (1) دوو دژ پێکەوە کۆنابنەوە (لایتجتمع النقیضان) بۆ نموونە: ناگونجێ بگوترێ: ئەو شتە هە شە و نیشە، (2) بەش لە هەموو بچووکترە (الجزء اصغر من الکل). (3) هەموو پەیدابوویەك پەیداکەرێکی هەیە (لکل حادثٍ مُحْدِثٌ) دیارە هەر کام لەم یاسایانە شتی ڕوون و بەڵگەنەویستن و هەموو خاوەن عەقڵێك قەناعەتی پێیانە، وەك دەگێرنەوە کە جارێکیان لە دەشتێك دا پرسیار لە کابرایەکی عەرەب کرا کە ئایا بەڵگەت چیە لەسەر بوونی خوا؟ هەڵبەتە کابرا شوان بوو ئاوای وەلام دایەوەو گوتی: (البعرة تدل علی البعیر، والخطوة تدل علی المسیر، فسماء ذات ابراج، وارض ذات فجاج، و بحر ذات امواج، الا تدل علی العلیم القدیر) واتە: قشپل بەڵگەیە لەسەر ووشتر، شوێن پێ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کەسێك لێرەوە ڕۆیشتوە. جا ئایا ئاسمانێکی خاوەن ئەستێرەو ڕازاوەو زەوی یەکی خاوەن دۆڵ و شیوو، دەریایەکی خاوەن شەپۆڵ بەڵگە نیە لە سەر خوایەکی خاوەن دەستەڵاتی زانا؟! بەڵێ هەستگەراییەکان کە گوتوویانە عەقڵ هیچ سەرەتاو هیچ مەبدەئێکی تێدا نیە جگە لەو مەعلووماتانەی کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە وەدەست دێن، قسەکەیان دەعوایەکی بێ بەڵگەی ڕووتە و بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر بە کورتی دەڵێین: چاکترین بەڵگە لەو بارەوە ئەوەیە کە ئەو سەرەتا

عەقڵییانە (المبادیء العقلیة) زۆر ڕوون و بێ چەندوچوونن، بۆ نموونە: (2 + 2 = 4) مەگەر کابرا شێت بێت ئەگەر نا نالێ دەکاتە (5)، یان بەش (جزء) بچووکترە لە هەموو (کل)، یان: یەك شت لە یەك کاتو شوێندا بڵێی هەیەو نیە!، کەواتە هەر ڕوونیی و بێ چەندوچوونی ئەو سەرەتا عەقڵیانە باشترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستییان، پاشان ئەوانە یاسای گشتی (عمومی)ن و بۆ هەموو کەس وەك یەکن نەك بڵێی فەیلەسووفێك دەزانی کە (2 + 2 = 4) بەڵام جووتیارێك نازانێ! یاخود بڵێی زانایەك دەزانێ کە (هەموو پەیدابوویەك پەیدا کەرێکی هەیە) بەڵام شوانێك نازانێ! نەخێر، بەڵکو ئەو بنچینانە لە عەقڵی هەموو کەسێکدا هەن، پاشان ئێمە سەیر دەکەین ئەم بەرەو پێش چوونی زانیاری و زانست و دۆزینەوەی نهێنییەکانی بوونەوەر، بە هۆی ئەو یاسا عەقڵییانەوەیە، بۆ وێنە: دەبێ چەند کەس لە پێش (نیوتن)دا هەزاران سێوی دیبێ کەوتبێتە نێو کانییەك، بێگومان زۆر کەس، سێوی بینیوە، هەناری بینیوە، وە هەموو جۆرە میوەیەکی دی، بەڵام بۆچی لە پێش (نیوتن)دا کەس نەیگوت: (بەربوونەوەی تەنێك لە سەرەوە بۆ خوارێ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هێزی کێشندە هەیە) لەبەر ئەوەی هیچ کەس وەك (نیوتن) باش سەرنجی نەداوە، بەڵام ئەو زۆر بە باشی ورد بۆتەوەو سەرنجی ئەو دیاردە سادەیەی داوەو لەسەر بنچینەی ئەوە کە زانیویەتی هەموو پەیدابوویەك پەیدا کەرێکی هەیەو هیچ

(مُسبَّب)ێك بە بێ (سبب) نابێت، کەوتنە خوارەوەی ئەو سێوە سەرنجی ڕاکێشاوەو گوتوویەتی ئەو کەوتنە خوارەوەیە هۆیەکی هەیە بزانم ئەو هۆیە چیە؟ ئیدی لێی کۆڵیوەتەوەو زانیویەتی کە هێزی کێشندە کێشی دەکات بەرەو لای خۆی، کەواتە بە هۆی ئەو سەرەتا عەقڵی یا نەوە دۆزینەوەی نهێنی یەکانی بوونەوەر هاتۆتە دی.

دیسان قسەی هەستگەرایەکان کە دەڵێن: ئینسان هەیە شتێکی لە مێشکدا نیەو مێشك وەك پەڕێکی سپی وا یەو زانیاری لە پێنج هەستەکانەوە دێت و دەچێت بۆ نێو مێشك و دەبێت بە زانراوەکان (معلومات) وە قسەی عەقڵ گەرایەکانیش کە دەڵێن: عەقڵ پێویستی بە پێنج هەستەکان هەر نیەو بۆ خۆی هەموو زانیاری یەکی تێدایە، ئایا کامیان ڕاستە؟! لە وەڵامدا دەڵێین ئەگەر لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دیقەتی ئەو مەسەلەیە بدەین. دەبێ بڵێیـن هیچ کامیان ڕاست نین!! با سەرنج بدەین خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَاللّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ الْسَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾(٣٨) واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێنا کە هیچ شتێکتان نەدەزانی، پاشان بیستن و دیتن و عەقڵی پێدان... کەواتە: ئەوەی لەو بارەیەوە لەو ئایەتە بە پێزە وەردەگیرێ ئەوەیە کە: مرۆڤ سەرەتا پێنج هەستەکانی دەکەونە جموجۆڵ، دوایی وردە وردە عەقڵ

(٣٨) ( النحـل 78 ).

مەعلوماتی پەیدا دەبێ و ئەویش دەکەوێتە جموجۆڵ پاش ئەوەی لە لایەن هەستەکانەوە کەرەسەی بۆ فەراهەم دەهێنرێ.

بۆیە قسەی هەستگەرایەکان بە ڕەهایی ڕاست نیە، کە لە ڕێگەی پێنج هەستەکانەوە نەبێ عەقڵ هیچ لە دەست نایەت، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە عەقڵ لە خودی خۆیدا توانای هەیە کە شت بزانێ و فێر بێت، بە تایبەت یاسا بەڵگەنەویستەکان، بەڵام هەتا پێنج هەستەکان بەکارنەهێنێ ئەو شتانەی بە کردەوە (بالفعل) تێیدا پەیدا نابن.

## دەرسی چوارەم

### خاڵی چوارەم:

**وەحی خوا بەرزترین و ڕاست ترین و بێ هەڵە و پەڵەترین سەرچاوەی زانیاری و زانستە.**

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد الأنبياء والمرسلين محمد وآله المهتدين بهداه الى يوم اللقاء.

بەرێزان:

ئەصڵی وشەی (وحي) لە زمانی عەرەبیدا هەم بە خێرایی ( سرعة) دەگوترێ، هەم بە قسەی پەنهان دەگوترێ و هەم بە ئاماژە (اشارة)یش، بەڵام لە زاراوی شەرعدا (و حي) بریتییە لەو پەیام و بەرنامە (شريعة)یەی کە خوای پەروەردگار لە ڕێی (جبريل)ەوە بۆ پێغەمبەرانی خۆی (عليهم الصلاة والسلام) ڕەوانە کردوە، وەکو فەرموویەتی: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ۞ عَلَى قَلْبِكَ﴾[ت]، واتە: ئەم قورئانە (روح الامين) کە (جبريل)ە دایبەزاندوە بۆ سەر دڵی تۆ ئەی محمد (عليه الصلاة والسلام) جا (وحي) خوای کاربەجێ بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)و ئەوانیش کە بە ئینسانەکانیان گەیاندوە وەك پێنج هەستەکان نیە، کە تەنیا باسی دیاردە بەرهەست (محسوس)ەکان بکات، وە وەك عەقڵیش نیە تەنیا هەڵسوکەوت (تعامل)ی لەگەڵ بابەتە عەقڵییەکاندا بێ، بەڵکو (وحي)ی خوای بەخشەر باسی وردو درشتو باسی سەر لە بەری بوون (وجود) بە بینراو و نەبینراوەوەو بە سروشتو ئەو دیو سروشتو بە ئاشکراو پەنهانو بە دنیاو دوارۆژو، بە ڕابردوو و داهاتوویەوە دەکات، بە

(ت) ( الشعراء 193، 194 ).

کورتی (وحي)ی خوا (تبارك وتعالى) ڕەهایی باسی بوون (وجود) دەکات بە گشتیو بە ڕەهایی کە خوای پەروەردگار لە قورئان دا و شەی (الغیب) و (الشهادة)ی بۆ بەکارهێناوە، لەگەڵ و شەی (**ما تبصرون** )و (**وما لا تبصرون**) جا (غیب) واتە: نادیارو (الشهادة) واتە: بینراو، وە (**ما تبصرون**) واتە: ئەوەی کە دەیبینن و (**وما لا تبصرون**) واتە: ئەوەی کە نایبینن، وەك دەفەرموێ: ﴿ **هُوَ اللّهُ الّذِي لَا إِلَهَ إِلا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ**﴾(تر). واتە: خوا ئەو خوایەیە کە تەنیا ئەو پەرستراوە، زانای پەنهان و ئاشکرایە، و ئەو بە بەزەیی و بەخشندەیە، وە فەرموویەتی: (**فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ، وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ، إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ**)(یر)، واتە: نەخێر سوێند دەخۆم بەوەی کە دەیبینن، وە بەوەش کە نایبینن، بێگومان ئەم قورئانە قورئانێکی بەرێزو بە پێزە.

دیارە تاکە (وحي)یەکی خوای بەرزو مەزنیش بۆ مرۆڤایەتی کە بە مسۆگەری و دڵنیاییەوە متمانە پێکراوە جێی باوەڕ بێت و بە دەست ئینسانەوە مابێت تەنیا قورئان و سوننەتی ڕاستی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام ).

بەڵی ئێمە بڕوامان بە هەموو ئەو کتێبانە هەیە کە خوا (تبارك و تعالى) بۆ پێغەمبەرانی خۆی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوون، وەك خوای زاناو توانا لەسەر زمانی مسوڵمانان فەرموویەتی: ﴿ **لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ**

---

(تر) ( الحشر 22) .

(یر) ( الحاقة 38، 39، 40 ) .

أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ ﴾[٣٨]. جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانی و هەموویان جێگەی ڕێزو حورمەتن، وە پەیام و کتێبەکانی خواش بە ڕاست دەزانین و بڕوامان بە هەموویان هەیە، بەڵام بێجگە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئێمە (وحي)ێکی دیکەی پارێزراومان لەبەردەستدا نیە، واتە بڕوامان بە ئەصڵی تەورات و ئینجیل هەیە، بەڵام ئەو تەورات و ئینجیلەی ئێستاکە بەدەست جوولەکە و نەصرانیەکانەوەن هیچ گومانمان نیە کە گۆڕراون و دەستکاری کراون. هەروەها کتێبەکانی دیکەش وەك (زبور)ی داودو (صحف)ی ابراهیم (علیهما الصلاة والسلام)، بەڵێ هەموو پەیامەکانی خوا کە لە قورئاندا باس کراون ڕاستن و بڕوامان بە هەموویان هەیە وەك دوایی بە درێژی باسیان دەکەین، بەڵام بە دروستی نازانین شوێنی هیچ کامیان بکەوین، لەبەرئەوەی خوای زاناو شارەزا بە دەقی قورئان پێی ڕاگەیاندووین کە خاوەن کتێبە پێشووەکان تێکڕاو بەتایبەت جوولەکەو نەصرانیەکان کتێبەکانیان گۆڕیون، وەك لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ ﴾[٣٩]، ﴿ فَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ ﴾[٤٠]، ﴿ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِن بَعْدِ مَوَاضِعِهِ ﴾[٤١]. کەواتە:

---

(٣٨) ( البقرة 285 ) .

(٣٩) ( النساء 46) .

(٤٠) ( المائدة 14) .

(٤١) ( المائدة 41) .

ئەوەی ئێستا بتوانین بڵێین: ئەوە کتێب و فەرموودەی خوایە بەرا ستی و سەلامەتی ماوەتەوە تەنها قورئانە. دیارە سوونەتیش وەحی ناڕاستەوخۆی خوایەو خستوویەتە دڵی پێغەمبەرو ئەویش بە قسەو بڕیارو کرداری خۆی ڕوونی کردۆتەوەو بەرجەستەی کردوە.

ئێستاش لە پاش ئەو برە پێناسەو ڕوونکردنەوەیە لە (7) خاڵ ندا باسی (وحي)ی خوای پەروەردگار دەکەین داخۆ چ دەورێکی هە یە لە بواری وە دەست هێنانی زانیاری و زانستدا.

یەکەم: پێنج هەستەکان (الحواس الخمس) تەنیا توانای هەڵ سوکەوتیان لەگەڵ دیاردە ماددی و بەرهە ست (محسوس)ەکاندا هە یە بۆ یە بەکارهێنانی پێنج هەستەکان لە دەرەوەی چوغزو باز نەی د یاردە ماددییەکان شتێکی بێجێیە، چونکە لە دەرەوەی ئەو بازنە یەدا توانایان نیە.

ئنجا ئەو مەسەلەیەش هێندە ڕوونە پێویستی بە سەلماندن نا کات، ئاخر (چاو) جگە لە دیمەنە ماددییەکان و (گوێ) بێجگە لە دەنگە بەرهەستەکان و ... هتد، ناتوانن دەرك بکەن، بۆیە کەسێك بە تەما بێت لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە شتی غەیرە ماددی بزان ێت بێگو مان توشی هەڵە دەبێت و وەك کەسێکی لێ دێت کە بیەوێ بە تۆڕی ماسی پێگرتن هەوا بگرێت، یاخود تیشك بگرێت!! کە بێگومان بە دە ستی بەتاڵەوە دەگەڕێتەوە، چونکە پێنج هەستەکان ڕاوچی یەك نین کە بتوانن ڕاوی ئەو جۆرە نێچیرانە بکەن.

دووەم: عەقڵ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بێجگە لە بەڵگە نەویستە خوارسکەکان (البدیهات الفطریة) واتە ئەو بنچینەو یاسایانەی کە خوای گەورە لە عەقڵ دا دایناون و هەموو ئینسانەکان تێیدا بەشدارن وەك پێشتر باسمان کردو نموونەمان لەسەر هێنایەوە، عەقڵ بێجگە لەوە، وە بێجگە لەو مەعلوومات و زانیارییانەی کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە بۆی دێنەوە، هیچی دیکەی نییە، لەبەر ئەوە عەقڵیش لەگەڵ جیهان (عالم)ی ماددەدا نەبێ ناتوانێ هەڵسوکەوت بکات، ئەوەندە هەیە کە ئیمتیازو (فەضل)ی عەقڵ بەسەر پێنج هەستەکانەوە ئەوەیە کە پێنج هەستەکان بەس وێنە بۆ عەقڵ دەگرن، چاو وێنەی دیمەنەکان دەگرێت، گوێ تەنیا دەنگەکانی بۆ تۆمار دەکات وە هەروەها باقی هەستەکان، بەڵام عەقڵ شت (تحلیل) دەکات و شی دەکاتەوەو بنچینە لەسەر ئەو زانیارییانە دروست دەکات، وە ئەنجام گیرییان لێدەکات، بەڵام ئەگەر بیەوێ لە ڕێگەی عەقڵەوە جیهان (عالم)ی پەنهان (غەیب)و میتافیزیك (ما وراء الطبیعة) دەرك بکەی و بناسی و پەی پێ بەیەی، ئەوەش دیسان شتێکی بێجێیە و بەکارهێنانی عەقڵە لە غەیری بوارو مەیدانی خۆیدا، هەر بۆیەش فەیلەسووفەکانی یۆنانی لەو ڕووەوە زۆر بەهەڵەدا چوون کە ویستوویانە تەنیا لە ڕێگەی عەقڵەوە قسە لە خواو فریشتەکان و سەرجەم شتە نادیارەکان بکەن.

سێیەم: بەڵام وەك چۆن پێنج هەستەكان ئەگەر بۆ خۆشیان نەتوانن لە شت حاڵی بن، بەڵام دەتوانن زۆرباش دەستبار بۆ عەقڵ بگرن و مەعلوماتەكانی بخەنە بەردەست، پاشان عەقڵ بۆ خۆی ئەنجام گیری یان لێبكات، عەقڵیش دەتوانێ دەستبار بۆ وەحی بگرێ لێرەدا بۆ ڕوونكردنەوەی مەبەست با ئەم بەسەرهاتەتان بۆ بگێرمەوە(تر).

دەگێڕنەوە كاتی خۆی (لینین) نوێنەرێكی خۆی دەنێرێ بۆ لای خەڵكی شاری (سەمەرقەند) كە خەڵكەكەی مسوڵمان بووە تاكو بەرەو ئیلحادو ماركسیزم بانگیان بكات و تووێژیان لەگەڵ بكات دەربارەی بوونی خوا، یەكێك لە زانایانیان دەچێت دوو تۆپی بچووكی یاریكردنی منداڵان لەگەڵ خۆیدا دەبات كە یەكێكیان لە ئاسن دروست كرابوو یەكێكیشیان لە تەختەدار دروست كرابوو، بەڵام هەردووكیانی بە یەك بۆیاغ ڕەنگ كردبووكە نەدەزانرا كامیان ئاسنەو كامیان تەختەیە، دوای ئەوەی دادەنیشن و دەست بە قسە دەكرێت نوێنەرەكەی لینین دەڵێ: ئێوەی مسوڵمان تەنیا بە دوای ئەفسانە كەوتوون، چونكە بێجگە لەوەی كە بە پێنج هەستەكان هەستی پێ بكرێت بوون (وجود)ی نییە! زانا مسوڵمانەكەش بە شێنەیی پێی دەڵێت: تۆ پێت وایە هەر شتێك بوونی هەبێت دەبێ بە پێنج هەستەكان هەستی پێ بكرێت و بزانرێت؟! كابرا

---

(تر) ئەو بەسەرهاتەم بە كورت كراوەیی و تۆزێك دەستكارییەوە لە كتێبی (ئیسلام و ڕێچكان) خواستوە، بڕوانە لاپەڕە (46 و47) چاپی سێیەم، 2006، نوو سینگەی تەفسیر.

دەڵــێ بەڵــێ: زاناکە دەڵــێ: یانی پێت وایە کە هیچ شتێك نییە کە پێنج هەستەکان پەی پێ نەبەن و نەیزانن؟! کابرا دەڵــێ بەڵــێ: ئەوەی پێنج هەستەکان پەی پێ نەبەن و نەیزانن نیە! زانایە مسوڵمانەکەش پێی دەڵێت: من بەڵگەت بۆ دەهێنمەوە کە شتی وا هەیە پێنج هەستەکانیش هەستی پێ ناکەن و هەشەو زۆر باشیش هەیە، کابرا دەڵێ کوا نموونەم بۆ بێنەوە، زانا مسوڵمانەکەش دوو تۆپە کە دەردەهێنێت و لە بەردەمی کابرا دایان دەنێت و دەڵــێ: فەرموو ئەم دوو تۆپە یەکیان لەوی دیکە قورس ترە، دە فەرموو ئەگەر راستە پێنج هەستەکان هەموو شتێك دەزانن تەماشایان بکەو بۆنیان بکەو تامیان بکەو گوێیان بۆ بگرەو دەستیشیان لــێبدە بزانە کامەیان کە قورس ترەو هەر پێنج هەستەکانت بەکاربهێنە؟! کابراش سەیریان دەکات و دەڵــێ ئایا هەردووکیان وەك یەك نین؟! زاناکە دەڵــێ نەخێر یەکیان قورس ترە لەوی دیکەیان و بە پێنج هەستەکانت بزانەو دەری بخە داخۆ کامیان قورس ترە، کابرا پێنج هەستەکانی بەکار دێنێت و سەرەنجام دەڵــێ: نازانم کامیان قورسترە، بەڵام با هەڵیان سەنگێنم، زاناکە دەڵێ نەخێر چونکە هەڵسەنگاندن کاری هیچ کام لە پێنج هەستەکان نییەو، عەقڵ پێت دەڵێت هەڵیان سەنگێنە! کابرا بە مل کەچی یەوە دەڵــێ: راستە وایە، زانایەکەش دەڵێ: کەواتە هەر عەقڵیش پێت دەڵێ خوای پەروەردگار هەیە، با پێنج هەستەکانیش هەستی پێ نەکەن!.

بەڵــێ پێنج هەستەکان مەعلوومات کۆدەکەنەوە بۆ عەقڵ وەك پێشتر باسمان کردو نموونەی (مێش هەنگوین)مان هێنایەوە. عەقڵیش لەو مەعلوومات و زانیارییانەی پێنج هەستەکان کەڵك وەردەگرێ و ئەنجامگیرییان لــێدەکات و پاشان کۆمەڵێك بنچینەی عەقڵییان لــێ دروست دەکات، کەواتە پێنج هەستەکان بۆ خۆیان ناتوانن دەرکی حەقیقەتی شتەکان بکەن، بەڵکو ئەوە عەقڵە کە بەهاوکاری پێنج هەستەکان ئەو کارە دەکات.

ئنجا عەقڵیش ناتوانێ دەرکی ئەودیو سروشت بکات و یەکسەر بڵــێ خوا ئاوایەو سیفەتەکانی ئاوان و قسە دەربارەی فریشتەکان و ڕۆژی دوایی و شتە غەیبییەکان بکات.

بەڵام عەقڵ دەتوانێ دەستبار بۆ (وحي) بگرێ بەو واتایە کە سەرنجی ئەم بوونەوەرە بدات بە پێی بنچینە عەقڵییەکان بڵێ: ئەم بوونەوەرە خاوەنێکی هەیە، بەڵام عەقڵ ناتوانێ قسە دەربارەی چۆنیەتی ئەو خاوەنەو ناوو سیفەتەکانی بکات، بەڵــێ دەتوانی بڵــێ زۆر بەتواناو زاناو کاربەجێیە، بەڵام ناتوانێ بە وردی پێناسەو وەسفی بکات، چونکە ئەوە ئیشی عەقڵ نیە، عەقڵ تا سەرسوێی جیهانی مادده دەڕوات و لەوێ بەولاوە جیهانی ئەودیو سروشت (میتافیزیك)ەو ناتوانێ هیچی دەربارەی بڵــێ مەگەر بە گومان و تەخمین کە دیارە قسەی گۆترەو گومانیش حیسابی لەسەر ناکرێ.

کەواتە: دەبێ پێنج هەستەکان لە سنووری خۆیان نە چنە دەرێ ئەگەرنا تووشی هەڵە دەبن، دیسان عەقڵیش لە سنووری خۆی نابێ بچێتە دەرێ. ئنجا یەکێك لەو مەسەلانەی کە بۆتە مایەی مشتومڕو تێکگیرانی زاناو پێشەوایانی ئیسلام لە گەڵ بیدعەچییەکان (أهل البدع)دا بە تایبەت موعتەزیلە ئەوەبووە کە (معتزلة) گوتوویانە: هەر (نص)ێکی قورئان و سوننەت کە لەگەڵ عەقڵ نەگونجێ دەبێ (تأویل) بکرێ، زاناو پێشەوایانیش گوتوویانە: نەخێر بەڵکو بە پێچەوانەوە هەر کات ئێمە دڵنیا بووین لەوەی کە ئەوە دەق (نص)ی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ مانای وایە ئەو دەق (نص)ە لە زانیاری بێ سنووری خواوە هاتوە، کەواتە دەبێ زاڵی بکەی بەسەر هەموو شتێکداو هەر کات عەقڵ لەگەڵی تێکگیـرا دەبێ بگوترێ دیارە عەقڵەکە تەواو نیە، نەك دەقەکە کە زانیاری و (وحي) خوایە! بەڵام بە مەرجی ئەوە کە دڵنیابی لەوەی دەقەکە (وحي) یە، جا ئەگەر قورئان بوو ئەوە باشەو بەڵگەنەویستە کە قورئان هەمووی (وحي) یە وە ئەگەر سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ بوو دەبێ لێی بکۆڵرێتەوەو ساغ بکرێتەوە دا خۆ چ جۆرێکەو چ پلەیەکی هەیە، چونکە بێگومان سوننەت لەو ڕووە وە پلە پلەیەو یەك جۆر نییە. دیارە هیچ کاتێکیش دەق (نص)ی ڕاست (صحیح) لەگەڵ عەقڵی ساغ (صریح)دا تێك ناگیرێن وشتێکی نەگونجاو (مستحیل)ە کە ئایەتێکی خوا یان فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عەقڵ و زانیاریدا تێك بگیرێن و هەرکات تێکگیران یان بەڵگە

عەقڵییەکە تەواونیە ، یان دەقەکە دەقێکی ڕاست نیە لە ڕووی سەنەدەوە یان لە ڕووی مانا لێدانەوەوەو تەفسیرکردنەکە ڕاست نیەو هەڵەیە.

ئنجا عەقڵ دوای ئەوەی کە ئیمانی بە (وحي) هێنا دەتوانێ لێی حاڵی بێت و شی بکاتەوەو تەفسیری بکات و پراکتیزە (تطبیق)ی بکات لەسەر ئەرزی واقیع، وەك چۆن عەقڵ بەر لەوە هەقی خۆیەتی کە لێبکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی کە ئەو کەسەی دەڵێ مِن پێغەمبەری خوام بەڵگەی چیە، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هیچ کامیان بەبێ بەڵگە نەنێردراون وەك خوا فەرمووویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ﴾[1]. واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان (علیهم الصلاة والسلام) بە بەڵگەی ئاشکراو ڕوونەوە ناردوون، دوایی لە شوێنی خۆیدا ئەم بابەتە دەتوێژینەوە.

<u>چوارەم:</u> وەك چۆن پێنج هەستەکان و عەقڵ هیچ ناکۆکی و دووبەرەکییەکیان لە نێوان دا نیە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە هەستگەرایەکان و عەقڵ گەرایەکان دەیانگوت بەڵکو پێنج هەستەکان لە خزمەتی عەقڵ دان، وە عەقڵیش سەرپەرشتی پێنج هەستەکان دەکات و هەرکات بە هەڵەدا بچن بۆیان ڕاست دەکاتەوە، بە هەمان شێوەش لە نێوانی پێنج هەستەکان وعەقڵیشدا لەلایەك و (وحي)و پەیامی خوا لە لایەکی دیکەوە، هیچ دژایەتی و ناکۆکی یەك نیەو، هیچ کاتێك عەقڵ لەگەڵ (وحي) تێك ناگیرێ، وەك چۆن

---

[1] ( الحدید 25 ) .

هەرگیز پێنج هەستەکان و عەقڵ بەیەکەوە تێك ناگیرێن، بەڵکو عەقڵ لەگەڵ سەربازەکانیشیدا کە پێنج هەستەکانن لە خز مەتی (وحي) دان و (وحي)یش سەرپەرشتی عەقڵ و پێنج هەستەکان دەکات و ڕێنموونییان دەکات، کەواتە ئەوەی کە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا (العصور الوسطى) ئەو هەراو کێشەیەی کە لە نێوانی پیاوانی کەنیسە لە لایەك وە فەیلەسووف و زانایانی سروشتناس (علماء الطبيعة) لە لایەك هەبوو، لە ڕاستیدا ئەوە هەراو کێشەیەك نەبوو لە نێوان عەقڵ و زانیاری لە لایەك و دین و (وحي) خوا لە لایەکی دی، بەڵکو کێشەیەك بوو لە نێوان عەقڵ و زانیاری لەگەڵ ئەفسانەو فیکری هەڵەی بەناو دین دا، چونکە وەك باسمان کرد جوولەکەو نەصرانییەکان دینی خوایان گۆڕی بوو و پڕیان کربوو لە ئەفسانەو شتی پڕوپووچ، وە هەندێك بیروڕاو بیردۆزەی فەلسەفەی (یۆنانی)یان تەبەننی کردبوو کەلەگەڵ عەقڵو زانیاریدا نەدەگونجاو خەڵکی زاناو هۆشیار ڕەتی دەکردەوەو پیاوانی کلێساش دەیانگوت ئەو خەڵکە دین ڕەت دەکاتەوەو دژی دین دەوەستێ! بەڵام لە ڕاستیدا خەڵکەکە ئەفسانەی ڕەت دەکردەوە!، بەڵام لە ئیسلامدا قەت حاڵەتێکی ئاوا نەهاتۆتە پێش، چونکە ئیسلام(وحي)ێکی ڕاستی پارێزراوە لە دەستکاری وگۆڕان و، عەقڵو نەقڵی ڕاست و ساغیش هەرگیز تێك ناگیرێن!.

ئنجا لە لایەکی دیشەوە وەك چۆن پێنج هەستەکان بە دیلی عەقڵ نین و عەقڵیش بێ نیاز نیە لە پێنج هەستەکان، بە هەمان شێوەش عەقڵ بە دیل نیە بۆ (وحي) چونکە عەقڵ تەنیا تا سنوورێك دەتوا نێ بڕ بکات، لەو سنوورە بەولاوە دەبێ خوای پەروەردگار پ ێی ب فەرموێ: ئەی عەقڵ! لێرە بەولاوە باس وخواس و هەواڵ ئاواو ئاوایە! بەڵام دیسان (وحي)یش لە عەقڵ و پێنج هەستەکان بێ منەت و بێ نیاز نیە.

بەڵکو ئەویش لە ڕێگەی ئەوانەوە پەیوە ندی دە کات بە جیهانی ماددەوەو سەرپەرشتی ژیانی ئینسان دەکات، ئەوەتا خوای کار بەجێ دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾(ت). واتە: دۆزەخییەکان لە دۆزەخدا پەشیمان دەبنەوە دەڵێن: ئە گەر ئێ مە بیستبامان و عەقڵمان بەکارهێنابایە ئێستا نەدەبووینە هاوەڵی دۆزەخ.

مانای وایە وەحی خوای زاناو شارەزا گلەیی لە خەڵك دەكات كات ێك عەقڵ و هەستەکانی خۆیان بەکار ناهێنن بۆ دۆزینەوەی حەق.

پێنجەم: ئیمتیازێکی دیکەی ئیسلام لە بواری (وحي)دا ئەوەیە کە وەك پەندێکی پێشینان دەڵێ: (نان بۆ نانەواو گۆ شت بۆ قە ساب)، دینی خوای بێ وێنە جوغزو بازنەیەکی د یاری کردوە بۆ پ ێنج هەستەکان، وە جوغزو بازنەیەکی دیکەی دیاری کردوە بۆ عەقڵ، پاشان جوغزو بازنەیەکی بەرفراوانتری د یاری کردوە کە دەوری هەموویانی داوە بۆ قەڵەمڕەوی (وحي)، واتە: ئەگەر ویستت شتێك

(ت) ( الملك 10 ) .

ببینی، یان دەنگێك ببیستی، یان شتێك بۆن بکەی، تام بکەی، لەمس بکەی، ئەوە پێنج هەستەکان، وە ئەگەر ویستت شتێك شی بکەیتەوەو تێی بفکری ئەوە عەقلْ، بەلاّم ئەگەر ویستت لەو سنوورە بەولاوە بچی و بزانی لەودیو چ باسە، پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ (وحي) خوای زاناو تواناو لە ڕێگای پێنج هەستەکان و عەقڵەوە ئەوەت دەستگیر نابیّ، ئێستا با بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست چەند نموونەیەك بهێنینەوە:

* ڕۆژێك پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (روح) گیان، خوای بەخشندە فەرمووی: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾(تر). واتە: پرسیار لە تۆ دەکەن دەربارەی (روح) گیان، تۆ بلّیّ گیان لە ئیشوکاری پەروەردگارمەو تایبەتە بەوەوە، وە ئێوەش کەمێك نەبیّ زانیاریتان پیّ نەدراوە.

واتە: بەو زانیاری یەکەمەی کە پێتان دراوە ناتوانن دەرکی حەقیقەتی ڕووحی پیّ بکەن، ڕووح هەیە بەلاّم زانیارییە کەمەکەی ئێوە هەر بایی ئەوەیە کە بوونی ڕووحی پیّ بزانن و دەرك بکەن نەك دەرکی حەقیقەتەکەی بکەن، سەرنج بدەن خۆشەویستترین دۆست و هاوەڵت هەتا لە ژیان دایە حەز دەکەی هەمیشە لەبەر چاوت بیّ، بەلاّم هەر کە مردو گیانی لە لاشە دەرچوو حەز دەکەی هەتا زووترە لەبەر چاوت ون بێت بۆچی؟! چونکە ئەوەی تۆ پیّی ئاشناو هۆگر (مأنوس) بووی

(تر) (الاسراء 85).

گیانەکەی بووە و ئەویش سەفەری کردوە! دیارە ئێمە ئێستا نامانەوێ قسە لەسەر سەلماندنی بوونی ڕووح بکەین، بەڵکو دەمانەوێ ئەوە نیشان بدەین کە قسەکردن دەربارەی ڕووح یان جیهانی نادیار (غیب) بەو زانیاری یە کەمەی کە ئینسان هەیەتی و بەو عەقڵە سنووردارەی هەیەتی شتێکی بێ ئاکام و نابەجێ یە، بەڵکو لەو بارەیەوە دەبێ گوێ بۆ (وحي) بگرێ.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (تفكروا في خلق الله ولا تفكروا في الله فأنكم لن تقدروا قدره) (تز). واتە: بیر لە دروستکراوی خوا بکەنەوەو بیر لە خوا مەکەنەوە، چونکە ئێوە وەك پێویست و وەك ئەوەی کە شایستەیە بۆ مەقامی خوا (سبحانه وتعالى) ئاوا ناتوانن حەقی خۆی پێ بدەن، بۆچی؟! چونکە هەرچی بێتە نێو بیرو زەین و عەقڵی ئینسانەوە وێنە یان سێبەرو خەیاڵی شتێکی ماددی یە، خوای پەروەردگاریش ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ﴾(ىر)، هیچ شتێك وەك وی نیە، کەواتە عەقڵ ناتوانێ دەرکی ئەو حەقیقەتە بکات، بەڵکو تەنیا دەبێ لە ڕێگەی (وحي)یەوە لە بارەی خوای مەزن (سبحانه وتعالى)و ناو و سیفەت و... هتدیەوە قسە بکرێ.

(تز) أبو نعيم عن ابن عباس.
(ىر) ( الشورى 11).

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمویٚ: (تفكروا في آلاءِ الله ولا تفكروا في الله)[تر]. واتە: بیــر لە نیعمەتەکانی خوا بکەنەوە بەلاٚم بیــر لە خوا مەکەنەوە.

* ئەوە دەربارەی خوای بیٚوێنەو هاوتاو دەربارەی ڕووح، بەلاٚم دەربارەی دیمەن و دیاردە سروشتییەکان، دەربارەی بوونەوەرو دەوروبەر، خوای پەروەردگار نەك فەرموویەتی بیــری لــیٚ مەکەنەوەو گویٚی مەدەنیٚ، بەلٚکو بیــرلیٚکردنەوەیانی فەرزیش کردوەو چەندان ئایەت لەم ڕووەوە هەن، بۆ وێنە دەفەرمویٚ: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ مِن شَيْءٍ ﴾[ير]. واتە: ئایا تەماشای مولٚکی بەرفراوانی خوایان نەکردوە لە ئاسمانەکان و زەویدا وە هەر شتیٚك کە خوا دروستی کردوە، بۆ سەرنجی نادەن و لــیٚی ورد نابنەوە!!.

هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿ قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ﴾[سم]. واتە: پیٚیان بلٚیٚ سەرنج بدەن کەچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە!.

وە دەفەرمویٚ: ﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ (20) وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾[شم]. واتە: لە زەویدا چەندان بەلٚگە هەن بۆ ئەوانەی کە

(تر) الطبراني في (الاوسط)، والبيهقي في ( شعب الايمان ) عن عبدالله بن عمر، لە کتیٚبی (كشف الخفا ومزيل الالباس) العَجْلوني، بەرگی(1) لاپەڕە 37 .

(ير) ( الاعـراف 185) .

(□) ( يونس 101) .

(□) ( الذاريات 20 □ 21) .

عەقلْ و زانیاری یان هەیە وە لە نەفْ سی خۆ شتاندا بۆ چی تەما شا ناکەن!!.

بەڵێ بەرێزان: وەحی ڕاست و دروستی خوا لە سەر ئین سانەکانی فەرزو پێویست کردوە کە لەو مەیدان و لەو بوارەدا کە دەتوانن ئە سپی خۆیان تاو بدەن بە هۆی پێنج هەستەکانەوە، بە هۆی عەقلْ و بـ یـرو هۆشەوە، سەرنج بدەن و لێبکۆڵنەوە، کەواتە ئەگەر کەسانێك بە نەزانی پێیان وا بێت کە ئیسلام ڕێی لە وەدەست هێنانی زانیاری گرتوە یان ڕێی لە بەکارهێنانی عەقلْ و ڕێی لەوە گرتوەکە لە ڕێ ی پێنج هە ستەکان نهێنی و ڕاستییەکانی بوون کە خوا وەك چەند یاسایەك تێیدا دایناون، بدۆزنەوە ئەوە لە نەزانی خۆیەوە قسە دە کات، یاخود د یارە قیا سی کەشکێ لە مەشکێ دەکات و وادەزانێ کە بەرنامەی ڕاستی خوا کە ئیسلامە وەك ئەو دینە شێوێنراوەی ڕۆژئاوا وایە کە لە گەڵ عەقلْ و زانیاری دا نەدەگونجا.

شەشەم: هیچ کاتێك (وحي) خوای کاربەجێ و عەقڵی ساغی ئینسان و ئەو زانیارییە تەواوەی کە بەدەستی دێنێ، دژ ناوەستن وتێك ناگیرێن.

سەیر بکەن: بۆ عەقلْ قەیدی (ساغ)مان داناوە، بۆ زانیاری قە یدی (تەواو)مان داناوە، چونکە بێگومان عەقڵی نەخۆش لە گەڵ (و حي) خوادا تێك دەگیرێ، وەك چۆن ئینسانی نەخۆش ئاوێکی شیرین و زولاّ لێ لە زاری تاڵە! کە دیارە ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوە کە ئاوە کە تا ڵە، بەڵکو ئەو کەسە خۆی میزاجی تێکچووە، بە هەمان شێوەش کە سی وا

هەیە عەقڵەکەی نەساغە شتێك کە زۆر حەق و ڕاستە لە بەرنامەی خوادا ئەو بەناتەواوی دەزانێ، جا بێگومان قەناعەتەکەی وی بەڵگە نیە لەسەر ناتەواویی بەرنامەکەی خوا، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر تێک چوونی میزاج و باری ئاسایی ئەو کەسە خۆی، بۆیە دەبێ عەقڵ ساغ بێت ئەوجا لەگەڵ (وحي) خوادا تێك ناگیرێ، وە دەبێ زانیاریش تەواو بێت، بەڵام شتێك بەناوی زانیاری یەوە بێت، وەك بیردۆزە هەڵەو پڕ ئەفسانەکەی (فرۆید) لە بواری (جینس)داو بیردۆزەکەی (مارکس) لە بواری مێژووناسیدا و بیردۆزەکەی (داروین) لە بواری گەشە سەندنی گیاندارانداﹰ، کە دوایی دەرکەوت ئەوانە هەموویان بیردۆزەی پڕ لە ئەفسانەو دوور لە زانیاریین، ئەوە بێگومان تێکگیرانی ئەو جۆرە شتانە لەگەڵ (وحي)دا، پێی ناگوترێ: تێکگیرانی (وحي)و زانیاری! بەڵێ هیچ کاتێك (وحي) خوا بە مەرجێك ئەو (وحي) یەش نەگۆڕرابێت، هیچ کاتێك لەگەڵ عەقڵی ساغ و لە گەڵ زانیاری تەواودا تێک ناگیرێن، بۆچی؟! چونکە (وحي) خوا بریتیە لە فەرمایشتی خواو زانیاری و زانستیش بریتیە لەو نهێنی و یاسایانە کە عەقڵ پەییان پێ دەبات لە دروستکراوەکانی خوادا، کەواتە زانیاری کە شفی نهێنی و یا ساکانی دروستکراوەکانی خوا دەکات و، دین (وحي)یش فەرمایشتی خوایە، بە واتا یەکی دی: (دین) فەرمودەی خوا یەو زانیاریش وە سفی دروستکراوەکانی خوایە، دەشتوانین بڵێین: (وحي) زانیاری خوامان

دەخاتە بەردەست و (زانیاری)یش[تن] کردەوەو دروســــــتکراوی خوا مان بۆ وه سف دە کات، د یارە ق سەوکردەوەی خوا، یان زان یاری و دروستکراوانیشی پێکەوە دژو ناكۆك و نا تەبا نابن! چونكە خوای پەروەردگـــــار دەربارەی فەرمای شتی خۆی فەرموو یەتی: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِــدْقًا وَعَدْلاً لاَّ مُبَدِّلِ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾[يـ].
واتە: بێگومان فەرمودەی پەروەردگـــارت هەم لە ڕووی ڕاســتی یەوەو هەم لە رووی دادگەرییەوە تەواوە، چونکە فەرمایشتی خوا دوو بە شە: بەشـــێكی هەواڵدانەو بەشـ ـێكی دی حوكم دا نە، هەواڵە كەی هەمووی ڕا ستە، حوكمەكە شی هەمووی دادە، هەروەهـــا فەرموویەتـــی: ﴿.... وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّهِ قِيلاً﴾[س]. واتـــە: فەرمایشتی كێ لە هی خوا ڕاســتترە؟! كەواتە فەرمایشـ ـتی خوا دەبێ ڕاست بێ، چونكە خوای بێهاوتا لە هەموو ســ ـیفەتێك دا لە ئەوپـــــەڕی تەواوی دایە: (ولله المثل الأعلى ...)[ش]. واتـــە: خوا خاوەنی ســــیفەتی هەرە بەرزە، هەروەها دروستكراوەكانی خواش نارێكی و كەمو كووڕی یان تێدا نیـــــــــــــــــــە، وەك فەرموویەتی: ﴿مَّا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ

---

(تن) مەبەست ئەو زانیارییەیە كە پێنج هەستەكان و عەقڵ و ئەزموون بەرهەمی دێنن .
(يـ) ( الانعام 115) .
(س) ( النساء 122) .
(ش) ( النحل 60) .

تَرَى مِن فُطُورٍ﴾ (تر)، واتە: لە دروستکراوەکانی خوادا نارێکی نابینی، جار لە دوای جار سەرنج بدەو جوان سەیر بکە بزانە هیچ نارێکی دەبینی...!! خوای بێ نیاز و جێی نیاز، خەڵکی بێمنەت کردوەو دەفەرموێ جوان جوان تەماشای دروستکراوەکانم و بەرهەم و شوێنەواری سیفەتەکانم بکەن، بزانن نارێکییەکی بچووکیش دەبینن!! کەس هەیە بڵێ نەدەبوایە ئەو شتە وابوایە، هیچ زانایەك هەیە بڵێ: نەدەبوو خۆر قەبارەکەی ئەوەندە بێ، یان زەوی نەدەبوو بەو خێراییە بەدەوری خۆیدا بخولێتەوە، یان بە دەوری خۆردا بسوورێتەوە، یان مانگ نەدەبوو ئەوەندە لە زەوی دوور بێ، یان نزیك بێ، یان بڵێ: چینەکانی هەوا نەدەبوو ئەوەندە ئەستوور بن و دەبووایە تەنکتر بوونایەو ... هتد، نەخێر بەڵکو زانست و زانیاری دەڵێ: دەبوو هەموو شێك هەر ئاوا وەك خوا دروستی کردوە هەروا بووایە، بەڵکو هەر شتێك وەك حاڵەتی ئێستای نەبووایە هەرگیز ژیان و گوزەران نەدەگونجا! کەواتە: لە دروستکراوەکانی خوادا هیچ نارێکی و بێسەروبەری یەك نیە.

کەواتە مادام فەرمایشتی خوا هەمووی ڕاستەو دروستکراوی خواش هەمووی ڕێکوپێکەو دووشتی ڕاست و ڕێکوپێکیش پێکەوە دژ ناوەستن و قسەی ڕاست لەگەڵ کردەوەی ڕاست هەرگیز پێکەوە دژ ناوەستن و تێکناگیرێن، کەواتە: بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ زانیاری هەڵهێنجراو لە

(تر) (الملك 3 ‌ 4).

دروستکراوی ڕێکوپێکی خواو (وحي)و دینی سەرچاوەگرتوو لە زانیاری و حیکمەتی بێ سنووری خوا تێك بگیرێن.

حەوتەم: بەڵگەی ئیسپاتی ڕاستیی (وحي):

ئێمە چۆن بزانین کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئەوەی فەرموویانە خوای پەروەردگار پێی فەرموون و (وحي)و فەرمایشتی ئەوە؟! بە واتایەکی دی: چۆن پێغەمبەرانی ڕاستگۆ لەگەڵ لاف لێدەرانی پێغەمبەرایەتی درۆزن و، (نَبِيٍّ) لەگەڵ (مُتَنَبِّيٍّ) لە یەك جیا بکەینەوە؟!

دیارە لێرەدا ئێمە تەنیا قسە لە پێغەمبەری خۆمان (محمد) ﷺ دەکەین، کە کۆتایی پێغەمبەرانەو سەرجەم پێغەمبەرانی پێش خۆیشی بەڕاست دەزانێ، وە ئەگەر ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری کۆتایی کرا دیارە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی هەموویان دەکرێ، جا ئێمە لێرەدا هەر بە کورتی چوار بەڵگەی سەرەکی باس دەکەین لە سەر ئەوە کە (وحي)یەك کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی هاتوە ڕێك و ڕاست و تەواوەو لە خواوەیەو موحەمەدیش ﷺ پێغەمبەری خوایە.

یەکەم: پێغەمبەر محمد ﷺ هەر بۆ خۆی بەڵگەیە لە سەر ڕاستی و تەواویی خۆی و بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ڕاستە پێغەمبەری خوایەو ڕاستە خوا (وحي) بۆ ناردوە چۆن؟! (مەولەوی) شاعیری کورد لەو بارەوە جوان دەڵێ:

## هەتیو وە ئەدەو، ئومـــی عەللامە
## لەمە موعجیزەتر، موعجیزە کامە

هەڵبەتە ئەوە دیارە کە پێغەمبەر ﷺ هەر لە سکی دایکیدا بووە (عبدالله)ی باوکی مردووەو لە تەمەنی شەش ساڵیشدا (ئامینە)ی دایکی مردوە، پاشان (عبدالمطلب)ی باپیرەشی کە مرد تەمەنی هەشت ساڵان بووە و دوایی چۆتە لای (أبوطالب)ی مامی و ئەو سەرپەرشتی کردوە، کەواتە بە هەتیوی و بێ باب گەورە بووە، دیسان پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوار بووە، وە زۆربەی ئەو خەڵکەش کە لە نێویان دا بووە نەخوێندەوار بوون وەك خوا فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾[تر]، وە پێغەمبەر ﷺ وەك عائیشە ڕەزای خوای لە سەر بێ لێی دەگێڕێتەوە کە (بخاری) هێناویەتی: کاتێك (جبریل) لە ئەشکەوتی (حیراء)دا بەخۆیەوە دەیگووشێ و دەڵێ: بخوێنە (إقرأ) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوێندەوار نیم (ما أنا بقارئ) کەواتە نەخوێندەوار بووە، هەروەها خوای زاناو شارەزاش دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾[یر]، واتە: ئەی موحەممەد! تۆ نە لە پێش قورئاندا کتێبێکت خوێندۆتەوەو نە هیچ شتێکت بە دەستی ڕاستت نووسیوە، جا ئایا حیکمەتی چیە کە

---

[تر] ( الجمعة 2 ) .

[یر] ( العنکبوت 48 ) .

پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوار بووە؟! خوا دە فەرموێ ئەگەر خوێنەرو نووسەر بووایەی ئەوانەی کە ئەهلی بەتاڵن دەکەوتنە گومانەوە.

بۆیە خوا پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری نارد، تا هیچ کەسێك گومانی بۆ ئەوە نەچێ و پێی وا بێ کە ئەو کابرایە هەر خۆی فەیلەسووف و زانا و بلیمەت بووە، وە بۆیە لە نێو گەلێکی نەخوێندەواردا ناردی، نەك لە نێو ڕۆم و فارس و یۆنانییەکان دا، تا هیچ کەس نەڵێ: ڕۆم و فارس و یۆنانییەکان هەر خۆیان خاوەنی فەلسەفەو حیکمەت بوون و ئەو کابرایەش هەر لە ئەوان شتێك فێر بووە!.

ئنجا لە ڕووی ڕەوشت (أخلاق)وە بە مانای فراوانی وشەی ڕەوشت، ئەگەر سەیری کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ بکرێ، تەماشا دەکەی ئەو موحەممەدەی بێ باب گەورە بووە ﷺ لە هەموو ڕەوشت و ئاکارێکی بەرزو پەسندا لە لوتکەی هەرەبەرز دایەو هیچ کەس ناتوانێ هەر لێشی نزیك بێتەوە چ جای بیگاتێ! جا بێگومان کە کەسێك هەتیوو، نەخوێندەوار بێ و لە نێو گەلێکی نەخوێندەوار دا بێ و کە سێکی ئاواشی لێ دەربچێ، بە ڕاستی ئەوە خۆی گەورەترین موعجیزەیە، بەڵێ کەسایەتی (محمد) ﷺ نەك هەر زانایانی مسوڵمان بەڵکو خەڵکانی دیش لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا زۆر سەرسامن بە کەسایەتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ و یەکێك لەو زانا ڕۆژئاواییانە بە ناوی (مایکل هارت)

لە کتێبی (سەد کەسە یەکەمەکان)[تر]. کە ژیانی (100) کە سی نووسیوە، هەرچەند خۆشی نەصرانییە بەڵام هاتوە پێغەمبەری خوا (محمد) ﷺ ی بە یەکەم کەس ژماردوە، کە پێی وایە ئەو (100) سەد کەسە بە درێژایی مێژوو لە هەموو کەس زیاتر کاریگەرییان بووە لەسەر ڕەوتی مێژووی ئینسان و لەسەر فیکرو فەرهەنگی ئینسان و لەسەر ژیانی ئینسان، وە بۆ خۆی دەڵێ: کە (محمد)م بە یەکەم کەس و لە پلەی یەکەمدا هێناوە، بەڵام (عیسی)م چەند پلە یەك لە خوارتر هێناوەو ڕەنگە نەصرانییەکان گلەییم لێبکەن، بەڵام بڵێم چی واقیعی مێژوو و دونیا وایەو وا نیشان دەدا کە (محمد) ﷺ لە هەموو ئینسانەکان زیاتر ڕۆڵی ئیجابی لە ژیانی بەشەردا گێڕاوەو کاریگەریی لەسەر مرۆڤایەتی بووە!!.

دووەم: موعجیزەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە یەکێك لە موعجیزەکانی بریتی بووە لە لەتکردنی مانگ (شق القمر) وەك خوا دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾[یر]. ئەم ئایەتە ئاماژەی پێکردوەو (بخاري ومسلم) یش هێناویانە کە شەوێك هەندێك لە هاوبەش دانەر(مشرك)ەکان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێن بەڵگەت چیە کە تۆ پێغەمبەری خوای؟! ئیدی سەرەنجام دوای

---

(تر) ئەو کتێبە بە عەرەبی تەرجەمە کراوە لە ئینگلیزی یەوە بە ناوونیشانی: (المائة الأوائل).

(یر) (القمر 1).

وتوویژو مشتومڕ کافرەکان پێی دەڵێن: مانگمان بۆ لەت بکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)یش ئاماژە بۆ مانگ دەکات و یەکسەر لەت دەبێ دوایی یەکدی دەگرێتەوە، دیارە موعجیزەکانی پێغەمبەرمان ﷺ یەکجار زۆرن و بە دەیانن کە لە سەرچاوە ڕاست (صحیح)ەکانی سوننەت دا هاتوون، بۆ نموونە: (1) ئاو لە نێو پەنجەکانی هەڵقوڵیوە بە شێوەیەك کە تێ نوێتی لە شکرێکی زۆری هاوەڵانی شکاندوەو بەشی دەست نوێژو خواردنەوەی وڵاخەکانیشیان بووەو ئەوە چەند جارێك دووبارە بۆتەوە، (2) خواردنی کەم بەشی دوو یان سێ کەس پێغەمبەر ﷺ دوعای لێکردوەو بەشی چەند سەد کەسی کردوەو ئەمەش چەند جارێك دووبارە بۆتەوە، (3) ناڵە ناڵکردنی ئەو دارخورما وشك بووەی کە پێغەمبەر وتاری لە سەری خوێندۆتەوە، پاشان کە مینبەری بۆ دروستکراوە بنکە دارخورمایەکەی بەجێهێشتوەو ئەویش دەستی بە گریان و ناڵە کردوە کە هەموو هاوەڵانی مزگەوت گوێیان لێبووە! (4) دوعای بۆ بارینی باران کردوەو یەکسەر دوعای گیرا بووەو هەور هاتوەو باران باریوە، ئەمەش چەند جارێك دووبارە بۆتەوە. (5) چەندین جارو بۆ چەندان کەس دوعای شیفای نەخۆشی یان برینداریی کردوەو دەمودەست ئەو کەسە شیفای بۆ هاتوە، وە زۆر زۆر موعجیزەی دیکە، هەرچەندە گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەری کۆتایی قورئانە وەك دوایی باسی دەکەین.

سێیەم: ئایینەکەی و ئەو گۆڕانکارییە پڕ بەرەکەتە هەمە لایەنەی کە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هێنایە کایە: لە لای هەموو لایەك ئاشکرایە کە: لە نێو مرۆڤایەتیدا زوڵم و ستەم قڕی و پڕی، چینایەتی، ئەفسانە پەرستی، بت پەرستی، دواکەوتوویی، نەریت و خووی زۆر نەفامانەو نەزانانە... هتد دنیای تەنی بوو و بە شەر خەریك بوو فزەی لێ ببڕێ، لە هەموو سەر زەمیندا بە گشتی و بە تایبەتی لە نێو عەرەبدا، کەچی دوایی عەرەب کە مسوڵمان بوون، بوون بە سەرقافڵەی مرۆڤایەتی، بۆ زانیاری و مەعریفەت، بۆ خووڕەو شت، بۆ دادگەریی، بۆ خوا بە یەکگرتن، بۆ برایەتی و سۆزو بەزەیی و هاو کاری یەکتری و بۆ هەموو شتێکی باش، بە لێ ئەو گۆڕانکارییەی کە ئیسلام بەسەر مرۆڤا یەتی داهێ نا بەگ شتی و عەرەب بە تایبەتی، ناگونجێ بگوترێ: ئەو ئیسلامەی کە موحەممەد ﷺ ئەو شۆڕش و گۆڕانکارییە مەزنەی پێ کرد، زادەو هەڵقوڵاوی بیروزەینی خۆی بووە!

چوارەم: قورئان گەورەترین موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتی (محمد)ە ﷺ و تاکە موعجیزەیەکیشە کە تەحەددای پێکردوە بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی خۆی، پێغەمبەر ﷺ لەو بارەیەوە فەرمووـیەتی: (ما من نبـّي الا أُعطي من الآيات ما مِثْلُهُ امن عليه البشر وانما كان الذي اوتيته وحيا اوحاه الله الي فارجوا ان أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة) رواه مسلم.

واتە: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە مەگەر لە لایەن خواوە بەڵگەو موعجیزەیەکی وای پێدراوە کە خەڵك بە هۆیەوە بزانن کە پێغەمبەری خوایەو ئیمانی پێ بێنن، بەڵام ئەوەی کە بە من بەخشراوە (وحي)ێ کە خوا بۆی ناردووم بۆیە ئومێد دەکەم کە لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتربن. (چونکە موعجیزەکەی قورئانەو هەتا کۆتایی دونیا هەر دەمێنێ).

## ئنجا ئایا قورئان لە هەموو ڕووێکەوە موعجیزەیە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ قورئان لە هەموو ڕووێکەوە موعجیزەیە.

لە ڕووی مەعنەوی، لە ڕووی عەقڵی، لە ڕووی زانیاری، لە ڕووی فیطریی، لە ڕووی یاسایی، لە ڕووی مێژوویی، لە ڕووی ڕەوانبێژی، لە ڕووی ئەدەبی، لە ڕووی هەواڵدان بە غەیب و نادیارەوە و... هتد.

مەبەست لە موعجیزەبوونی قورئان لە ڕووی مەعنەوییەوە ئەو کاریگەرییە ڕووحییە نا ئاساییەیە کە قورئان هەیەتی لە سەر دڵان و تەنانەت دڵی کافرانیش وەك لە سیرەی پێغەمبەر ﷺ و مێژووی ئیسلام دا هاتوە کە چەندان جار ڕێکەوتوە کابرایەکی نامسوڵمان لە ئەنجامی گوێ بیستبوونی بۆ چەند ئایەتێکی قورئان ڕا چڵەکیوەو مسوڵمان بووە، یەکێك لەوانە (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ.

وە مەبەست لە موعجیزەبوونی قورئان لە ڕووی عەقڵییەوە ئەوەیە کە هیچ عەقڵێکی ساغ نەیتوانیوەو ناشتوانێ ڕەخنە لە ڕاستیەکی

قورئان و حوکمێکی بگرێ و بڵــێ: دەبووایە فلان شت ئاوابووا ـیە ـیان ئاوانەبووایە.

وە مەبەست لە موعجیزەبوونی قورئان لە ڕووی زانیارییەوە ئەوە ـیە کە قورئان چەندان ئاماژەی تێدایە بۆ زۆر ڕاستی زانیاری ـلە ـهەموو بوارو لقەکانی زانستدا کە زانایان تازە بە تازەو ـچەندان ـسەدە ـپاش هاتنە خوارەوەی قورئان ئەو ڕاستییانەیان بۆ کەشف بوون. هەڵبەتە هەر بۆیەشە کە خوای زاناو شارەزا ڕایگەیاندوە کە هەتا ز ـیاتر ـپەردە ـبۆ ئینسان هەڵماڵــێ لە ـسەر نهێنـ ـیەکانی درو ـستکراوەکانی ـخۆی ـلە ئاسۆیەکانی بوونەوەرو دەوروبەرو لە دەروونی خۆشیاندا ز ـیاترو ـچاکتر ڕاســــتێتیو حەقانیەتی قورئانیان بۆ دەردەکەوێ وەك فەرموو ـیەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾[ت]. وە موعجیزەبوونی قورئان لە ڕووی (فیطري)یەوە ئەوەیە کە هەرچی غەریزەو داخوازی و پاڵنەری سرو ـشتی ساغ هەیە لە کیانی ئینساندا چ پەیوەندییان ـبە لا ـیەنی ڕوو ـحی و نەفسییەوە هەبێ چ جەستەیی، وە چ فیکریی و چ عاتیفی، وە چ تاکی و چ خێزانی و چ کۆمەڵایەتی ... هتد، قورـئان دا ـنی ـبە ـهەموو ـئەو داخوازی و غەریزەو پاڵنەرانەدا هێناوەو بە شێوەیەکی گ ـشتی ڕێ ـبازو شێوازی تێرکردن (اشباع)یشیانی دیاری کردوە.

---

(ت) ( فصلت 53 ).

لە ڕووی یاساییشەوە قورئان بە دانپێداهێنانی پسپۆڕانی بواری یاساو دەستوور ڕیشەو بناغەی سەرجەم ئەو ڕێساو یاسایانەی تێدایە کە بۆ ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی تاك وخێزان و کۆمەڵگاو دەوڵەت پێویستن لە هەموو بوارەکاندا، جا چ بە ڕوونی و ڕاشکاویی باس کرابن چ بە ئاماژەو هێما لە لابەلای باس و بابەتی دیکەدا بە تایبەتی بە سەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و لەگەڵ میللەتەکانیان.

لە ڕووی مێژوویشەوە قورئان لایەنی ئیعجازەکەی زۆر درەو شاوەیە چونکە ژمارەیەکی یەکجار زۆر ڕاستی مێژوویی تێدا بەیان کراون کە پسپۆڕانی مێژوو و شوێنەوارناسان (علماء الاثار)یان سەرسام کردوە، چ دەربارەی تۆفانی (نووح) (علیه السلام) چ گەلی (لوط) (علیه السلام)و ئەوەی بەسەریان هاتوە، چ (ئیبراهیم) (علیه السلام)و سەفەرو بەسەرهاتەکانی و چ گەلی جوولەکەو فیرعەونەکانی میصرو ... هتد.

وە لە ڕووی ڕەوانبێژیی (بلاغة)و ئەدەبی یەوە کە بەداخەوە هەندێك لە زانایانی پێشین وایان زانیوە تاکە لایەنی ئیعجازی قورئانە، موعجیزەبوونی قورئان هەر زۆر ئاشکرایەو ئەم لایەنەی ئیعجازی قورئان پشکی شێری بەر کەوتوە لە کتێب و بەرهەمی زانایان و پێشەوایانی ئیسلامدا کە لە بارەی ئیعجازی قورئانەوە دواون.

وە لە کۆتاییدا دەربارەی هەواڵدان بۆ شتی نادیاری دا هاتوو خوای پەنهان بین چەندان هەواڵی ئایندەیی[١١](مستقبلي) داوەو چەندین موژدەی بە ئیمانداران داون کە هەموویان هاتوونە دی[١٢].

کۆتایی ئەم باسەشمان بەم دوو ئایەتە دێنین کە خوای گەورە تێیدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾[١٣]، واتە: وە ئەگەر گومانتان لەوەدا هەیە کە ئەوەی بۆ سەر بەندەی خۆمان ناردوومانە لە خواوە بۆی نەهاتوە، دە ئێوەش قورئانێکی ئاوا بێنن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ( لە خواوە نەهاتووە)، وە هەرچی یارمەتی دەریش هەیە لە ئینسان و جنۆکە جگە لە خوا هەمووی بانگ بکەن بۆ هاوکاری، دوایی دەفەرموێ: ئەگەر نەتانکرد، دڵنیاش بن کە ناتوانن بیکەن، ئەوە ( بەهۆی ئیمان هێنانەوە بە قورئان) خۆتان لە ئاگرێك بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی خەڵك و بەردەو بۆ کافران ئامادەکراوە.

---

(1) یەکێك لە هەواڵە ئایندەییەکان، تێکشکانی کافرەکانی قورەیشە لە جەنگ دا ﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾ (القمر ) یەکی دیکەشیان سەرکەوتنی ڕۆم بوو بەسەر فارسدا: ﴿ الم ، غُلِبَتِ الرُّومُ ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ، فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴾ (الروم )

(١٢) بۆ نمونە موژدەدانی خوا بە مسوڵمانان کە دەیانکاتە خەلیفەو حوکمڕان و میراتگری دەوڵەتانی کافر، کە ئەو بەڵێن و موژدەیە لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا هاتەدی: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ﴾ (النور ).

() ( البقرة 23  24).

بەڵێ هەر ئەم دوو ئایەتە گەورەترین موعجیزەن لە سەر ئەوە کە قورئان وەحی خوایەو لە خواوەیە، چونکە خوای زاڵ و کار بەجێ بە ڕاشکاویی تەحەددا دەکات و پاشان هەر خۆشی ئەنجامی تەحەددایە کە ڕادەگەیەنێ!! کەواتە کێ دەتوانێ جگە لە خوا بڵێ: ئەگەر نەتانتوانی وە ناشتوانن بە دڵنیاییەوە!!

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الا انت أستغفرك وأتوب اليك.

# دەرسی پێنجەم:

## خورپەو خەون و ئەندازەی متمانە پێکرانیان بۆ وەدەستهێنانی زانیاری و زانست.





الحمد لله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم وبارك على سيدنا محمد خاتم النبيين.

بەڕێزان: لەم دەرسی پێنجەمەماندا کە دەرسی کۆتاییە لە بەندی یەکەم باسی خورپەوخەون دەکەین:

ئایا خورپەوخەون تا چ ئەندازەیەك جێگەی متمانەو باوەڕن لە ئیسلامدا بۆ وەرگرتن و گەیشتن بە زانیاری؟! جا ئێمە بە پشتیوانی خوا لە سێ خاڵ دا ئەو بابەتە دەتوێژینەوە:

**خـاڵی یەکـەم:**

**پێناسەی چەند وشەیەك کە ماناکەیان لە یەك نزیکە، بەڵام بێژە (لفظ)ە کەیان لە یەك جیایە:**

1- وشەی (الهام) کە زۆرجار لە زمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێ، کە وشەی (خورپە) گونجاوە بۆ واتاو مەبەستەکەی، (خورپە)ش واتە: شتێك کە دەچێتە نێو دڵەوە، جا من لەم باسەدا هەر وشەی (خورپە) بەکاردێنم. وە وشەی (إلهام) لە زمانی عەرەبیدا ئاوا پێناسە کراوە: (الإلهام: التلقين) واتە (إلهام) یانی فێرکردن، دەگوترێ: (ألهمه

الله الخیر أي: لَقَّنه إیاه) واتە: خوا خێرو چاكەی فێر بكات، بەڵام لە زاراوی ئەهلی (تصوف)دا دەڵێ: (هو النَّفْث في الرَّوْع والأيقاع في القلب من العلم الغير القائم على الاستدلال والنظر)[٣٥]، واتە: بریتیە لە خرانە نێو دڵ و مێشك، زانیاری یەك كە بە هۆی بەڵگە هێنانەوەو بەهۆی سەرنج دانەوە نیە، بەڵكو یەكسەر ئەو زانیارییە دێتە نێو دڵەوە.

2- وشەی (الحَدْس) لە ئەسڵی زماندا بە مانای (الظن) و (التخمین) دێت واتە: گومان و دانان، مەزەندەكردن، لە زاراوی زانایانیشدا ئاوا پێناسەكراوە: (الحدس: سرعة انتقال الذهن من المبادئ الى المطالب)[٣٦]. واتە: حەدس بریتیە لەوە كە مێشكی ئینسان بە خێرایی بگاتە سەر مەبەست بێ ئەوەی زۆر بیری لێبكاتەوە.

3- وشەی (الكشف) ئەوەیش هەر (الجرجاني) ئاوای پێناسەكردوە دەڵێ: (هو الإطّلاع على ما وراء الحجاب من المعاني الغيبية والامور الحقيقية وجوداً أو شهوداً)[٣٧]، واتە: كەشف بریتیە لە ئاگاداربوون و شارەزابوون لەو شتانەی كە لە پشت پەردەی ئەم دونیا مادديیەوە هەن، لە مەبەستە نادیارەكان و شتە ڕاستەقینەكان چ وەك بینین چ وەك پەی پێ بردن.

---

(٣٥) معجم مصطلحات الصوفية، ل 23.

(٣٦) التعريفات/ الجرجاني، ل 83.

(٣٧) هەمان سەرچاوە، ل .

4- وشەی (الذوق) لە زاراوی ئەهلی (تصوف)و (تزكية)و (عرفان)دا دەڵێ: (هو نور عرفاني يَقْذِفُهُ الحق بتجليِّه في قلوب أوليائه يُفرِّقون به بين الحق والباطل من غير أن ينقلوا ذلك من كتاب)[تا]، واته: (ذوق) بریتیە لە رووناكییەكی دەروونی كە خوای حەق بەهۆی درەوشانەوەی خۆیەوە لە دڵی بەندە دۆستەكانی خۆی دا پەیدای دەكات كە (ڕاست)و (ناڕاست)ی پێ لە یەك جیادەكەنەوە بێ ئەوەی لە كتێبێكدا نەقڵی بكەن (یەكسەر وەك خورپە دەچێتە نێو دڵیان).

5- وشەی (البصيرة) كە لە قورئانیشدا بەكارهاتوە، ئاوا پێناسە كراوە: (البصيرة: هي الملكة التي ترى حقائق الاشياء و بواطنها كما يرى البصر ظواهر الاشياء المادية، وهي مورد الالهام و موطن الاشراق و مصدر الكشف والذوق)[یب]. واتە: (بصيرة) بریتیە لە سیفەتێكی چەسپاو لە ئینساندا كە ئینسان بە هۆی ئەوەوە ماهیەتی شتەكان و دیوی پەنهانیان دەبینێ وەك چۆن چاو ڕواڵەت و بەر چاوی شتە ماددییەكان دەبینێ، وە (بصيرة) بریتیە لە شوێنی خورپە بۆ هاتن و شوێنی ڕۆشنایی بۆ هاتن، وە شوێنی شت بۆ كەشف و ئاشكرابوون و تام كردن.

6- وشەی (العلــم اللَّدُنيّ) كە خوای بەخشەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا

(تا) هەمان سەرچاوە، ل 17.

(یب) معجم مصطلحات الصوفية، ل 23.

عِلْمًا﴾[٦٣]. واتە: (مووساو هاوەڵەکەی کە ڕۆیشتن بۆ ئەو شوێنەی کە خوای زانا بۆیانی دیاری کردبوو یەکێك لە بەندەکانی ئێمەیان بینی کە بەزەیی خۆمانمان پێ بەخشیبوو، وە لە لایەنی خۆمانەوە زانیارییەکی تایبەتمان فێرکردبوو، کەواتە (العلم اللدني)یانی ئەو زانیارییە تایبەتەی کە خوا بۆ خۆی دەیدات و بە شێوەیەکی‌تایبەتی و نائاسایی فێری هەندێك لە بەندەکانی خۆی دەکات.

7- وشەی (الرؤيا) واتە: خەون، ئەمەش دیارە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری لەسەرە (علیه الصلاة والسلام) یەکێك لەو فەرموودانە ئەمەیە: ( الرؤيا الحسنة من الرجل الصالح جزء من ستة وأربعين جزءاً من النبوة)[٦٤]، واتە: خەونی باش لە پیاوی باشەوە بەشێکە لە (46) چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی، هەروەها فەرمووپەتی: (لم تبق من مُبَشِّرات النبوة الا الرؤيا الصالحة)[٦٥]، واتە: لە موژدە پێدەرانی پێغەمبەرایەتی تەنیا خەونی چاك ماوە.

لێرەدا تێگەیشتین کە ئەم وشانە تەنیا بێژە (لفظ)ەکانیان لە یەك جیایە، ئەگەرنا لە ڕووی ماناو مەبەستەوە هەریەکن، ئنجا کورتەی ئەوە کە زانایان بەم وشانە پێناسەیان کردوە، ئەوەیە کە ئینسان زانیارییەکی بچێتە نێو دڵ بەبێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوەو بەڵگەی بۆ

(٦٣) ( الكهف 65 ).
(٦٤) رواه البخاري .
(٦٥) رواه البخاري .

بهێنێتەوە، یەك سەر وەك خورپەیەك بچێتە نێو دڵەوە، وەك گوتیـ شمان بە کوردیش بە زۆری هەر وشەی ئیلهام بەکار دەهێنرێت.

## خـاڵی دووەم:

## بەڵگەی ڕاست بوونی زانیاری وەدەست هێنراو لە ڕێگای خورپەو خەونەوە

دیارە هەموو ئەو وشانەی دی کە و شەی خور پە (هاتنە نێو دڵ) دەیانگرێتەوە، هەموویان لە حاڵەتی بێداری دان، بەڵام خەون لە حاڵەتی خەوتن و نووستن دایە، ئەوە جیاوازی نێوان خورپەو خەونە.

ئنجا بۆ زانیاریتان زانایان هەموویان لەوەدا یەکدەنگن کە بێگومان لە ڕێی خەون و لە ڕێی خورپەوە هەندێك زانیاری بۆ ئینسان پەیدا دەبێت، وە ئینسان دەگاتە ئەوەی کە هەندێك شتی بۆ کەشف بێ کە لە ڕێگەی پێنج هەستەکان و عەقڵەوە بۆی کەشف نابێ، یاخود لە ڕێگەی (وحي)یەوە خوای پەروەردگار ڕوونی نەکردۆتەوە، بەڵگەشیان ئەم شتانەی خوارەوەن: سەرەتا دەربارەی خورپە (الهام):

1- خوای بێهـــاوتا دەفەرموێ: ﴿ إِن تَتَّقُواْ اللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَاناً﴾[ت]، واتە ئەگەر پارێزکاری بکەن لە خوا، خوا (فرقان)تان

(ت) ( الانفال 29).

پێ دەبەخشێ، تو ێژەرەوانی قور ئان لە پێنا سەی (فر قان)دا گوتوویانە: (الفرقان آلة يفرق بها بين الحق والباطل) واتە: فر قان ئامرازێکە (حاڵەتێکەو دڵ ڕۆشنی یەکە) کە ئینسان بە هۆ یەوە حەق و ناحەقی بۆ لەیەك جیادەبێتەوە.

2- پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ( لقد كان في من قبلكم مُحدَّثون فأنْ يكن في امتي أحدٌ فأنه عمر)(تر). وا تە: لە پێش ئێوەدا کەسانێك هەبوون کە ق سە لە گەڵ دڵ یان کراوەو زانیارییان خراوەتە نێو دڵ، جا ئەگەر لە ئو مەتی م ندا کەس هەبێت ئەوە (عمر)ە، واتە: (عمر) پێشەوای ئەو کە سانەیە کە خورپە (إلهام)یان دەخرێتە نێو دڵ، (عمر)یش خوا لێی ڕازی بێ، ئەوە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە لە (سيرة)و مێژوودا کە چەندان جار شتی لەو بابەتەی لێبینراوەو خورپە (إلهام)ی هاتۆ تە نێو دڵەوە، چەندین جار پێشنیارو ڕای پەسندی دەربڕ یوە کە دوا یی قورئانی لەسەر هاتوە، وەك مەسەلەی گیراوەکانی جەنگی ( بەدر) کە خوای کاربەجێ پشتگیری ڕای (عمر)ی کرد، یان دەر بارەی نوێژکردن لە مەقامی (إبراهيم)دا سەلامی خوای لەسەر بێ، کە (عمر) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی لەو جێگا یەدا نو ێژ نەکەین، ئەوەبوو ئایەت هاتە خوار: ﴿وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ

(تر) البخاري ومسلم، عن ابي هريرة و عائيشة.

**مُصَلًّى﴾**[]. یان دەر بارەی خرا نە پ شت پەردەی خێزا نەكانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) كە ئەویش ئا یەتی ژ مارە (53)ی سورەتی (الاحزاب) دەربارەی ها تەخوارەوە، وە هەروەها چەند شتێكی دیكەش.

3- وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اتقوا فراسة المؤمن فا نە ینـ ظر بنور الله) وقرأ ﴿ **إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ** ﴾[]، وا تە: لە (فراسة)ی بڕوادار بترسێن چونكە بە نووری خوا تەماشا دەكات، پاشان پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە كە دەفەرمویَ: لە بەسەرهاتی ئوممەتە پێشینەكاندا چەند نیشانە هەن بۆ كە سانێك كە (توسم) یان هەبێت، واتە: (فراسة) و دڵ ڕۆشنی، (فرا سة)ش پێناسەكەی بریتیە لەوە كە ئینسان بە هۆی ڕواڵە تەوە ئا گاداری پەنهانەكەشی بێت.

4- لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتوە كە (أبوبكر) خوا لێی ڕازی بێ لە نەخۆشی سەرمەرگیدا بە عائیشەی كچی فەرموو: (ئەوەی لە سكی دایكت دایە كچە، دیارە خێزانی (أبوبكر) دووگ یان بووەو هێشتا ئەو منداڵە لە دایك نەبووبوو، كە ئەبوو بەكر فەرمووی: كچە، ئەوە لە چەند سەرچاوەیەكدا هاتوە[].

---

() ( البقـرة 125 ).

() رواه الترمذي، والسيوطي، وابن جرير، والبخاري في الأدب، وابن سني، وابونعيم، وابن مردويه ، والخطيب .

() مجموعة الفتاوى/ ابن تيميه/ بەرگی 11 لاپەڕە، 318.

5- بەڵگەیەکی دی بەسەرهاتەکەی (عمر)ە کە خوا لێی ڕازی بێ لە مزگەوتی مەدینە وتاری دەخوێندەوەو لەسەر مینبەر بانگی کردو گوتی: (یا ساریة، الجبل، الجبل) کە (ساریة) فەرماندەی سوپایەکی ئیسلامی بوو لە ناوچەی (نەهاوەند) لە وڵاتی (فارس) وە (ساریة) لەوێوە دەنگەکەی (عمر)ی بیست و لە نەخشە و پلانی دوژمنەکانی وریا بۆوە کە بە تەما بوون پشتی چیاکەیان لێ بگرن، دیارە بەسەرهاتەکە ڕوونە و لە سەرچاوەی زۆردا هاتوە[تر]..

6- بەڵگەیەکی دی ئەوەیە کە پیاوێك هاتە لای (عثمان) خوا لێی ڕازی بێ (عثمان) پێی گوت بۆچی ڕوانینی حەرام (نظر) دەکەی؟! کابرا گوتی: ئایا لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ (وحي) هاتوە؟! گوتی: نەخێر (ولکن فراسة صادقة) بەڵکو ئەوە (فراسة) یەکی ڕاستە[یر].

جا ئەمانە چەند بەڵگەیەك بوون و بەڵگەی دیکەش زۆرن لەسەر ئەوە کە دەگونجێ خورپە بچێتە دڵی ئینسانەوەو زانیاری یەکی ڕاست و دروست وەربگرێ کە نە بە هۆی پێنج هەستەکانەوەو نە بەهۆی عەقڵ و بەڵگە هێنانەوەو نە لە ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دا ئەو زانیارییە ڕوون کراوەتەوە.

---

(تر) هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەرە .

(یر) احیاء علوم الدین، بەرگی (3) لاپەرە 25.

دەربارەی (خەون) یش، باسمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرمو یەتی: خەون بەشێکە لە (46) چل و شەش بە شی پێغەمبەرا یەتی، وا تە: جۆرێکە لە (وحي) بەڵام هەموو خەونێك نا، وەك دوایی باسی دەکەین.

دەربارەی خەونی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) (ع بدالله) ی كوڕی عباس) خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ گوتوویەتی: (رؤيا الانبياء وحي) واتە: خەونی پێغەمبەران جۆرێکە لە (وحي)، هەروەها لـێیەوە گێڕدراوەتەوە کە دەڵـێ: (و رؤيا الانبياء وحي فأن ها مع صومة من الشيطان باتفاق الامة) [تر]. واتە: ئەوە شتێکە کە یەك دەنگی زانا یانی ئوممەتی لەسەرە کە خەونی پێغەم بەران (ع ليهم ال صلاة وال سلام) (وحي)یە، چونکە پارێزراوە لەوەی کە شەیتان ب چێ لە خەونیش دا شتێکیان پێ نیشان بدات و ئەوەی دەیبینین هەمووی لە خواوەیە.

ئنجا بەڵگە لەسەر ئەوە کە (خەون) جێگای متمانەیە زۆرن، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە سووڕەتی (یوسف) هەمووی باس لە بە سەرهاتی (یوسف) (عليه السلام) دەکات کە مانالێدانەوە (تعبیر)ی خەونێکی خۆیەتی، دوایی کە خەونەکەشی هاتۆتە دی دەڵـێ: ﴿هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾[ير]، ئنجا لە ن یو بەندیخانەکە شدا سـێ خەون بینراون کە لە سووڕەتەکەدا بە درێژی باس کراون، خەونی پاد شا

---

(تر) تفسير ال قرطبي، بەرگی(8) لا پەڕە 102، وە هەروەها( مدارج ال سالكين) ا بن ال قيم الجوزی، بەرگی(1)لاپەڕە 51.

(ير) يوسف، 100.

(ملك)و خەونی دوو هاوەڵەکەی نێو بەندیخانەکە، دیارە خەونەکانیش هەموویان ڕاست دەرچوون و هاتوونەتە دی، کەواتە نەك هەر خەونی پێغەمبەران (علیهم السلام) دەنگوباس ڕاست دەرچێ کە بە تەئکید ڕاست دەردەچێ، بەڵکو هی خەڵکی دیش جاری وا هەیە ڕاست دەردەچێ، با موسڵمانیش نەبێ، چونکە گومانی تێدا نیە کە پادشایەکە کافر بووە.

## خاڵی سێیەم:

**ئایا هەم خورپەو شت هاتنە نێو دڵ و هەم خەون، تا چ ئەندازەیەك جێی پشت پێ بەستن و متمانەن؟!**

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: بە سەرنجدان و تێوەڕامانی ئەو بەڵگانە کە لە خاڵی دووەمدا هێنامانن، بە ڕاستی زۆر جوان دەردەکەوێت کە هەم خورپەو هەم خەونیش زانیاری ڕاست و درووستیان لێوە دەستگیر دەبێ، بەڵام بێگومان چ خورپەو چ خەونیش سەرچاوەیەکی گشتی نین. بۆیە لە ڕابردوودا باسێکمان بەم ناونیشانە هەبوو: (پێنج هەستەکان و عەقڵ و وەحی بەگشتی بۆ خەڵکی سەرچاوەو ڕێگای بەدەستهێنانی زانیاریین) جا لەوێ گوتم: دوایی بۆتان باس دەکەم کە بۆچی دەڵێم: (بۆ خەڵکی بەگشتی)، چونکە ئەم

خورپەو خەونە شتی تایبەتن و بۆ هەموو خەڵکی نین، وەك تۆزێکی دی ڕوونی دەکەینەوە.

جا ئێستا با لە چەند بڕگەیەکدا هەڵ سەنگاندنێك بخەینەڕوو لەو بارەوە کە ئایا تا چ ئەندازەیەك خەون و خورپە دەگونجێ پشتیان پێ ببسترێ بۆ وەدەستهێنانی زانیاری؟ جا بە ڕاستی ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، چونکە خەڵکێکی زۆر لەوەدا بەهەڵەدا چوون چ بە باری تێپەڕاندن (افراط)دا و چ بە باری بەزایەدان (تفریط) دا، هەندێك کەس ئەو مەسەلەی خەون وخورپە یەکسەر لە خۆی دەکاتە بەڵگەی شەرعی و، هەندێك کەسیش پێی وایە کە ئەو شتانە هەر ئەسڵیان نیە! کە ئەوە وێڕای ڕاست نەبوونی زۆر خراپیشە لە ڕووی عەقیدەوە، چونکە ئەو هەموو ئایەت و فەرموودەیەی لەسەرە، مەگەر بە عوزری نەزانین ئەگەرنا کەسێك ئینکاری لەوە بکات کە لە ڕێگای خەون و خورپەوە زانیاری بەدەست دێت، لە کوفر نزیکە، چونکە هەم خەونیش و هەم ئیلهامیش ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەری خوایان ﷺ لەسەر هەیە. ئێستاش ئێوەو ئەو حەوت بڕگەیە دەربارەی هەڵسەنگاندنی خورپەو خەون:

1- (هەم خورپەو هەم خەونیش گشتی نین، وەك پێنج هەستەکان و عەقل و (وحي) کە گشتیین بۆ هەموو خەڵك)، بەڵکو خورپەو خەون تا ئەندازەیەکی زۆر تایبەتین و بۆ هەندێك کەسن، بەڵگەشمان ئەوەیە کە خوای زاناوشارەزا دەربارەی ئەو بەندە چاکە کە زانیاری

تایبەتی (العلم اللدني) پێدابوو فەرموویەتی: ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا﴾(تر) واتە بەندەیەك لە بەندەكانی ئێمەیان بینی ئەو (من)ە بۆ (تبعیض)ە ، واتە : هەندێك، بەڵێ هەندێك لە بەندەكانی خوا، خوا زانیاری تایبەتیان پێ دەدات، نەك بە هەموو كەس، دەر بارەی خەونیش، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (الرؤیا الحسنة من الرجل الصالح ...) (یر) واتە خەونی باش لە پیاوی چاكەوە،كەواتە: هەر كەسێك ڕاست بێتەوەو زرەخەونێك ببینێ ، بۆی نیە یەكسەر پشتی پێ ببەستێ، وە مەرجیش نیە ڕاست بێت، چونكە ئەوەتا لە فەرموودەكەدا دوو قەیدی خراونەتە سەر، یەكەم: دەبێ خەونە كە خەونێكی باش بێ، دووەم: دەبێ خاوەنەكەی پیاوی چاك و مسوڵمان بێ، بەڵێ دەگونجێ كابرای كافرو خراپیش خەونەكەی ڕاست دەربچێ، بەڵام بۆی نیە پشتی پێ ببەستێ، چونكە ئینسانی خراپ خۆی لە گوناهان ناپارێزێ، كەواتە ئەو زانیارییەی كە بەهۆی خەون خورپەوە وەدەستی دێنێ مەرج نیە لە خوای بەخشەندەو فریشتەكانەوە بێت، بۆیە نابێ پشتی پێ ببەستێ و متمانەی پێ هەبێ، هەر بۆیەش بە زۆری وایە كە كەسانی خراپ و گوناحبارو لارێی زۆریان بڕوایان بە خەون و خورپە هەر نیە، چونكە كەم واهەیە ڕاست دەر چووبن و هاتبنەدی.

(تر) ( الكهف 65 ).

(یر) ( رواه البخاري ).

(ابن الحجر العسقلاني) پاش هێنانی چەند فەرموودە یەك لەو بارەیەوە دەڵــێ: (فثبت بهذا أن الألهام حق وأنه وحي باطن وا نما حرمه العاصي لاستيلاء وحي الـ شيطان علـ يه) [ت] وا تە: بە مە ئیسپات بوو کە خورپە ڕاست و حە قەو جۆرێ کە لە (و حي)ی دەروونی و پەنهان و بابای گوناهکاریش بە هۆی زاڵبوونی خوتخوتەی شەیتانی بەسەریدا لێی بێبەش کراوە.

2- ( هیچ کەس بۆی نیە ئەو زانیارییەی کە لە ڕێی خورپەو خەو نەوە دەستگیر دەبێ وەك شەرع یان شتێکی بەرزتر لە شەرع، یان وەك شتێکی سەربەخۆ و جیا لە شەرع دایبنێ) کە ئەهلی تەصەووف بە زۆری لێرەدا تووشی هەڵەبوون، چونکە دەبێ ئەو زانیاری یە لە بەر ڕۆشنایی و ڕێنمایی شەرع دا سوودی لــێببینرێ .

ئنجا ڕابەرانی سەرڕاست و شایستەی بواری تەزکیەش هەر ئەوەیان گوتوە کە باسمان کرد بۆ نموو نە یەکێك لەوا نە: شێخ (جنید )ی بەغدادیە کە (ابن تيمية) ڕەحمەتی خوایان لــێ بێ لە کتێبەکانیدا قسەکانی بەنموونە دێنێتەوە، جا شێخ جونەید دە ڵێ : (ئەگەر یەکێکتان بینی بەباڵان فڕی هەتا دوو بەڵگەو شاهید لە قورئان و سوننەت لە سەر فڕینە کەی نەهێنێ تەوە بڕوای پێ مەکەن)، یەکی دیکە لەوانە (ابو سليمان الداراني)ە کە ئەویش

(ت) فتح الباری / بەرگی -14- لاپەڕە 417.

هەر (ابن تيمية) قسەکانی بەنموونە دێنێتەوەو یەکێك بووە لە پیاوانی مەیدانی تەزکیەی نەفس دەڵێ: (قد تقع في قلبي نكتة من نكت القوم فلا اقبلها الا بشاهدي عدل: الكتاب والسنة) واتە: جاری وا هەیە نوکتەیەك  زانیاری یەك  لەوەی ئەهلی تەزکیە باسی دەکەن دێتە نێو دڵمەوە، بەڵام هەتا دوو شاهێدی دادگەر کە قورئان و سوننەتن شایەدیی بۆ نەدەن وەری ناگرم. (واتە دەبێ بەڵگەی قورئان و سوننەتی لەسەر بێ).

کەواتە: (وحي) وەك چۆن چاودێرە بە سەر پێنج هەستەکان و عەقڵەوە، دەبێ هەر ئەویش شایەدو چاودێر بێت بە سەر خەون و خورپەوە و بەبێ مۆڵەتی ئەوان نابێ وەربگیرێت.

ئا ئەوە قسەو بۆچوونی ئەهلی تەزکیەو تەصەووفی ڕاستەقینەیە، نەك زۆربەی ئەو خەڵکە بەناو صۆفی یەی ئەمڕۆ کە ئاگای لە شەرع نیەو طەریقەت و تەصەووف و (تەکیەو خانەقا)ی کردوە بە دووکانێك بۆ خۆ پێ ژیاندن و فریودانی خەڵك، دیارە ئەهلی تەزکیەی ڕەسەن لە زۆر قۆناغاندا خزمەتی زۆری ئیسلام و مسوڵمانانیان لەو ڕێگایەوە کردوەو دواییی لەو ڕووەوە با شتر هەڵسەنگاندنی خۆمان دەخەینە ڕوو، لە بەرگی شەشەم و کۆتایی ئەم زنجیرە دەرسەدا خواپیشتیوان بێ.[ت]

---

(ت) بەڵام لێکۆڵینەوە تێرو تەسەلمان لەو بارەوە لە کتێبی (ڕێگای صالحبوون و بەرەو خواچوون)دا کردوە ، بڕوانە چاپی چوارەم (2005) نوسینگەی تەفسیر.

3- ( هەم خورپەو هەم خەونیش، دەبێ هەم لە ڕووی خودی خاوەنەکەیانەوە، هەم لە ڕووی بابەتی ئەو زانیارییە شەوە کە بەهۆیانەوە دەست هاتوە لە سنووررو جوغزی شەریعەت دا بن، ئەوجا وەردەگیرێن ).

جا سەبارەت بە خاوەنەکەیان - واتە بابای خورپە بۆ هاتوو و خەون دیتوو-. نابێت لە هیچ ڕێگا یەکی نا شەرعییەوە هەوڵی وەدەستهێنانی ئەو زانیارییە بدات، وەك: وازهێنان لە فەرزەکان، زۆر خۆ ئازاردان، دوورکەوتنەوە لە قورئان، یان پەنا بردنە بەر چەند عیبادەتێك کە داهێزاو (بدعة)ن، یان شێوەیەکی بید عەتییان هەیە، یان گۆ شەگیری یەکجاری و دوورکەوتنەوە لە خەڵك و خەڵوەکێشان و چلەکێشان لە ئەشکەوتدا، کە بەدا خەوە سەرجەم ئەو جۆرە هەڵەو پەڵانە کەم و زۆر لە نێو بە شێکی زۆری ئەهلی تەصووفی ئەم ڕۆژگارەدا هەن، نەك هەر ئەوە، بەڵکو زۆر شتی دیکەی سەیرو سەمەرەیان لە نێودا هەیە، کە دیارە بەم شتانەش شەیتانەکان دەسەڵات بەسەر مرۆڤـ دا پەیدا دەکەن و دڵی پڕ دەکەن لە مەعلووماتی هەڵەو پەڵەو پڕوپووچ، وە ڕەنگە جارو بار هەندێك مەعلووماتی ڕاستیشی پێ بدەن بۆ ئەوەی هەڵی فریوێنن!

بەڵــێ نابێ ئەو زانیارییەی کە لە ڕێگەی خورپەو خەونەوە وەدەست دێن لە ڕێگا یەکی نا شەرعییەوە بێت، چونکــــە

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (من احدث في امرنا هذا ما ليس منه فهو رد)[٣٨] واتە هەر كەسێك لەم (دین)ەی ئێمەدا شتێك پەیدا بكات و دایبێنێ كە پێ نامۆ بێت ئەوە ڕەتكراوەیەو قبووڵ نیە.

بەڵام ئەگەر خاوەنی ئەو خەون و خورپەیە پابەندبێت بە شەریعەتەوەو لەسەر فەرزو سوننەتەكان بەردەوام بێت و خۆی لە حەرام و شتە گومان لێكراوەكان بپارێزێ و دڵی خۆی بۆ خوا ساغ بكاتەوەو بەردەوام بێت لەسەر زیكرو ویردو فیكر، لەسەر قورئان خوێندن وە زیادەڕۆیی نەكردن لەو شتانەدا كە ڕەوان (مباح)ن، بۆ وێنە خەوتن لە خۆی كەم بكاتەوەو، خواردن كەم بكاتەوەو، تێكەڵی لەگەڵ خەڵكدا كەم بكاتەوەو، قسەكردن لە خۆی كەم بكاتەوە، بە شێوەیەكی كاتیی و وەك قۆناغێك بۆ ئەوەی موجاهەدەی نەفس بكاتو غەریزەكانی خۆ كۆنترۆڵ بكات[٣٩]، بەڵام نەك ئەوەندە نەخەوێ و نەخوات كە تێك بچێ و زیانی بەربكەوێ !! بەڵێ لەو حاڵەتانەدا كە نەفسی ساغ بۆوە ئەو كات ئەگەر مەعلوومات و شتی باشی هاتە نێودڵ یان خەونی دڵخۆشكەری بینی ئەوە ئیعتیباری پێ دەكرێ، ئەوە بەنسبەتی خاوەنەكەیانەوە.

---

(٣٨) رواه البخاري ومسلم.

(٣٩) بۆ زیاتر حاڵی بوون لەو بابەتە، خوێنەر دەتوانێ سەیری كتێبی (ڕێگای صاڵحبوون و بەرەو خوا چوون) بكات.

بەنسبەت خودی ئەو مەعلوومات و زانیارییە شەوە کە چ لە ڕێگەی خەونەوە یان خورپەوە دەبێ بخرێتە نێو تەرازووی قورئان و سوننەتەوەو لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت دا تەماشای بکرێت، واتە: ئەگەر هات و پێچەوانەی قورئان و سوننەت بوو دەبێ ڕەت بکرێنەوە، (ابن حجر العسقلاني) لەو بارەوە دەڵێت: (ويؤخذ مما تقدم التنبه عليه أن النائم لو رأي النبيّ ﷺ يأمره بشيئٍ هل يجب عليه إمتثاله ولابدّ، أو لابدّ أن يعرضه على الشرع الظاهر؟ فالثاني هو المعتمد)[3] واتە: لەوەوە کە ڕابرد دەگەینە ئەو ئەنجامە ئەگەر کەسێك پێغەمبەر ﷺ ی لە خەوندا بینی و فەرمانی بە شتێك پێکرد، ئایا یەکسەر لەسەری پێویستە ئەو شتە جێبەجێ بکات، یاخود دەبێ ئەو شتەی کە فەرمانی پێکردوە ڕای بنوێنێ و بیخاتە بەر تیشکی قورئان و سوننەت (جا ئەگەر بە پێی قورئان و سوننەت پێویست بوو بیکات و ئەگەر حەرام بوو نەیکات؟! (ابن حجر العسقلانی) دەڵێ: ئەوەی کە متمانەی پێدەکرێ هی دووەمە، واتە: دەبێ ئەو شتە لە مەحەکی قورئان و سوننەت بدات و بیگێڕێتەوە بۆ لای ئەوان، بۆچی؟ چونکە ئێمە مسۆگەر و دڵنیاین کە ئەو قورئان و سوننەتە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە بۆ ئێمەی هێناون، بەڵام دڵنیا نین لەوەی لە خەوندا پێی گەیاندووین، کێ

(3) فتح الباري / بەرگی (14) لاپەڕە (418) .

دەڵێ ئەو کەسە خۆی بە هەڵەدا نەچووە کە خەونە کەی بینیوە!! بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (هەر کەسێك کە منی لە خەوندا بینی ئەوە منی بینیوە، چونکە شەیتان نایەتە سەر شێوەی من)[1] بەڵام ئێمە دڵنیا نین لەوەی کە ئەو کەسە لێی تێك نەچووەو نەشێواوەو بەڕاستی پێغەمبەری خوای بینیوە!

هەروەها (ابن حجر العسقلاني) دەربارەی خورپە کە ئایا دەگونجێ ئیشی پێ بکرێ یان نا؟ دەڵێ (والذي عليه الجمهور انه لا يجوز العمل به (أي: بالألهام) الا عند فقد الحجج كُلِّها في باب المباح)[2] واتە: خورپە ئیشی پێ ناکرێ بە ڕای زۆربەی زانایان مەگەر لە کاتێکدا هیچ بەڵگەیەکی شەرعیمان بەدەستەوە نەبێ، ئەویش لە بواری موباحدا ئیشی پێ دەکرێت، پاشان بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست وێنەیەکی هێناوەتەوە دەڵێ: ئەگەر دوو ئاو هەبوون و دڵنیا بووی کە یەکێکیان پیسەو بەکەڵکی دەسنوێژ نایەت، بەڵام نەتزانی کامیانە، پاشان کە ئەگەر وەك خورپە هاتە دڵتەوە کە کامەیان پیسەو هیچ بەڵگەیەکی دیکەی شەرعیشت بەدەستەوە نەبوو، لەو حاڵەتەدا، دەتوانی ئیش بە خورپە بکەی .

(1) (من رآني في المنام فقد رآني إنه لا يتمثل الشيطان بي) رواه البخاري و مسلم.
(2) فتح الباری / بەرگی -14- لاپەڕە 417.

4- (بۆیە هیچ کام لە خەون و خورپە بە بەڵگەی شەرعی دا نانرێن چونکە هەر کامێکیان سێ جۆرە: یان لە خواوە یە، یان لە شەیتانەوە، یان لە نەفسەوە).

دەربارەی خەون، پێغەمبەر (علیه الصلاة وال سلام) دە فەرموێ: (الرؤیا ثلاثة، رؤیا من الله، ورؤیا تحزین من الشیطان، ورؤ یا مما یحدث به الرجل نفسه في الیقظة)(تر) واتە : خەون سێ بەشە: خەون هەیە لە خواوەیە، وە خەون هەیە دڵ تەنگ کردنە لە شەیتانەوە، خەونێکیش هەیە لەوەی کە لە کاتی بێداری دا کابرا قسەی دەربارە دەکات و بیری لــێ دەکاتەوەو لە دڵیدا دێت و دە چێ (دوا یی لە خەونی دا دێتەوە بەرچاوی وەك کا سێتێکی تۆ ماركراو)، کەوا تە دوویان هیچ نین و تەنیا یەکێکیان جێ گای ئیعتـ ـبارو متمانە یە، بۆیەش خەون بە بەڵگەی شەرعی دانانرێت چونکە ئەو خەو نەی دیتراوە نازانی داخۆ کام لەم سێ یانەیە.

هەروەها بۆ خورپەی نێودڵیش زانایان دیسان دەڵێن سێ جۆرە: (ابن حجر العسقلاني) لەوبارەوە چەند قسەیەك دە کات و پا شان دەڵێت: (قد یکون من الله، وقد یکون من الشیطان، وقد یکون من النفس)(یا) واتە: ئەو شتەی دێتە نێو دڵ جاری واهەیە لە خواوەیەو

(تر) رواه البخاري و مسلم .

(یر) فتح الباري / بەرگی -14- لاپەڕە 417.

جاری وا هەیە لە شەیتانەوەیە، جاری واش هەیە دەگونجێ لە نەفسەوە بێت.

هەروەها (ابن حجر) چەند قسەیەکی جوانیش لە (ابن السمعاني)یەوە دەێنێت دەربارەی خورپەی نێو دڵ، (ابن السمعاني) دەڵێت: (وانكار الألهام مردود، ولكن التمييز بين الحق والباطل في ذلك، ان: كل ما استقام على الشريعة المحمدية ولم يكن في الكتاب والسنة مايرده فهو مقبول) واتە: ئینکاری کردنی خورپەی نێو دڵ شتێکی ڕەت کراوەیە (چونکە چەندین بەڵگەی قورئان و سوننەتی لەسەرە) بەڵام ئەوەی کە لێرەدا حەق و ناحەقمان بۆ لە یەك جیا دەکاتەوە لە مەسەلەی خورپەدا ئەوەیە: کە هەر شتێك کە دێتە نێو دڵ ئەگەر بە پێی شەریعەتی (محمد) ﷺ بێت و لە قورئان و سوننەتیش دا شتێك نەبێ کە ڕەتی بکاتەوە ئەوە مەقبووڵە، ئنجا (ابن السمعاني) دەڵێ: (والا فمردودٌ يَقَعُ من حديث نفسه و وسوسة الشيطان) واتە: بەڵام (ئەگەر پێچەوانەی قورئان و سوننەت بوو ئەوە پاڵ دەدرێتە لای نەفس و لای وەسوەسەی شەیتان، وە بە هیچ جۆرێك وەرناگیرێ و ڕەت کراوەیە، دوایی دەڵێ: (ونحن لا ننكر ان يكرم الله عبده بزيادة نور منه يزداد به نظره ويقوى به رأيه) واتە: وە ئێمە ئینکاری ئەوە ناکەین کە خوا ڕێز لە بەندەیەکی بگرێ. بەوە کە ڕۆشنایییەکی زیدەی لە خۆیەوە پێ ببەخشێ کە

ببێتە مایەی بەهێزبوونی سەرنج و ڕاو بۆچوونی، پا شان دە لّـێ: (وانما ننكر ان يرجع الى قلبه بقول لا يعرف اصله) واتە: بەڵام ئێمە ئینکاری ئەوە دەکەین کە بگەڕێتەوە بۆ لای دڵی خۆی و قسەیەکی هاتبێتە نێو دڵ کە ئەسلێکی نەبێ لە شەریعەتدا، وە سەرەنجام دەڵـێ: (ولا نزعم انه حجة شرعية، وانما هو نور يختص الله به من يشاء من عباده فان وافق الشرع فأن الشرع هو الحجة) (تر) وا تە: وە خورپە نابێ بە بەڵگەی شەرعیش دابنرێت، بەڵکو ئەو خور پەو هاتنە نێو دڵە شتێکی تایبەتە خوا دەیدات بە هەندێك لە بە ندە تایبەتییەکانی جا ئەگەر بە پێی شەرع بوو، ئەوە بێگو مان تەنیا شەرع بەڵگەیە.

5- (ئنجا لەو حاڵەتانەش دا کە خەون و خورپە دروستە پ شتیان پێ ببەسترێ و متمانەیان پێ بکرێ، بێگومان لەسەر غەیری خاوەنی خۆیان نابنە بەڵگە) کەواتە: یەکێك بۆی نیە بڵـێ: من خەونێکی ئاواو ئاوام دیوە، پێویستە ئەو شتە ئەنجام بدەین، نەخێر بەڵکو تایبەتە بەو کەسە خۆی کە خەونەکەی دیوە، چونکە غەیری خاوەنی خەونەکەو خورپەی نێو دڵەکە، کەسی دی نازانێ کە ئەو خور پەو خەونە لە کام لەو جۆرانەن کە باسمان کردن، کەوا بوو غەیری خاوەنیان ناتوانێ و نابێ ئیعتمادیان لەسەر بکات، جا هەر چەندە

(تر) فتح الباري / بەرگی -14- لاپەڕە 418.

سەرنج دانی ئەوەی ڕابرد بێنیازمان دەکات لە بەڵگە هێنانەوە، بۆیە بە هێناونەوەی فەرموودەیەك بە بەڵگە وازی لێ دێنین: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵێکی کە ناوی (وابصة) بوو فەرمووی: (یا وابصة استفت نفسك، واستفت نفسك (ثلاثا)، البر ما اطمأنت به النفس، والأثم ما حاك في نفسك وتردد في صدرك، وان افتاك الناس وافتوك) (ت) واتە : ئەی (وابصة) پرس بە دڵی خۆت بکە (سێ جار وای فەرموو)، چاکە ئەوەیە کە دەروونت بۆی ئارام بێت، تاوانیش ئەوەیە لە دڵتدا بێت و بچێت و پێی ئارام نەبی، هەرچەندە خەڵکیش فەتوات بۆ بدەن و فەتوایان بۆت داوە (وەری مەگرە!). هەڵبەتە ئەوەش تەنیا بۆ کەسێك کە دڵەکەی دڵێکی هۆشیارو بێدار بێ و ئەهلی تەقوا بێ، چونکە ئەگەر وا بوو بە دڵی خۆی هەست بە چاکەو خەراپەو حەق و ناحەق دەکات، بەڵام وەك گوتمان ئەوە بۆ هەموو کەسێك نیە، بەڵکو کەسی خۆی دەوێ و پێغەمبەریش ﷺ ڕووی دواندن (خطاب)ی لە (وابصة)یە بەتەنیا !

6- (هەموو ئەو جۆرە زانیاری یانەی کە بە هۆی ڕێبازێکی ناشەرعییەوە لە ڕێی خەون و خورپەوە دەستگیر دەبن، با خاوەنەکانیشیان بە ڕواڵەت موسڵمانی باش بن، بەڵام بە بێ ئیعتبار سەیر دەکرێن)، چونکە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: (والبلد

(ت) رواه احمد، وابو یعلی الموصلي، والطبراني/ مجموع الزوائد – بەرگی –10– لاپەڕە 294.

الطيب يخرج نباته باذن ربه والذي خبث لايخرج الا نكداً)[ت] ، واتە: زەوی بەپیت ڕووەکی باش و میوەی پاکی لێ پەیدا دەبێ، بەڵام زەوی پیس تەنیا شتی بێکەڵك و پیسی لێ دەڕوێ، کەواتە: مرۆڤ هەر چەندە موسڵمانیش بێ، بەڵام مادام ڕێ یەکەی ناشەرعی بێت، عیبادەتێکی ناشەرعی کردبێت دیسان ئەو شتانەی کە دێنە دەستی لێی وەرناگیرێن، بۆیە زۆرجار کەسانێکی سۆفی و دەروێش دەڵێن: شێخمان ئاواو ئاوا بینیوە، کە شاخ و باڵی زۆریان لێدەنێن! چا وەك زانایانی لیکۆڵەرەوە (محقق) دەڵێن: زۆربەی ئەو شتانە  ئەگەر گریمان ڕاستیش بکەن  هی شەیتانەکانە کە پێ شانیان دەدەن و فریویان دەدەن، ئەو سۆفی و دەروێشە نەزانانەش وادەزانن ئەو شتە لە خواوەیەو لە فریشتەکانەوەیە!

7- (لە ڕێی خۆ ئازاردان و تێکۆشان (مجاهدە)ەوە، ئەگەر ئەو خۆ ئەزیەت دان و تێکۆشانە ناشەرعیش بێ زۆرجار ئینسان بەهۆیەوە ڕووحی جۆرێك لە ڕۆشنایی (إشراق)ی بۆ پەیدا دەبێ، نەك هەر بۆ مسوڵمانی گوناهبار بەڵکو جاری وا هەیە بۆ ئینسانی کافریش)، بۆچی؟! چونکە ئینسان لە ڕووح و جەستە پێکهاتوە، ئەگەر سەرنج بدەین لە ڕووی جەستەوە ئەوانەی (کاراتێ) دەکەن دەبینین چەند بەهێزو چوست و چالاك دەبن، جا هەموو ئینسانێك جەستەی لە

(ت) (الأعراف 58).

توانای دا هەیەو ئامادەیی (إستعداد)ی تێدایە کە بابایەکی کاراتی گورج و گۆڵی وەك (برۆسلی) یان نیزیك لەوی لێ دەربچێ، بەڵام بۆچی تەنیا ئەو ئاوای لێهاتوە؟ چونکە ئەو لەو بارەوە خز مەتی جەستەی خۆی کردوەو خۆی ماندوو کردوەو ئازاری زۆری لەو ڕێیەدا چەشتوە!

بەڵێ ئەو وزە شێرراوەیەی کە لە جەستەو لاشەی مرۆڤدا هە یە، بە هۆی مەشق و خۆڕاهێنان و خۆئازاردان و کار لە سەرخۆکردنەوە دەتوانرێ ئەو وزەو توانا شێرراوەیە بپ شکوێنرێ، ڕوو حیش بە هەمان شێوە، ئەویش ئەگەر لاشەت بۆ ئازارداو ئیشت بۆ کرد- کە دیارە ڕووحیش لەبەر هەموو کەس دا یەو کافر و م سوڵمانیش ڕووحی هەیە ئەو ڕووحەش بە هەمان شێوەی جەستە شتی یا سادر (خارق العادة)و سەیرو عەجایبی بۆ پەیدا دەبێ، کەواتە لاتان سەیر نەبێ کە کابرایەکی غەیره[2] مسولمان دەبینن کە ( شیش) لە خۆی دەدات و ئاگر دەخوات... هتد، ئەوە هەموو دەرەنجامی ئەوە یە کە لاشەی زۆر ئازار داوەو ڕووحەکەی دەستەڵاتی بە سەر لا شەیدا پەیداکردوە، وە هەندێك جار هەیە بە هۆی ئەوەوە زانیاری سەیر سەیریش دەزانن، هەڵبەتە ئەوەش هەندێکی تایبەتمەندیی ڕوو حەو بە وەرزش و خۆ ئازاردان بەر هەم دێ، هەندێکیشی بە هۆی

(2) هیندۆکییەکان شتی وایان زۆرە هەرچەندە (گا) پەرست و چی وچی پەرستیشن.

(جنّ)ەوەیە، چونكـە: ئینسان كە زۆر لە كوفرو گو ناح دا رۆ چوو لەگەڵ شەیتانەكان (شیاطین)دا دەبێتە هاودەمو ئەوان زانیـاری پێ دەگەیەنن بەڕاست و هەڵە.

نموونەیەك لەو بـارەوە:

یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ناوی ( غیلان بن سلمة) بوو چەند ژنێكی هەبوو تەڵاقیدان و میراتەكەی شی بە سەر كوڕەكانیدا دابەشكرد، (عومەری كوڕی خەتتاب) خوا لێی ڕازی بێ پێی گوت: من گومانم وایە كە شەیتان لەو قسانەی كە جارو بار لە فریشتەكانی دەدزێ و گوێی لـێ دەبێ بۆ تۆی هێناوەو هەواڵی مرد نی خۆتی پێ داوی، بۆیە ژنەكانت تەڵاق داوەو میراتەكەت دابەش كردوە(تر).

بە كورتی دڵ و دەروونی ئینسان، وە عەقڵی ئینسان وەك ئاش و دەستاڕێك وایە كە هەمیشە لە گەڕدایە و ڕاوەستانی نیە، جا چ شتی باشیان پێ بهاڕی چ خراپ! واتە: ئەگەر ئاگاداری دڵ و عەقڵت بی و هەمیشـە دەتوانی خەریكی زیكرو ویردی خوا بی، دەنگوبجێ خور پەی خێر بخەنە نێو دڵتەوە، بەڵام ئەگەر ئاگاداری خۆت نەبی و خەریكی گو ناح و تاوان بی، دەگو نجێ شەیتانەكان هەمیشە زانیاری و مەعلوماتی هەڵەو شتی خراپ و خەیاڵ و نیەتی خراپ وخوتخوتەی خراپت بخەنە نێو دڵو مێشكەوە.

(تر) (مدراج السالكین) بەرگی 1-لاپەڕە 47 .

كۆتایی ئەم باسەش بە وتەیەكی (ابو علي الجوز جاني) د ێنین، كە یەكێكە لە كەڵەپیاوانی مەیدانی تەزكیەی نەفس ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەفەرموێ: (كُنْ طالباً للأستقامة لا طالباً للكرامة ف سبيل ال صادق مطالبته النفس بالإستقامة فهي كل الكرامة، ثم اذا و قع في طري قه شيء خارق كان كأن لم يقع ولا يبالي، ولا ينقص بذلك، وا نما ينقص بالأخلال بواجب حق الأستقامة)[ت] واتە: بە داوای كەرا مەت و شتی یاسادرِ (خارق العادة)دا مەگەڕێ و دوای ئی ستقامەت و ڕاوە ستاویی لەسەر شەرع بكە، چونكە بەندەی ڕاست و چاك لەگەڵ خوا ئەوەیە كە لە نەفسی خۆی داوا بكات لەسەر جادەی شەرع ڕاوەستاو بێ، ئەوە یە كەرامەت و ڕێزی خوا بۆ ئین سان، وە ئە گەر شتێكی نا ئا سایی (خارق)یشی بینی، پێی وایە وەك هەر هیچ ڕووی نەدابێت، وە بەوە كە شتەكە دەبینێ مسوڵمانەتییەكەی پێی كەم ناكاتەوە، بەڵكو بەوە زەرەر دەكات و بەندایەتی لە كەمی دەدات كە زەرەر بگەیەنێ بە ڕاوە ستاویی لەسەر شەریعەت و ئەركەكانی سەرشانی جێبەجێ نەكات.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمدلله رب العالمين

---

(ت) (مجموعة الفتاوى) بەرگی  لاپەڕە 320-321 .

# بەنـــدى دووەم

## دەرســـى شـــەشـــەم

## خوا بەيەكگرتن ( التوحيد ) بناغەى بەندايەتيى يەو بىٚبڕوايى و هاوبەش بۆ خوا دانان ( الألحاد و الشرك ) يش گـــەورەترين تاوان و پووچتـــرين ئەفسانەن

الحمدلله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم وبارك على سيدنا وحبيبنا محمد خاتم الأنبياء وسيد المرسلين واله المتبعين لهداه اجمعين .

بەڕێزان:

خوا پیشتیوان بێ لەم شەشە خاڵەی خوارێدا بابەتی ئەم دەرسی شەشەمە کە بەندی دووەمی ئەم بەرگەی لێ پێك دێ دەتوێژینەوە:

خاڵی یەکەم: پێناسەی وشەی: (توحيد)و (إلحاد)و (شرك).
خاڵی دووەم: گرنگی و پایە بەرزی خوا بە یەکگراتن (التوحيد).
خاڵی سێیەم: بۆچی خوا بە یەککگرتن بناغەی بەندایەتیی بۆ خواکردن و مسوڵمانەتییە ؟!
خاڵی چوارەم: بۆچی بێبڕوایی و هاوبەش بۆ خوا دانان گەورەترین تاوان و پووچترین ئەفسانەن؟!
خاڵی پێنجەم: کێشەو گرفتی ئەهلی کوفر لە گەڵ پێغەمبەران (عليهم الصلاة السلام) بە درێژایی مێژوو بە هۆی شیرکەوە بووە نەك ئیلحاد .
خاڵی شەشەم: طاغووتەکان بەمەبەستی پاساو دانەوەی طاغووتی یەکەیان ڕەواجیان بە شیرك و کوفر داوە .

## خــاڵی یەکەم:

## پێناسەی وشــەی: (التوحيد) و (الألحاد) و (الشرك):

### 1- وشــەی (التوحيد):

ئەوەندەی سەرنجم داوە زۆربەی نووسەرانی کورد وشەی (توحـيد)یان بە (یەکتاپەرستی) مانا کردوە، بەڵام لە ڕاستیدا (یەکتاپەرستی) تەنیا بەشێك لە سێ بەشی (توحيد) مانـا لـێ دەدا تەوە، ئەوەی ئێ مە هەڵمانبژاردوە بۆ دانانی وشەی (توحـيد) ئەوە یە کە بـ ڵێین (خوا بەیەکگرتن)، چونکە ئەسڵی وشەی (توحيد) ئاوا یە: (وَحَّدَ، يُوَحِّد، توحيداً) (وحد) واتە: کردی بە یەك، (يوحد) دەیـکات بە یەك، (توحيد) بە یەکگرتن، بەیەك زانین، لە ئەسڵی زماندا هەر جۆرە بە یەکگرتنێك و بە یەك زانینێك دەگرێتەوە، بەڵام لە زاراوی شەرعدا واتە: بە یەك زانینی خوای پەروەردگار (سبحانەو تعالى).

خوای بێوێنەش کە بەیەك دەزانین هەم لە زات و سیفەتی خۆیدا، هەم لە هەڵوێستی ئێمە لە بەرامبەریدا، کە بریتـیە لە بەندایەتیمان و پەرستنمان بۆی، کەواتە (خوا بە یەکگرتن) ئەوەیە کە ئێمە هەم وەك بەدیهێنەرو پەروەردگار بە یەکی بزانین و، هەم وەك خاوەنی ئەو ناوو سیفەتانەی، کە تەنیا ئەو هەنی بە یەکی بزانین و هەم وەك پەرستراوێتی بە یەکی بزانین، کەوابوو کە دەگوترێ (یەکتاپەرستی) لە ڕاستیدا تەنیا بەشی سێیەمی (توحيد) دەگرێتەوە.

خوا بە یەکگرتن وەك ئاماژەمان پێکرد سێ بەشە:

**یە کەم:** یەکتایی خوا لە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی و خاوەنداریێتیدا (توحید الله في خالقيته و ربوبيته و مالكيته)، خوای کاربەجێ دەربارەی ئەوە، کە هەر ئەو بە تەنیا بەدیهێنەرو پەیداکەرو دروستکەرە، دەفەرموێ: ﴿ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَ هُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾(تز) واتە: بڵێ خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە وە هەر ئەوە تاکی دەسەڵاتدار.

وە دەربارەی پەروەردگاریێتی خۆی بۆ هەموو شتێك و هەموو جیهانەکان دەفەرموێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾(ىث) واتە: ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان .

وە دەربارەی ئەوە کە تەنیا خوا خاوەنی هەموو شتێکەو هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نیە، دەفەرموێ: ﴿ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء ... ﴾() واتە : بڵێ ئەی خوایە خاوەنی هەموو موڵك و هەرچی کە هەیە، تۆ موڵك بە هەر کەسێك دەدەی کە بتەوێ، وە لە هەر کەسێکی وەردەگریەوە کە بتەوێ.

خوا هەر تەنیا خۆی بەدیهێنەرە، تەنیا خۆی پەروەردگارە، تەنیا بۆ خۆشی خاوەنە.

---

(تز) ( الرعد 16 ) .
(ىث) ( الفاتحة 2) .
() ( آل عمران 26 ).

**دووەم:** بەشی دووەمی خوا بەیەکگرتن بریتیە لە: یەکتایی خوا و بێوێنەیی خوا لە ناوە هەرە چاکەکانی و سیفەتە هەرە بەرزەکانیدا (وحدانية الله في اسمائه الحسنى وصفاته العُلى) وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾[تن] واتە: بۆ خوا ناوە هەرە چاکەکان هەن، جا بەو ناوە چاکانەی لێی بپاڕێنەوە، وە واز لە وانە بێنن کە لادان لە ناوەکانی خوادا دەکەن، ئەوانە بێگومان لەسەر ئەو کارە نالەبارەی دەیکەن (ئەو لادان و گۆڕین (تحرف) ە) سزای خۆیان وەردەگرن.

وە فەرموویەتی: ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا﴾[ھ] واتە: پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە بیپەرستە، وە خۆڕاگر بە لەسەر بەندایەتی بۆ کردنی، ئایا هاوناوێك بۆ خوا دەزانی و پێت شك دێت کە خوا هاوناوێکی دی هەبێت !! ئایا کەس هەیە ناوی وەك ناوی خوای هەبێ؟ بێگومان نەخێر.

**سێیەم:** بەشی سێیەمی خوا بەیەکگرتن، بریتیە لە: یەکتایی و بێهاوبەشی خوا لە پەرستراوێتیدا (وحدانية الله في ألوهيته) واتە: هەر خوا (عزّو جل) پەرستراو (إله)و بەندایەتی بۆ کراو (معبود)ەو بێهاوەڵ و هاوبەشەو بەتەنیایە. وەك فەرموویەتی: (فاعلم انه لا إله

---

(تن) (الأعراف 180).

(ھ) (مريم 65).

الا الله)[تا] واتە: بزانە کە جگە (الله) پەرستراوێکی دیکە نیيە، وە فەرموویەتی: (وما ارسلنا من قبلك من رسول الا نوحي اليه انه لا إاله الا انا فاعبدون)[ها] واتە: لە پێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە جگە لە من پەرستراوێکی دیکە نیەو هەر بەندایەتی بۆ من بکەن، کەواتە هیچ کام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة السلام) نەبوون کە بەو بانگەوازەوە ڕەوانە نەکرابن.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ﴾[سە] واتە: لە هەر کۆمەڵێك و گەلێکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوەو پێمان ڕاگەیاندوە کە پێیان بڵێ: بەس خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغووت دووربگرن، (طاغوت)یش هەر جۆرە پەرستراوێکە[شە] جگە لە خوا، بەڵێ: تەنیا بەندایەتی کردن بۆ خواو تەنیا خوا پەرستن یەکێکە لە سێ بەشەکانی خوا بە یەککگرتن.

کەواتە: (خوا بە یەککگرتن)واتە: دان بەوەدا بێنی، کە ئەم بوون (وجود)و بوونەوەرە، یەك بەدیهێنەرو پەروەردگارو مشوورگێڕو خاوەن و فەرمانڕەوای هەیە، کە خوا (الله)یە.

---

(تا) ( الأنبياء 25 ).

(ها) ( النحل 36 ).

(سە) ( النحل 36 ).

(شە) ئەمە ڕای زۆربەی توێژەرەوانی قورئانە لە پێشینانەوەش (ابن جرير الطبري)یە بەڵام من وای بۆ دەچم کە (طاغوت) لە قورئانیدا مەبەست پێی ئەو حوکمڕان و سەرکردانەن کە بە ناشەرعی دەچنە سەر کورسی حوکم و بە ناشەرعییش حوکم دەکەن. .

وە ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارە بێوێنەیە خاوەنی بێژمارە ناوی هەرە بەرزو پەسندو سیفەتی هەرەچاکە، کە هیچ کەس و هیچ شتێك لەو ناو و سیفەتانەی خوادا بەشدار نیە، وە ئەو پەروەردگارو بەدیهێنەرە شایستەی ئەوەیە کە بە تەنیا بپەرسترێ و بەندایەتی بۆ بکرێت، بەبێ ئەوەی هیچ کەس و هیچ شتێك لەو پەرستن و بەندایەتیەدا بکرێتە هاوەڵ و هاوبەش (شريك)ی.

کەواتە (تەنیا خواپەرستی) بەشێکە لە سێ بەشی خوا بە یەکگرتن، جا ئەم بەشی سێیەمەش نایەتەدی تاکو ئینسان لە سێ بواردا پەرستن و بەندایەتی بۆ خوا نەکات کە هەر سێکیان لە سوورەتی (الأنعام)دا هاتوون و هەر سێکیان بە شێوەی پرسیارکردنی ئینکاری (الأستفهام الأنكاري)، کە شێوازێکی زۆر بەهێزەو ئەگەر تۆ بتەوێ پێچەوانەی ئەوە کە پرسیاری لێ دەکەی بە بیسەرو دوێنراو بگەیەنی، بە شێوەی (الأستفهام الأنكاري) پرسیار دەکەی، بۆ نموونە: ئەگەر تۆ چاکەت لەگەڵ کەسێك کردبێت پێی دەڵێی: ئایا چاکەم لەگەڵ نەکردی؟! دیارە مەبەستت ئەوەیە کە بێگومان چاکەم زۆر لەگەڵ کردووی، جا بەبێ ئەو سێ بوارە لە پەرستن (عبادة)دا ئینسان نابێتە خوا بە یەکگر (موحد)و (عابد)ی ڕاستەقینە بۆ خوای پەروەردگار:

(یەکەم): بێجگە لە خوا هیچ کەس بە دۆست و پشتیوان نەگیرێت و هیچ کەس خۆشەویست و یارو یاوەرو دڵ پێ بەستراو و داوالێکراوی ئینسان نەبێت.

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾[1] بلّێ : ئایا جگە لە خوا دۆست و پشتیوانێکی دیکە بگرم کە بە دیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە؟! واتە نابێ بێجگە لە خوا دۆستو پشتیوان و خۆشەویست و پشت پێ بەستراو و داوالێ کراو و دڵ پێ بەستراوێکی دیکەم هەبێت.

(دووەم): بێجگە لە خوا هیچ کەس بە فەرمانڕەواو دادوەر و بەرنامەرێژ نەزانرێت، وەك فەرموویەتی: ﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلاً!﴾[2] واتە: ئایا جگە لە خوا فەرمانڕەواو داددوەرێکی دی داوا بکەم لە حاڵێکدا ئەو کتێبێکی بۆتان ناردوە، ڕوون و ئاشکرایەو هەموو یاساو حوکمەکانی تێدا ڕوون کراونەوە؟! واتە: خوایەك کە ئەو کتێب و بەرنامەیەی ناردوە کە هەموو شتێکی تێدا ڕوون کراوەتەوە، ئەگەر جگە لەو دادوەرو فەرمانڕەوا یەکی دیکەو یاسا دانەرێکی دیکە بخوازم، شتێکی بێجێ و ناماقووڵە.

(سێیەم): بێجگە لە خوا هیچ کەس پەرستراو و سەرپەرشتیکەر نەبێت، وەك دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ﴾[3] واتە: بلّێ: ئایا جگە لە خوا  الله- پەروەردگار و پەرستراوێکی دی داوا بکەم کە ئەو پەروەردگار و پەرستراوی هەموو شتێکە؟! دیارە

(1) ( الأنعام 14 ).
(2) ( الأنعام 114 ) .
(3) ( الأنعام 164 ).

وشەی (رب) بە زۆر مانا هاتوە لە قورئاندا بەڵام لێرەدا زیاتر بە مانای پەرستراو (معبود)ە .

کەواتە, دەبێ لە هەر کام لەو سێ بوارانەدا ئینسان پەرستن و بەندایەتی بۆ خوا بکات، ئنجا مانای وایە بە تەواوی مانا خوای پەرستوەو یەکێك لە سێ بەشەکانی (خوا بە یەکگرتن)ی لە خۆیدا هێناوەتەدی کە گرنگترین بەشیەتی، هەرچەندە (خوا بە یەکگرتن) لە پەرستنیدا بەرهەمی (خوا بەیەکگرتن)ە لە پەروەردگارێتی و ناوو سیفەتەکانیدا، وەك دوایی باسی دەکەین و ڕوونی دەکەینەوەو ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئانیش بکەین دەبینین لە هەر شوێنێك خوای کاربەجێ ویستبێتی فەرمان بە بەندەکانی بکات کە بە تەنیا خوا بپەرستن، فەرموویەتی: تەنیا خوا پەروەردگارەو بەدیهێنەرەو خاوەنی ئەو ناو و سیفەتە بەرزانەیەو تەنیا خوا خاوەنی بەخشش و نیعمەتەکانە، کەواتە: تەنیا بەندایەتی بۆ ئەو بکەن. واتە: هەرچەندە بەندایەتی بۆ خواو تەنیاپەرستنی خوا، بەرهەمی پەروەردگارێتی و بەدیهێنەرایەتی خوایە، بەڵام گەورەترین بەشی (خوا بە یەکگرتن)یشە، وەمشتومڕی پێغەمبەرانیش لەگەڵ ئوممەتەکانیان بە زۆری لەسەر ئەو مەسەلەی (تەنیا پەرستنی خوا) بووە وەك دوایی تیشکی دەخەینە سەر.

ئەوە بە کورتی پێناسەی وشەی (توحید).

## 2- وشـەی (الإلحـاد):

(إلحاد) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا بە مانای (مَیْل) دێت. واتە: لادان فەرهەنگەکانی زمان دەڵێن: (الألحاد لغة هو الميل وسمي اللحد لحدا لميله الى جانب القبر)، مردوو بە دوو شێوە دەنێژرێت لە گۆڕدا، یەکەم: لە نێو گۆڕەکەدا گۆڕیچکەیەك لـێدەدرێت کە ئەوە پێی دەگوترێت (شق) دوایی تەرمەکەی دەخرێتە نێوەوەو بەردی لە سەر دادەنرێت، دووەم: بەشێوەی لاگۆڕ کە (لـحد)ی پێ دەڵێن: کە لایەکی گۆڕەکە لە نێوەوەدا هەڵدەکۆڵدرێت و تەرمەکەی دەخرێتە نێوەوەو پاشان دەیگرنەوەو گۆڕەکە دادەپۆشرێ، جا وشەی (الإلحاد) لە (لحد)ەوە هاتوە واتە: لادان، وەك چۆن گۆڕە کە بەلایەکدا لا دەدرێت، کەوابوو لادان لە دانهێنان بە پەروەردگاریتی خوادا بۆ شتی دی، بۆ وێنە: یەکێك بڵـێ ئەم بوونەوەرە بە سروشت دروست بووە، یان بە رێکەوت، یان شتی دی دەستی بووە لە دروستکردن و بەدیهێنانیدا، بە هەرحاڵ گرنگ ئەوەیە (الإلحاد) یانی لادان لەوەدا کە دانبێنی بەوەدا کە خوای بەرزو مەزن بەدیهێنەرو خاوەنی ئەم بوونەوەرەیەو لابدەی بۆ شتی دی، وە ئەگەر لە زمانی کوردیدا وشەی (الإلحاد) بە (بێ دینی) لێك بدرێتەوە رەنگە پڕ بە پێست بێت، چونکە کاتێك ئینسان دان بە بوونی خوادا نەهێنی دیارە هیچ دینی نیەو نابێ.

خوای پەروەردگار لە قورئانێدا بە کەمی و بە دەگمەن ئاماژەی بە (الإلحاد) کردوە، چونکە بەڕاستی دانەهێنان بە بوونی خوادا

پێچەوانەی عەقڵ و زانیاری و فیطرت و ئەم بوونەوەرەو هەموو شتێکە!! لەبەرئەوە کەمتر وابووە کە مرۆڤایەتی دوو چاری ئەو جۆرە لادن (انحراف)ە ببێ و دان بە بوونی خوادا نەهێنێ.

بەشەریەت هەر لە سەرەتاوەو تا ئێستاش هەمیشە زۆربەی هەرە زۆری دانی بە بوونی خوادا هێناوەو خوای ناسیوە، بەڵام لە بەندایەتی بۆ کردنی خواو پەرستنی خوادا بە هەڵەداچوون، بۆیە لە چەند جێگایەکی کەمدا نەبێ خوای زانا (عزّوجل) ئاماژەی بە (الإلحاد) نەکردوە، یەکێك لەو شوێنانە، ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلا الدَّهْرُ وَمَا لَهُم بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾[تن] واتە: (وە ئەو بێبڕوایانە) گوتیان: ژیان هەر ئەم ژیانەی دنیامانە، دەمرین و دەژین، وە تەنیا ڕۆژگار ئێمە لە نێو دەبات (خوایەك نامانژێنێ و نامانمرێنێ) وە هیچ زانیاریشیان لەو بارەیەوە نییە تەنها گومان بردنێك نەبێت.

وە لە شوێنێکی دیکەش ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ۞ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴾[يح]، واتە: ئایا هەر لەخۆوەو بە بێ بەدیهێنەر دروست بوون، یان خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن؟! یاخود ئایا ئاسمانەکان و زەوییان دروستکردوون بەڵکو زانیارییان نیە. ئەوە هەر بە کورتی پێناسەی بێبڕوایی (الحاد).

---

(تن) ( الجـاثيـة 24 ) .

(يح) ( الطـور 35-36 ).

3- وشـەی ( الشــرك ):

واتە: هاوبەش بۆ خوا دانان، هەندێك كەس وا دەزانن كە هاوبەش بۆ خوا دانان تەنیا لە (پەرستن) دایە بەڵام نەخێر، چونكە هاوبەش بۆ خوا دانان دژو پێچەوانەی خوا بەیەككگرتن (توحید)ە، نەك دژو پێـ چەوانەی یەكتاپەرستی، كەواتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنرێ لە دروستكردندا هەر (شرك)ە، وە ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنرێ لە ناو و سیفەتەكانیدا هەر (شرك)ە، خوا یاربێ دوایی لە باسی (شرك)دا ڕوونی دەكەینەوە كە چۆن قورئان ئەم سێیانەی هەرسێك بە (شرك) داناوەو ز ـیاتر تیـ شكی دەخەینە سەر .

خــاڵی دووەم :

گرنگی و پایــەبەرزیی خوا بە یەككــرتن:

خوا بە یەككگرتن چەق و مەركەزێكە، كە (دین) قورئان و سوننەت هەموو بە دەوری ئەو چەق و مەركەزەدا دە سووڕێتەوە، چۆن؟! د ـیارە هەموو ئایەتەكانی قورئان و فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) یان باسی زاتی خوای پەروەردگارن، یان باسی ناو و سیفەتە بەرزەكاننی، یان باسی دروستكراوەكانی خوان، باسی ئەو درو ستكراو و

شوێنەوارانەی کە ناو و سیفەتەکانی خوایان تێدا دەدرەو شێنەوە، یان باسی فەرمانکردنن بە بەندایەتیکردن و پەرستنی خوا، یان باسی چۆنیەتی بەندایەتیکردن و چۆنیەتی پەرستنی خوان، یان باسکردنی پاداشت و پلەوپایەی ئەو کەسانەن کە بەندایەتی بۆ خوا دەکەن لە دونیاو دوارۆژدا، یان باسی سزاو جەزرەبەی ئەوانەن کە لە بەندایەتی کردن بۆ خوا لادەدەن و هاوبەش و هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن، یان باسی بەسەرهاتی پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام) کە گەلەکانی خۆیانیان بانگ کردوە بۆ خوا پەرستی و بەندایەتی کردن بۆ خواو ئەو کێشەو تێکگیرانانەی کە لە نێوان پێغەمبەران و گەلەکانیاندا روویانداوە لەسەر مەسەلەی دینداریی و خوا بە یەکگرتن، کەوا تە: قورئان هەمووی لەو بازنەو خولگەیەدا دەخولێتەوە، هەروەها سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)یش کە شەرح و ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی قورئانە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النمل ٤٤)

## خاڵی سێیەم:

**بۆچی خوا بە یەکگرتن بناغەی بەندایەتی بۆ خواکردن و مسوڵمانەتییە؟!**

دیارە لەبەر زۆر شت کە دەتوانین لە سێ حاڵەتدا کورتیان بکەینەوە:

(یە کەم): بوونی خوا (سبحانەوتعالی)، وە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوا (جل جلالە) گەورەترین راستی ئەم بوون (وجود)ەیە، وە بەبێ دانهێنان بە بوونی خواو بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوادا ئینسان ناتوانێ بە شێوەیەکی راست و ماقووڵ، چۆنیەتی پەیدابوونی ئەم بوون (وجود)ە تەفسیر بکات، بوونەوەرێك[تێ] کە لەسەر ئەوپەری رێکوپێکی و وردەکاریی و یاسا (نظم) بنیات نراوە، ئەگەر نەڵێی خوا دروستی کردوەو رێکی خستوە، ئایا پاڵی دەدەیە لای کێ؟!، لای چی؟!، چۆن؟! بەڵێ بەبێ دانهێنان بە بوونی خوادا ئینسان ناتوانێ چۆنیەتی پەیدابوونی ئەم بوونەوەرە، وە پاشان رێکوپێککرانی، وە پاشان بەرێوەچوونی، بە شێوەیەکی مەنتیقی تەفسیر بکات، ئەوە لە لایەکەوەو لە لایەکی دیکەشەوە:

لە راستیدا بەبێ دانهێنان بە بوونی خوادا ژیانی ئینسان سەری لە شتی پووچ و هەوەنتەکارییەوە دەردەچێ، بۆیە ئێستا رێچکەیەك هەیە لە رۆژئاوا پێی دەگوترێ پووچگەرایی (العبثية) دەڵێت: ژیان و بوون هەمووی پووچ (عبث)ە!! وە بە راستی ئینسان ئەگەر دانی بە بوونی خوادا نەهێناو خوای نەناسی، بێگومان هەموو شتێك پووچ دەردەچێ، بە بەڵگەی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ

(تێ) وشەی بوونەوەر (کون) تەعبیر لە بەشێکی بوون(وجود) دەکات. کە بریتیە لەوەی تا ئێستا مرۆڤ بۆی کەشف بووەو پەی پێ بردوە.

﴿إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾(تر) واتە: ئایا پێتان وایە کە ئێمە ئێوەمان بە هەوەنتەو پووچ دروستکردووەو بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوە؟!، واتە: ئەگەر ئینسان بۆ لای خوا نەگەڕێتەوەو لێی نەپێچێتەوەو بە چاکەکار نەڵێ چاکت کردو بە خراپەکار نەڵێ خراپت کرد، مانای وایە ڕاستە ژیانە کەی بێ حیکمەت و پووچە.

(دووەم): بەبێ خوا بە یەککگرتن بەندایەتی بۆ خواکردن نایەتەدی، واتە: کەسێك کە دەڵێ: عەبدایەتی بۆ خوا دەکەم، بەڵام هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدات، چ لە زاتی دا، چ لە ناو و سیفەتی‌دا، چ لە پەرستـرانیدا، وە چ لە هەر شتێکی دیدا کە تایبەتمەندی خوایە، مانای وایە عەبدایەتی بۆ خوا نەکردووەو نەیپەرستوە، وەك کە خوای بەبەزەیی لە فەرموودەیەکی (قدسي)دا دەفەرموێ: (( انا أغنى الأغنياء عن الشرك)) واتە: من بێنیازترین و دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندانم لە هاوبەشایەتی، بەڵێ خوا زۆر بەرزترە لەوەی کە بهێنرێتە ڕیزی دروستکراوەکانی، یان دروستکراوەکانی بهێنرێتە ڕیزی خوا، بۆیە شیرك شتێکی زۆر بێ‌جێیەو گەورەترین ستەمەو خوا هەرگیز خاوەنەکەی نابەخشێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء ﴾ (النساء -48).

(سێیەم): بەبێ خوا بەیەککگرتن نە دڵ و دەروونی ئینسان ئۆخژی بۆ دێت، نە عەقڵی قەناعەت دەکات، نەژیانی ڕێکوپێك دەبێت، نە

---

(تر) ( المؤمنون 115 ) .

کەسایەتی مەعـنەوی گەشەدەکات، وەنەکۆمەڵ دەبێتە کۆمەڵگایەکی ساغ و تۆکمەو پێکەوە جۆشدراو، کەواتە: لەبەر ئەم هۆیانەو گەلێك هۆی دیکەش (خوا بەیەکگرتن) بە بناغەی بەندایەتی بۆ خواکردن و دینداریی و مسوڵمانەتیی دادەنرێ، وە کاکڵ و جەوهەری مسوڵمانەتیی و بڕواداریتی و بەندایەتیکردن بۆ خوا ئەوەیە کە ئینسان خوا (عزّوجل) بە یەك بگرێ ، بەواتای فراوانی (خوا بە یەکگرتن).

## خاڵی چـوارەم:

## بۆ چی بێبڕوایی و هاوبەش بۆ خوا دانان پووچترین ئەفسانەو گەورەترین تاوانن؟!

ئەم پرسیارەش هەروا بە شێوەیەکی گشتی لە سێ خاڵدا تیشك دەخەینە سەری و وەڵامی دەدەینەوە:

یەکەم: بێگومان ئیلحاد دژو پێچەوانەی عەقڵەو دژو پێچەوانەی سروشت (فطرة)ەو دژو پێچەوانەی بوونەوەرە، وە دژو پێچەوانەی وردو درشتە، چونکە عەقڵ چەندان یاسای خوا رِسکی تێدان، کە عەقڵ ناچار دەکەن، واتە عەقڵ خۆی خۆی ناچار دەکات کە بڵێ: ئەم بوونەوەرە خاوەن و پەروەردگارو مشوورخۆرێکی هەیە، یەکێك لەو یاسا بەڵگەنەویستانە ئەوەیە کە هەر پەیدابوو یەك پەیدا کەرێکی هەیەو (لکل حادث محدث)، هەر شوێنەوارێك بەڵگەیە لە سەر

ئەوەی کە شوێنەوار سازێك بۆ ئەو شوێنەوارە هەیە، (لکل اثر مؤثر)، وە یا سایەکی دیکە ئەوەیە کە: هەر ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە (لکل نظام مُنَظِّم) وە یاسایەکی دی دەڵێ: هەر کەسێك شتێکی نەبێت ناتوانێ لەو شتە ببەخشێ، (فاقد الشيء لایعطیه)، ئەگەر تۆ سێوێکت نەبێ ناتوانی سێو ببەخشی، هەموو ئەوانەی لە ماددە دەکۆڵنەوە، بەتایبەت کیمیازان و فیزیازانەکان، دەڵێن: ماددە کە وردی بکەینەوە دەچێتە سەر گەردیلە (ذرة ATUM) ئەویش وردی بکەینەوە دەبێتە سێ بەشی سەرەکی (ئەلیکترۆن، پرۆتۆن، نیوترۆن) ئەوانیش هەر یەکەیەکان لە شتی بچووکتر پێك دێن، کە ئێستا زانایان دەڵێن: تا ئێستا زیاتر لە (100) تەنۆلکەی بچووك لە نێو گەردیلەدا دۆزراوەتەوە، لەکاتێکدا کە گەردیلە بە(میکرۆسکۆب)ی ئەلیکترۆنیش هەر نابینرێ، کە سەدان هەزار جار شت گەورە دەکات! ئەدی چۆن دەزانین کە گەردیلە هەیەو لە سێ بەش پێکدێت و ئەو هەموو تەنۆلکانەی تێدایە؟! دیارە بە هۆی شوێنەوارەکانییەوە! ئنجا هەموو زانایانی ماددەناس لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە: نە عەقڵ، نە هەست و شعوور، نە ویست و ئیرادە، نە ژیان، ئەوانە هیچیان تایبەتمەندی ماددە نین، نە نەشونوماو گەشەکردن کە لە ڕووەکدا هەیە، نە غەریزە کە لە ئاژەڵان دا هەیە، هیچی پەیوەندی بە خودی ماددەوە

نیە ، هەمووی لە دەرەوەی مادده هاتۆتە نێو مادده ، ئەدی کێ بۆی هێناوە؟!

(ماتریالیست)ەکان دەڵێن: ئینسان و زیندەوەران و ڕووەك و ژیان بەگشتی لە ئەنجامی گەشەکردن و پەرەسەندنی (مادده)وە پەیدابووە ، باشە ئاخر مادده بۆ خۆی ئەو شتانەی نیە ، ئەدی ئەو شتانەی لە کوێ هێناوە خۆ: نەدار پێی نابەخشرێ (فاقدة الشيء لا يعطيه)؟!، کەواتە: مادده کە بۆ خۆی نیە ، ئنجا ئەگەر لە دەرەوە بۆی نەهاتبێ (لە خواوە) ئەدی لە کوێ پەیدابووە ؟!

وە هەروەها چەندان یاسای دی جۆراو جۆر هەن کە هەموو یا سای بەڵگەنەویستی عەقڵین و ئینسان ناچار دەکەن دان بە بوونی خوادا بنێ، کەواتە: بێبڕوایی دژ وپێچەوانەی عەقڵە ، وە فیترەت و سروشت و بوونەوەرو یاساو ڕێکوپێکی نێو بوونەوەر هەمووی مۆری خوای بەدیهێنەری پێوەیەو دژو پێچەوانەی بێبڕواییە.

(دووەم): پەرێزو شوێنەواری هیچ هاوبەش ( شریك)ێك لە دەورو بەرو بوونەوەردا دیار نیە ، واتە: ئێمە شوێن پەنجەی هیچ کەسێك بە دروستکرانی شتێکەوە نابینین بێجگە لە هی خوای پەروەردگار ، وەك خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ : ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾[٣٨] واتە: حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی کە

[٣٨] ( الإسـراء 44 ).

تێیاندا هەیە، پاك و بێگەردیی خوا ڕادەگەیەنن، وە هیچ شتێك نیە مەگەر پاکی و ستایشی خوا ڕادەگەیەنێ، بەڵام ئێوە لە بە پاك گرتن (تسبیحات)ە کەیان تێ ناگەن، بێگومان خوا زۆر هێدی و مەندو زۆر تاوان پۆش و لێبووردەیە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ شُرَكَاءَكُمُ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ ...﴾(تر) واتە: پێیان بڵێ کوا ئەو هاوبەشانەتان کە دەیانکەن بە هاوەڵی خواو لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، پێم شانم بدەن چ شتێکیان لە زەویدا دروستکردوە، یان لە دروستکردنی ئاسمانەکاندا هاوبەشییان هەیە؟!، واتە: ئەگەر لەسەر زەویدا کە لەژێر دەستیانە هیچیان پێ دروست نەکرێ، ئایا دەتوانن بڵێن بەشداریمان لە دروستکردنی ئاسمانەکاندا کردوە؟! بێگومان نەخێر.

(سێیەم): هاوبەش بۆ خوادانان لە پەرستنی و لە ناوو سیفەتەکانیدا گەورەترین تاوانە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾(ىر) واتە: وە کاتێك لوقمان یەکەمین ئامۆژگاری کوڕەکەی ئەوەبوو کە پێی گوت: ڕۆڵەگیان هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، بێگومان هاوبەش بۆ خوادانان زوڵمێکی زۆر گەورەیە، بەڵێ بەڕێزان! هاوبەش بۆ خوا دانان شتێکی گەورەیە چونکە: ستەمە لە هەموو بوونەوەر، هەموو

(تر) ( الفاطر 40 ).
(ىر) ( لقمان 13 ).

بوونەوەر شایەتی دەدات کە تەنیا یەك بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەیە، بەڵام کە ئینسان هاوبەشی بۆ خوا بڕیاردا، دیارە دروستکراوێکی زۆر بێهێز دەکات بە هاوبەش بۆ خواو پێی وایە ئەویش دەستی هەیە لە دروستکردنیدا، مانای وایە ئینسان بە هۆی هاوبەش بۆ خوا دانانەوە زوڵم لە هەموو بوونەوەر دەکات، وە زوڵم لە خۆشی دەکات و لە هەموو شتێکی دیکەش: لە عەقڵ، لە سروشت و فیترەت، لە پەیام و بانگەوازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام)، وە لە هەقی خوا (عزّوجل) لەسەر بەندەکانی کە حەقی خوا ئەوەیە لەسەریان بیپەرستن و هاوبەش (شریك)ی بۆ بڕیار نەدەن.[(تر)]

ئنجا سەبارەت بەوەی کە هاوبەش بۆ خوا دانان چەند شتێکی ناقۆڵاو دزێوو بێمانایە خوای بێنیاز و جێی نیاز ئاوامان نیشان دەدات و وێنا دەکات کە دەفەرموێ: ﴿... وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾[(یر)] واتە: هەرکەسێك هاوبەش (شریك) بۆ خوا دابنێت، وەك کەسێك وایە کە لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارێ بەسەر دەمدا، ئنجا باڵندەش پەلاماری بدات و بیبات بەم لاولاداو پارچەپارچەی بکات، یاخود باو گەردەلوولێکی بەهێز هەڵ بکات و بیباتە شوێنێکی دوور، واتە: کەسێك کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێ، گوناحێکی ئەوەندە گەورەی کردوە شایستەی سزایەکی ئاوایە،

(تر) وەك لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە (بخاری و مسلم) لە (معاذ بن جبل)ەوە خوا لێی ڕازی بێ دەیگێڕنەوە. .

(یر) ( الحج 13 ) .

وەك هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان وا دەڵێن، یاخود واتە ئەوە ندە لە حەق دوور كەوتۆتەوە وەك لە ئاسمانەوە لە پەوڕوو كەوتبێتە سەر زەوی، لەسەر زەویش باڵندە ڕفاندبی یان بایەكی بەهێز هەڵی دابێتە نێو خڕو زەندۆڵێكی قووڵەوە.

## خاڵی پێنجـەم :

**بە در ێژایی م ێژوو كێ شەوگرفتی ئەهلی كوفر لە گەڵ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە هۆی هاوبەش بۆ خوا دانانەوە بووە نەك بێبڕوایی .**

بەڵـێ، بە درێژایی مێژوو كێشەو مشتومڕو تێكگیرانی پێغەمـبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ قەومەكانیاندا  وە ئێ ستاش و دوای ئێستاش هەر وادەبێ  لەسەر ئەوە نەبووە كە خەڵك بڵـێ خوا ن ییەو پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) ب ڵێن: نەخێر خوا هە یە!! بەڵكو لەسەر ئەوە بووە كە پێغەمبەران و قەومەكانیشیان گوتوویا نە: پەروەردگارو بەدیهێنەرێك هەیە، جا پێغەم بەران (ع لیهم ال صلاة والسلام) گوتوویانە: كەواتە: با هەر ئەو خوا بەدیهێ نەرە بپەر ستین و بەندایەتی بۆ بكەین، بەڵام خەڵك واتە: خەڵكی كافر  گوتوویەتی با لەگەڵ ئەودا شتێكی دیش بپەرستین!

واتە: هاوبەش (شريك)یان بۆ خوا بڕیارداوە، جا ئەو هاوبەش بۆ پەیداکردنە:

1- چ لەوەدا بێت کە دروستکرانی بەشێك لە بوونەوەرو دروستکراوەکانیان پاڵدابێتە لای ئەو هاوبەشانە، وەك یۆنانی و ئیغریقیەکان و زەردەشتیەکان و هیندۆسیەکان.

2- یاخود لە ناوو سیفەتەکانی خوادا هاوبەشیان بۆ دانابێت و ئەو ناوو سیفەتانەی خوا هەنی بۆ دروستکراوەکانی دایان بنێت، کە ئەم جۆرەیان لە نێو مسوڵمانانی ئێستادا زۆرە لە ئەنجامی لادان لە ڕێبازی خوا بەیەکگرتن بە تایبەتیش لە ژێر پەردەی تەصەووفدا بۆ نموونە کەسێك پێی وابێ: شێخ هەموو شتێك دەزانێو دەتوانێ نێو دڵی بخوێنێتەوە، یان دەتوانێ شیفا بۆ نەخۆش بێنێ یان ... یان ..... هتد .

کە ئەو شتانە تەنیا سیفەتی خوان و هاوبەش بۆ خوا دانانیش لە سیفەتەکانیدا ئەوەیە کە شتێك تەنیا بە خوا بکرێت، بەڵام پاڵی بدەیە لای غەیری خوا، وەك دوایی لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین.

3- یاخود هاوبەش بۆ خوا دانان لە پەرستن و بەندایەتی بۆ کردن دابێ کە ئەویان موفرەدەکانی زۆرن بەڵام بەگشتی دەبێتە دوو بەشی سەرەکی:

یەکەم: هاوبەش بۆ خوا دابنرێت لە دروشمەکان (شعائر)دا، کە زیاتر پەیوەندییان بە لایەنی رووحی و شەخسییەوە هەیە, وەك: نوێژو رۆژوو و تەوافکردن و لە دەور سوورانەوە, قوربانی بۆ سەر برین, لێ پاڕانەوە, لێ‌ترسان و پشت پێ بەستن, خۆشویستن .........هتد[تێ]

ئەوانە هەموویان هاوبەش (شریك) بۆ خوا دانانن لە دروشمەکان (شعائر)دا, کە دەبێ تەنیا بۆ خوا ئەنجام بدرێن.

دووەم: هاوبەش بۆ خوا دابنرێت لە بەرنامەکان (شرائع)دا کە ئەمەیان زیاتر پەیوەندی بە لایەنی ماددی و کۆمەڵەوە هەیە، واتە پەنا ببرێتە بەر سیستەم و یاسای غەیری خوا لە بواری کۆمەلایەتی, ئابووری, سیاسی, جەنگ و ئاشتی, پەیوەندی نێوان دەوڵەتان ...هتد بەکورتی لە بواری حەڵاڵ و حەرام و ئەمرو نەهیدا، ئنجا لە ڕاستیدا هاوبەش بۆ خوا دانان لە بواری دروشمەکان (شعائر)یشدا هەر بەشێکە لە هاوبەش بۆ خوا دانان لە بواری بەرنامەکان (شرائع)دا, چونکە بەشێك لە بەرنامەکانی خوا بریتین لە دروشمەکان (واتە: دروشم و نیشانە تایبەتییەکانی مسوڵمانێتی).

---

(تێ) لێ ترسان و خۆشویستن، کاتێك بە ( شرك) دادەنرێت کە مرۆڤ لێ ترسان و خۆشویستنی بۆ غەیری خوا وەك هی خوا (جلّ جلاله) وابێت.

که بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا زۆر لەوانەی باسی خوا بەیەکگرتن دەکەن لە بواری پەرستندا تەنیا باسی لایەنی دروشمەکان (شعائر) دە کەن, وە پێشیان وایە کە هاوبەش (شریك) بۆ خوا دانان تەنیا ئەوە یە کە لە دروشمەکاندا هاوبەش بۆ خوا دابنێی و واش دەزانن کە کێ شەو گرفتی گەورە تەنیا لەگەڵ خاوەن گۆڕە کان (ا صحاب القبور)ە, بەلام بە پێچەوانەوە لە ڕاستی دا کێشەو گرفتی گەورە لەگەڵ خاوەن کۆشکەکان (اصحاب القصور)ە، وە لە ڕاستیدا ئێستا خاوەنی قەسرەکان و ئەوانەی لە نێو قەسرو تەلارەکان دان زیاتر دەپەرسترێن, هەتا ئەوانەی لە نێو قەبرەکاندان!

بەڵێ ئێستا ئەو طاغووت و خۆ بە خوازانانەی نێو قەسرەکان زیاتر دەپەرسترێن, ئەوانەی کە حەلال و حەرام بۆ خەڵك دیاری دەکەن و ڕێ لە خەڵك دەگۆڕن و ئەمرو نەهی بە ناهەق بەسەر خەڵکدا دە کەن و بە ئارەزووی خۆیان بەرنامەی ژیان و گوزەران بۆ خەڵك دیاری دەکەن! ئەم جۆرە شیـرکە ئێستا کێشەو گرفتی گەورەی موسڵمانانە!

بە داخەوەش ئێستا زۆر لە نامیلکەو کتێبەکانی (توحید)دا کە بە ناوی (عەقیدەی سەلەفی)[تن] یەوە دەخوێنرێن و بلاودەکرێنەوە، باسی خوا بەیەکگرتن (توحید) بە هەر سێ بەشەکەیەوە کورت هەڵدێنن لە بواری

(تن) لە پێشەکی بەرگی یەکەمی ئەم زنجیرە دەرسەدا باسمان کردووە کە عەقیدە لە ئیسلامدا یەکێکە و سەلەفی و خەلەفی و ئەشعەری صۆفی تێدا نیە وە تەنیا عەقیدەی ئیسلامییە .

دروشمەکان (شعائر)دا , ئنجا ئەویش زیاتر لەوەدا کە پەیوەندی هەیە بە مەسەلەی پاڕانەوە لە مردوو و چوونە سەر قەبرو پاڕانەوە لە شێخ و ..... ئەوەی کە لە نێو بەشێك لە ئەهلی تەسەووفدا هەیە! جا دیارە ئەمەش هەر هاوبەش بۆ خوا دانانە، بەڵام لە ڕاستیدا لەم ڕۆژگارەدا هاوبەش بۆ خوا دانانی گەورەتر, بەڵای زل و زەبەلاحتــر, ئەوەی کە زیان و زەرەری بۆ مسوڵمانان زیاترەو وای لە مسوڵمانان کردوە کە ئاوا زەبوون ڕیسوا بن، ئەوەیە کە لە بواری بەرنامەکان (شرائع) دایە.

ئنجا با سەیر بکەین چۆن کێشەو گرفتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ قەومەکانیان لەسەر قەزیەی هاوبەش بۆ خوا دا نان (شـــــرك) بووە.

رستەیەك لە سوورەتی (الأعراف) لە چوار ئایەتدا لەسەر چوار لە پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) کە (نوح، هود، صالح، شعیب)ن دوبارە بۆتەوە ئەویش ئەوەیە:﴿يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾(ت) واتە: ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن بێجگە لەو پەر ستراوێکی دیکەتان نیە، ئنجا لە راستیدا نەك هەر ئەو چوار پێغەمبەرە، بەڵکو هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام). هەر ئاوایان فەرمووەو ئەوە بەس بۆ نموونەیە.

ئنجا لە چەندان دەقی قورئاندا هاتوە کە دە فەرمویَ: ئە گەر لە کافرەکان بپرسی ئا یا کێ بوو نەوەری درو ستکردوە؟! کێ ئ ێوەی

(ت) الأعراف 59  65  73  85 .

دروستکردووە؟! دەڵێن: خوا، واتە: کێ شەو گرفتەیان پەروەردگاریتی و بەدیهێنەرایەتی خوا نەبووە و دانیان بە بوونی خوا داهێناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾(تر) واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسی کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوون؟ دەڵێن: خوای باڵادەستی زانا دروستی کردوون، وە هەر لە هەمان سوورەتدا دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾(یر) واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسی کێ ئێوەی دروستکردووە؟ دەڵێن: خوا، کەواتە: کافرەکان دانیان بە بوونی خوادا هێناوە.

بۆیەش پانتاییەکی کەم لە قورئاندا تەرخانکراوە بۆ سەلماندن و ئیسپاتی بوونی خوای بێ هاوەڵ، وە ئەو ئایەتانەش کە باسی پەروەردگاریتی و بەدیهێنەرایەتی خوا دەکەن هەر بۆ ئیسپات و سەلماندنی پەرستن و بەندایەتی بۆکردنی خوایە، واتە ئەگەر باسی پەروەردگاریتی و ناوو سیفەتی خواش دەکرێت هەر بۆ ئەوەیە کە بە هاوبەش دانەر (مشرك)ەکان ڕابگەیەنێت کە مادام خوایەك خاوەنی ئەو سیفەتە بەرزانەو ئەو شوێنەوارانەو خاوەنی ئەو دەسەڵاتە بێت، کەواتە: شایستەیە هەر ئەو بە تەنیا بپەرسترێت.

---

(تر) الزخرف 87.
(یر) ( الزخرف – 9 ).

لە فەرموودەیەکی (قدسي)دا هاتوە کە خوای پەروەردگار دەفەرمویَ: ((خلقت عبادي حنفاء فاجتالتهم الشياطين))[(ت)] واتە: بەندەکانی خۆمم وا دروستکردوون کە تەنیا من بپەرستن، بەڵام شەیتانەکان لایان دەدەن.

کەواتە: لەسەر ئەوەی کە ئینسانەکان هەموویان خوای خۆیان بناسن وەك پەروەردگارو بەدیهێنەر، ئەوە پێویستی بە زۆر بەڵگە هێنانەوە ناکات، بۆیە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) زۆر خۆیان پێوە ماندوو نەکردوە، بەڵام ئەوە کە دەبێ هەر خوا بە تەنیا بپەرسترێ و هاوبەش (شريك)ی بۆ دانەنرێ، ئەوە کێشەو گرفتی گەورە بووەو ئەرکی سەرەکی سەرشانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بووە.

## خاڵی شەشەم :

**طاغووت و فیرعەونەکان بۆ ئەوەی پاساوی طاغووتایەتی و خۆ لە خەڵککردنە پەروەردگار یان دەست بکەوێ، هەمیشە ڕەواجیان بە (شرك وكوفر) داوە، بۆچی؟!**

چونکە ئەگەر ئیمان و مسوڵمانەتی هەبێ و خەڵك خوا بناسێ و بپەرستێ، ئەوان بواریان دەست ناکەوێت و دەرفەتیان نابێت کە بڵێن: ئێمە پەروەردگاری بەرزی ئێوەین و تەنیا پەستراوی ئێوەین.

---

(ت) ( مسلم و احمد ).

کاتێك (فرعون) دەرفەتی دەست کەوتوە کە بڵێ: ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى﴾[تر] یان بە (موسی): بڵێ ﴿لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ﴾[یر]، دوای ئەوەی کە گومانی خستوتە دڵی خەڵکەوە کە بەڵــێ خوا هەیە، بەڵام هاوبەش(شریك)ی شی هەن وە نیش شتم بەدەستە!

بەڵــێ هەر یەکێك لە طاغووت و فیرعەونەکانی مێژوو دوای ڕەواج پێدانی شیــرك و کوفر ئنجا پاساوی ئەوەیان دەست کەوتوە کە برەو بە طاغووتایەتیی و فیرعەونایەتی خۆیان بدەن و حەڕام و حەڵاڵ بۆ خەڵك دیاری بکەن، ئەوەتا خوای پەروەردگار لەو بارەیەوە دە فەرموێ: ﴿قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ قَالُواْ إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ ، قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ﴾[س] واتە: زلە زلەکانی قەومی (ثمود) بە ئەوانەی کە ئیمانیان هێنابوو و چەوسێنرابوونەوە پێیان گوتن: ئا یا بڕواتان وایە کە (صالح) پێغەمبەرە لە لایەن پەروەردگاریەوە؟! لە وەڵامدا گوتیان، بەڵــێ ئێمە بڕوامان بەوە هەیە کە ڕەوانەکراوی خوایە، خۆ بەزلگرەکان گوتیان: ئێمە بڕوامان بەوە نییە کە ئیمانتان پێی هێناوەو ئێمە کافرین.

---

(تر) ( النازعات 24 ).

(یر) ( الشعراء 29 ).

(س) ( الأعراف 75 – 76 ).

**بەڵێ بۆ ئەوەی دەرفەتیان بۆ هەڵکەوێ و پاساو (مبرر)یان دەست بکەوێ کە هەر لەسەر طاغووتایەتی و چەوسێنەرایەتی خۆیان بەردەوام بن، گوتیان: ئێمە بڕوامان بە خواو پێغەمبەرو پەیام و بەرنامەکەی نیە!**

**هەمیشە کوفرو بێبڕوایی زەمینەخۆشکەری طاغووتایەتی و فیرعەونایەتی بووە بەسەر گەل و نەتەوەکاندا، وە هەمیشە خوا بەیەکگرتن و ئیمان چەکوشێك بووە قەڵای طاغووت و زۆردارانی هەرەس پێهێناوەو ڕووخاندوە، وە پاساوی بەدەستەوە نەهێشتوون کە فیرعەونایەتی بەسەر خەڵکەوە بکەن، چونکە مادام خوا هەبێ و تاکە پەروەردگارو پەرستراو و حوکمڕانی موتڵەق بێ، پاساو و بیانووی فیرعەونایەتی چیە؟!**

بەڕێـــزان:

ئەم سێ دەرسەی ( و  و ) تەرخان کراون بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی عەقڵ و زانیاری (العقل والعلم) لەبارەی بوونی خوای بەرزو مەزنەوەو چۆنیەتی شایەدییدانیان لەسەر گەورەترین و درەو شاوەترین ڕاستی لە بووندا (أكبر وأجلى الحقائق في الوجود) کە بریتیە لە:

بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوا (عزّ وجل) بۆ تێکڕای بوون و بوونەوەرو کائینات.

بەڵام پێویستە ئەو ڕاستییە لەبەرچاو بێت کە ئێمە ویستوومانە بە شێوازێکی وا ئەو شایەدیی دانەی عەقڵ و زانیاری بخەینە ڕوو کە ژمارەیەکی زیاتری خەڵکی لێی تێبگەن. بۆیە بەگوێرەی بۆ لوان خۆمان پاراستوە لە بەکارهێنانی ئەو شەو زاراوەو شێوە دەربڕینانەی کە خەڵکی پسپۆڕ نەبێ لێیان تێناگات، هەروەها نابێ هیچکەسیش پێی وابێ کە هەر چی عەقڵ و زانیاری لە هەگبەی دا بووە لەبارەی شایەدییدانیان لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوای بێ وێنەو هاوەڵ!

بەڵکو ئەوەی من هەوڵم داوە بە گوشراوی و بەزمانێکی سادەو ڕەوان لێرەدا لەو بارەوە بیخەمە ڕوو تەنها مشتێکە لە خەروارێك، بگرە دڵۆپێکە لە دەریایەك و دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین:

بەڵ گە عەقڵیی و زانیاری یەکان لە سەر بەدیهێنەرا یەتیی و پەروەردگارێتی خوا (سبحانه وتعالى) بێ ژمارن!

ڕەحمەتی خواش لەو کەسەبێ کە کاتی خۆی گوتوو یەتی: (وفي كلّ شيء له آية تدلّ على أنه واحدٌ).

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە باس و بابەتەکانی ئەم سێ دەر سە تێکهەڵکێشن، بەپێویستم نەزانیوە دەرسەکان لە یەك جیابکە مەوە و هەرسێکیان پێکەوە ئاوێتە کراون.

# چۆنیەتی شـــایەدیی دانی عەقڵ لەســەر بەدیهێنــەرایەتیی و پەروەردگاریێتی خـوا (عزّوجل).

الحمدلله كما ينبغي لجلاله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله..

بەڕێزان!

سەرەتا پێناسەیەکی کورتی هەرکام لە (عەقڵ و زانیاری و فیطرەت) دەکەین، هەرچەندە لە بابەتەکانی پێشدا شتێکمان لەبارەوە باسکردن.

- (عەقڵ) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا وەك (ابن منظور) دەڵێ: (سُمّي العقلُ عقلاً لأنه يعقل صاحبه عن التورّط في المهالك، أي: يحبسه)[1] واتە: عەقڵ بۆیە پێی دەگوترێ عەقڵ چونکە خاوەنەکەی خۆی دەگێڕێتەوە، لەوەی کە بکەوێتە نێو شتێکەوە کە زیانی هەبێ. واتە (حبس)ی دەکات و دەیگێڕێتەوە، ئنجا عەقڵ دوو جۆرە، عەقڵی فیطری و عەقڵی وەدەستهێنراو (مکتسب)، عەقڵی فیطری واتە: خوارسك، خوا چۆنی دروستکردوە بەو شێوەیە، کە مەبەستمان پێی ئەو بەڵگەنەویستە ژیرییانە (البديهيات العقلية)یە کە چەند نموونەیەکمان لـێ هێنانەوە لە بابەتەکانی پێشدا، وە هەموو خەڵك لەم عەقڵی فیطرییەدا بەشدارن و وەك یەك هاوبەشن.

(1) لسـان العـرب ، بەرگـی -9- لاپەڕە 326

بەشی دووەمی عەقڵ، عەقڵی (مكتسب)، واتە: عەقڵی وەدەستهێنراو، کە بریتیە لە جووڵاندن و ئیش پێکردنی ئەو عەقڵە فیطرییە، وە بەدەستهێنانی زانیاری و زانستێك لەرێی پێنج هەستەکانەوە، جا دیارە خەڵك تێیدا جیاوازە، هەیە عەقڵی زیاترەو هەیە عەقڵی کەمترە، واتە: هەیە زیاتر عەقڵی خۆی بەکارهێناوە، وەك چۆن کەسی واهەیە لاشەی بەهێزترە، هەیە لاشەی لاوازترە، عەقڵیش وەك هەر ئەندامێکی دیکەی مرۆڤ زیاتر بەکاری بهێنی بەهێزتر دەبێ، کەمتر بەکاری بهێنی لە حاڵەتی لاوازی خۆیدا دەمێنێتەوە.

- (زانیاری) مەبەست لە زانیاری ئەو زانراوانە(معلومات)یە کە عەقڵ بەهۆی پێنج هەستەکانەوەو بەسەرپەرشتی خۆی کۆیان دەکاتەوە لە ئەنجامی گوێگرتن و سەرنجدان و بەکارهێنانی باقی پێنج هەستەکانەوە، وە لەرێی هەڵسەنگاندن و ئەزموونەوە.

- (فیطرەت) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا ئاوا پێناسەکراوە (أصل الفّطْر: الشقّ ومنه قوله تعالى (اذا السماء انفطرت) وفي الحديث ((قام رسول الله ﷺ حتى انفطرت قدماه)) وقال ابن عباس رضي الله عنه ما كنت أدري ما (فاطر السموات والأرض) حتى أتاني أعرابيان يَختصمات في بئر فقال أحدهما: أنا فطرتها، أي أنا ابتدأت حفرها والفطرة: الخلقة. والفطرة: ما فطر الله عليها الخلق من المعرفة به)[1]

(1) لسان العرب ، بەرگی -10- لاپەرە 286

واتە: ((ئەسڵی وشەی (فطر) بەواتای (شق) دێت، واتە لەتکردن، وەك كە خوای بەرز دەفەرموێ: (اذا السماء انفطرت) كاتێك ئاسمان لەت(شق) بوو، وە لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتووە (قام رسول الله ﷺ حتى انفطرت قدماه) پێغەمبەر شەونوێژی كرد تاكو پاژنە پێیەكانی درزو تیكیان تێبوو و قڵیشانەوە، (عبدالله)ی كوڕی (عباس) خوا لێیان رازی بێت، فەرموویەتی: نە مدەزانی ئایەتی (فاطر السموات والأرض) یانی چی، هەتا دوو عەرەبی دەشتەكی و خێڵەكی هاتنە لام، كێشەیان هەبوو لەسەر (بیر)ێك، یەكێكیان گوتی: (أنا فطرتها) واتە من یەكەمجار بیرەكەم لێداوەو هەڵمكەندوە، كەواتە (فطر) بە مانای لەت ( شقّ)كردن دێت، وە بە مانای یەكەمجار دروستكردن و دەستپێكردن دێت، ئنجا وشەی (فطرة) بە مانای (خِلْقة) دێت، واتە: ئەو شێوە دروستكردنە كە ئینسان یاخود هەر جۆرە دروستكراوێكی دی لەسەر دروستكراوە، وە (فطرة) بەو سروشت و حاڵەتە دەگوترێت كە خوا خەڵكی لەسەر سرو شتاندوەو دروستكردوە كە بیناسن و بیپەرستن و بەندایەتی بۆ بكەن)).

هەروەها (ابن الأثیر) لە تەفسیری ئەو فەرموودەیەدا: (( كل مولود یولد على الفطرة))[1] هەموو منداڵێك لەسەر فیطرەت لەدایك دەبێت، دەڵێ: (الفطر: الأبتداء والأختراع، والفطرة منه: الحالة كالجلسة والرَّكبة، والمعنى: أنه یولد على نوع من الجِبلّة والطّبع المتهیّئ لقبول الدین. فلو

(1) رواه مسلم.

تُرِك عليها لأستمر على لزومها، ولم يفارقها الى غيرها وانما يَعدِلُ عنها من يعدِل آفةٍ من آفات البشر والتقليد)[1] واتە: (فطر) یانی: سەرەتا دەستپێکردن و سەرەتا داهێنان، (فطرة)یش حاڵەتە لە (فطر)، وەك (جِلسة) یانی جۆرێك لە دانیشتن (ركبة) یانی جۆرێك لە سواربوون، مەبەست لە فەرموودەکە ئەوەیە کە لەسەر جۆرێك لە سروشت لەدایك دەبێ، کە ئامادەیە بۆ قبووڵ کردن و وەرگرتنی دینداریی و بەندایەتی بۆ خوا ئەگەر وازی لـێ بهێنرێت و لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بێت، ئەوە ئەو منداڵە لەسەری دەڕوات و بەری نادات لە ژیانیدا، بەڵام کە سانێك کە لادەدەن بۆیە لادەدەن بەهۆی لادەرێکەوە کە تووشیان دێت وە بەهۆی لاسایی کردنەوەوە.

پوختەی مەبەست :

برادەرو هاوەڵی خراپ و دەوروبەرو ژینگەو شەیطان... هتد، ئەوانە سەر لە مرۆڤ دەشێوێنن و لای دەدەن، ئەگەرنا هەموو ئینسانێك خواو خاوەنی خۆی دەناسێ، وەك لە فەرموودەکەدا هاتوە کە خوا وای دروستکردوە، وە خوای بەبەزەیی زۆر لەوە کاربەجێ ترە کە بەندەکانی بەشێوەیەك دروست بکات خوای خۆیان نەناسن و نەزانن کێیە!!

(1) النهاية في غريب الحديث والأثر) كه (لسان العرب) بەرگی (10) لاپەڕە 287 لێیەوە نەقڵ کردوە.

ئنجا (فیطرەت) دیسان دوو جۆرە: فیطرەتی عەقڵی، وە فیطرەتی دەروونی، فیطرەتی عەقڵی ئەوە بوو کە باسمان کرد، وەك سەرەتا عەقڵییەکان کە هەن، کە تۆزێکی دی هەندێك بەڵگەیان لێ بەنموونە دەهێنینەوە، فیطرەتی دەروونیش: مەبەستپێیان ئەو داخوازییە دەروونیانەن کە لە دڵدا هەن، وەك ئەوە کە دایك هەر لەخۆوە منداڵی خۆی خۆش دەوێ و پێویست ناکات کە لە قوتابخانەو پەیمانگاو زانکۆکاندا فێری ئەوە بکرێ کە پێویستە منداڵی خۆی خۆش بوێت! هەروەها هەموو گیاندارێك هەروایە. یان هەموو (نێرو مێ) یەك یەکتریان خۆش دەوێ و بۆ لای یەکدی کێش دەبن و پێویست ناکات کەس فێریان بکات، یان هەموو کەسێك حەزدەکات شت فێر ببێ، یان هەموو کەسێك جوانیی خۆش دەوێ، هەروەها ئینسان هەموو سیفەت و خەسڵەتێکی چاکی خۆش دەوێت، کە دوایی زیاتر باسی ئەم بابەتە دەکەین، گرنگ ئەوەیە بزانرێ کە مەبەست لە فیطرەتی دەروونی ئەو داخوازییە سروشتی و دەروونییانەن کە بەبێ ئەوەی خەڵك فێرکرابێت لە دەروونی هەموو کەسدا هەن و هەستیان پێ دەکات.

ئەوەی رابرد بەکورتی پێناسەی (عەقڵ و زانیاری و فیطرەت) بوو.

ئنجا بابزانین کە چۆن هەرکام لە عەقڵ و زانیاری و فیطرەت، شایەدو بەڵگەن لەسەر بوونی خوای پەروەردگار:

## - چۆنیەتی شایەدیی دانی عەقڵ لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەرگاریێتی خوا ﷻ:

ئەوە کە ئایا چۆن عەقڵ بوونی خوا عزّوجل دەسەلمێنێ و چۆن لەرێی عەقڵەوە پەی بە بوون و بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوا (عزّوجل) دەبرێ بەدرێژایی مێژوو، زانایان و فەیلەسوفان قسەیان لەسەر کردوەو شتی جوانیشیان گوتوە، وە زانایانی ئیسلام و غەیری ئیسلامیش چ ئەوانەی پێشین و چ هاوچەرخ زۆر بەڵگەی عەقڵییان لەو بارەوە هێناوەتەوە.

بەڵام بەداخەوە زۆربەی زانایانی ئیسلام -مەبەستم ئەوانەیە کە لە بواری عەقیدەو (علم الکلام)دا پسپۆڕ بوونە- لە کتێبەکانی خۆیاندا ئەوەندەی پشتیان بە لۆژیك (منطق)و فەلسەفەی یۆنانی بەستوە بۆ دارِشتنی بەڵگە عەقڵییەکانیان لە بواری ئیسپاتی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوادا نیو هێندەش پشتیان بە عەقڵی فیطریی نەبەستوە!

لە حاڵێکدا کە عەقڵ هەر بە شێوە فیطرەییی‌و کار ئاساییەکەی خۆی‌و بەبێ پەنابردنە بەر مەنتیقی ئەرستۆیی و فەلسەفەی یۆنانی و شێوازی ئاڵۆزو زاراوە قورس و مەتەڵاویەکانیان، گەلێك یاساو بنچینەی ڕوون و بێ‌چەندو چوونی وای تێدان، کە هەرکەسێك ویژدانی هەبێ و بەدوای

حەقدا بگەڕێ بوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاری لەلا دەکەنە شتێکی ڕوون و بێ پێچ و پەنا!

وە لەراستیدا پشت بەستنی زۆرێك لە زانایانی ئیسلام لەو رووەوە بە مەنتیق و فەلسەفەی یۆنانیو شێوازە ئالۆزو بلۆزەکەیانو زاراوە قورس و پێچراوەکانیان وایکردوە کە بەڵگەهێنانەوە عەقڵییەکەیان و شك و برینگ و ڕەق و تەق و بێ ڕەونەق بێت و هەرکەسێکیش سەرنجی کتێبەکانی (علم الكلام) بدات بۆ وێنە: ( شرح العقائد النسفية)و (تهذيب الكلام) و(شـــرح المواقف)، لە راستیی ئەم قسەیەمان دڵنیـــا دەبێ.

پێشم وایە هەرکەسێك سەرنجی قورئان بدات و لەو بارەوە شێوازی بەرزی ڕەچاو بکات، قورئانی بەپێز بێنیازی دەکات لە هەرجۆرە مەنتیق و فەلسەفەیەکی یۆنانی و غەیری یۆنانی. چونکە خوای زاناو شارەزا کە لەبارەی ئەو فەرمایشت(کلام)ە بەرزو پیرۆزو بەهێزو پێزەی خۆیەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا﴾(الأسراء-9). واتە: بێگومان ئەم قورئانە - خەڵکی- ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕێبازو شێوازێك کە ڕاستترو چاکترە، دیارە چەمك و واتای ئەو ڕێبازو شێوازە چاکترو ڕاستترە گشتییەو تەنها شتێك و دوو شت ناگرێتەوە! واتە: قورئان لە هەموو ڕوویێکەوەو لە هەر بوارێکدا کامە ڕێبازو شێوازی بەرزترو چاکترە بۆ گەیشتنە ئامانج و مەبەست ئینسانی بۆ ڕێنمایی دەکات.

جا خوا پشتیوان بێ ئێمە هەوڵ دەدەین لەم توێژینەوەیەماندا تەنها بە وردبوونەوە لە یاساو بنچینەکانی عەقڵی فیطریی و سەلیم و بە بەهرە وەرگرتن لە ڕۆشنایی و ڕێنمایی کتێبی خوادا پێنج (5) یاسای عەقڵی بخەینە ڕوو، کە هەرکامێکیان بەسە بۆ سەلماندنی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوای بێوێنەو هاوتا (عزّوجل)، شایانی باسیشە کە گرنگی یاساو بنچینە ژیرییەکان (القوانین والقواعد العقلیة) لەوەدایە کە هەموو خاوەن عەقڵان تێیاندا بەشدارن، هەرکەسە لەقەدەر خۆی، لە شوانێکی سادەوە بگرە هەتا بیریار(مفكّر)ێکی پسپۆڕو بلیمەت.

ئێستاش ئێوەو ئەم پێنج یاسا عەقڵییە ڕوون و بێ چەندوچوونە:

**یەك - هیچ پەیدابووێك بێ پەیداکەر نابێ (لا حادث بلا مُحْدِث):**

مەبەست لەم یاسایە ئەوەیە کە ئەگەر تەماشای خۆمان بکەین و تەماشای دیاردە سروشتییەکان بکەین و تەماشای دەوروبەرو بوونەوەر بکەین، هەست دەکەین کە (پەیدابوو)ین، جا هەم ئێمە کە پەیدابووین و هەم دەوروبەرو بوونەوەر کە پەیداکراون، بەڵگەین لە سەر ئەوە کە پەیداکەرێکمان هەیە، چونکە هیچ پەیداکراوێك بەبێ پەیداکەر نایەتەدی. جا هەرچەندە ئەمە شتێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام من سێ قوڵە بەسەرهاتم بۆ هێناونەوە بۆ زیاترو چاکتر ڕوونکردنەوەی:

* دەگێڕنەوە کە کابرایەکی فەیلەسووف و زانا کە لە بوونی خوای پەروەردگاردا گومان و دوودڵی دەبێت، جارێکیان لە بیابانێك دا چاوی

بە کابرایەکی شوان دەکەوێت کە لەلای حوشترەکانی گۆ چانەکەی لە زەویدا چەقاندوەو عەبایەکەی بەسەردا داوەو لەژێر سێبەرەکەیدا نو ێژ دەکات، کە لە نوێژەکەی دەبێتەوە، کابرای فەیلە سووف پ ێی دە ڵێ: وادیارە تۆ خەریکی بەندایەتی و پەرستنی؟ کابرای شوان دەڵێ: بەڵێ، فەیلەسووفەکە دەڵێ: بۆ کێ؟ ئەویش دە ڵێ: بۆ خوای پەروەردگارو بەدیهێنەر، فەیلەسووفەکە دەڵێ: جا خوا هەیە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، خوا هەیە بۆیە دەیپەرستم! فەیلەسووفەکە دەڵێ: باشە بەڵگەت لەسەر بوونی خوا چیە؟ شوانەکەش[1] دەڵێ: (البعرة تدلّ على البعير، والخُطوة تدلّ على المسير، فسماءٌ ذات أبراج، وأرضٌ ذات فُجاج، وبحر ذو أ مواج، ألا تدل على العليم القدير؟!) واتە: قشپل بەڵگە یە لە سەر حو شتر (چونکە قشپل بەبێ حوشتر پەیدا نابێ)، وە شوێن پێ بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کەسێك پێی لێناوەو لێرەوە ڕۆییشتوە، (شوێن پێی هەر شتێك بەڵگەیە لەسەر ئەو شتە)، ئەدی باشە ئایە ئاسمانێکی خاوەن ئەستێرەو زەوییەکی خاوەن دۆڵ و شیو و بەرزیی و نزم یی و دەریا یەکی خاوەن شەپۆڵ، بەڵگەنین لەسەر خوای زانای توانا؟!، (واتە: ئایا هەموویان بە ئەندازەی قشپلەکەو شوێن پێیەکە نرخیان نییە لای تۆ، کە ئەوانیش بەڵگە بن لەسەر خاوەن و سەرپەرشتی کارێکی زاناو بەتوانای خۆیان کە دروستی کردوون؟!) وەك دەب ینین شوانەکە هەر لەو شتانەی کە لەبەردەستی خۆیدا هەن بەڵگە بۆ کابرای فەیلە سووف دێنێ تەوە،

(1) دیارە ئەو شوانە عەرەب بووە، یان بەسەرهاتەکە بە عەرەبی تەرجەمە کراوە.

بۆچی؟! چونکە بەڵگەکە بەڵگەی عەقڵێکی فیطرییە ،عەقڵێکی سەلیمو خوارِسك.

* جارێکی دی کۆمەڵە کەسانێکی بەحیساب زانا کە لە بوونی خوادا دوودڵ و بەگومانن، بەلای (پیرەژن)ێك دا تێدەپەڕن کە تەشی دەرِێسێ، لێی دەپرسن: پورێ گیان تۆ برِوات بە بوونی خوا هەیە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: ئەدی چۆن، بەڵێ خوا هەیەو ئیمان و برِوام پێی هەیە! ئەوانیش دەڵێن: جا تۆ بەڵگەت لەسەر بوونی خوا چیە؟ ئێمە پێمان وایە کە ئەم ئاسمان و زەوی و بوونەوەرە هەر لەخۆیەوە پەیدابووەو هەیە و دەسوورِێ و پێویستی بە کەس نیە، پیرەژن دەڵێ: رِۆڵەگیان سەیری ئەم تەشییەی من بکەن؟! جا دەیسوورِێنێ و دەڵێ: ئێوە دەزانن ئەم تەشییە بۆ چی دەسوورِێ؟ ئەوانیش دەڵێن ئەوە دیارە تۆ دەیسوورِێنی! پاشان پیرەژنەکە تەشیەکە رِادەگرێ و چی دی نایسوورِێنێ و دەڵێ: ئەدی بۆ چی ئێستا وەستاوەو ناسوورِێ؟! ئەوانیش دەڵێن: لەبەرئەوەی کەس نیە بیسوورِێنێ! ئنجا پیرەژنەکەش پێیان دەڵێ: باشە تەشییەك ئەگەر (پیرەژن)ێکی وەك من بێ دەستەڵات نەیسوورِێنێ بۆ خۆی نەسوورِێتەوە، ئەدی چۆن عەقڵتان رِێگا دەدات کە ئەم بوونەوەرە، ئەم دنیاو ئەرزو ئاسمان و خۆرو مانگە، بەبێ ئەوەی کە سێك خاوەنی بێت، لەخۆیەوە بسوورِێ و بخولێتەوەو بێت و بچێ؟! دیارە ئەوانیش زاریان دەبێتە تەڵەی تەقیو!

* دەگێرِنەوە، لە سەردەمی (أبو حنيفة)دا رِەحمەتی خوای لێ بێت کۆمەڵێك لە زانایانی هیندستان دەچن بۆ بەغدا، داوا لە خەلیفەی

عەبباسی ئەو سەردەم دەکەن کە دەمانەوێ لەبارەی بوونی خواوە لەگەڵ یەکێك لە زانایانتان قسەو گفتوگۆ بکەین، خەلیفەش ئەبووحەنیفەیان بۆ دیاری دەکات، کە وێڕای شارەزاییەکی زۆر لە شەریعەتدا زۆریش عاقڵ بووە، ئەبوو حەنیفە دەچێ بۆ لایان. بەڵام دوای ئەوەی ماوەیەك لە مەوعید دوادەکەوێ، دەڵێن: بۆچی لە مەوعیدو کاتی دیاریکراوی دانیشتن شتێك دواکەوتی؟! ئەویش دەڵێ: شتێکی زۆر عەجایب و سەرسوڕهێنەرم بینی، بۆیە دواکەوتم، دەڵێن: چی بوو؟! دەڵێ: لەوبەری ڕووباری دیجلە بەلەمێك خەڵکی دەهێنا بۆ ئەم بەرەو لەم بەرەوە دەیبردنەوە بۆ ئەوبەر بێ ئەوەی سائیقی هەبێ و کەس لێی بخوڕێت. ئەوانیش ڕوو لە خەلیفە دەکەن و دەڵێن: دەبوایە کە سێکی عاقڵ و خاوەن شعوور بۆ ئەوە دیاری بکەی کە قسەو گفتوگۆمان لەگەڵ بکات، چونکە وادیارە ئەم کابرایە عەقڵی تەواو نییە! چۆن بەلەم هاتوچۆ بۆ ئەمبەرو ئەوبەر دەکات و خەڵك دەپەڕێنێتەوە بەبێ سائیق و بێ ئەوەی کەس بیجووڵێنێ و لێی بخوڕێ، شتی وا مەحاڵە! ئەبووحەنیفەش دەڵێ: باشە چۆن شتی واتان پێ مەحاڵە، بەڵام ئەو زەوییەی ئێمە لەو ئۆقیانووسەی هەوادا بەو هەموو خەڵکەوە کە هەڵی گرتوە چۆن ئاوا دەخولێتەوەو دێت و دەچێ و خاوەنێکی نیە کە هەڵی سووڕێنێت و مشووری لێ بخوات؟!

جا لەراستیدا ئەوە کە (هەموو پەیداکراوێك پەیداکەرێکی هەیە)، دەتوانین هەزارویەك نموونەی لەسەر بێنینەوە، یەکێك لەو نموونانە: تۆ

گوڵێکی نایلۆنی دەستکرد دەبینی دڵنیای کە لەخۆوە دروست نەبووەو کارساز(صانع)ێکی هەیە، ئەدی بۆچی گوڵێکی خواکرد کە و پڕای نەشونماو ژیان تێدا هەبوون، لە جوانی و ڕەونەقیشدا لە گەڵ گوڵە نایلۆنەکە ئاسمان و ڕێسمانیان بەینە، کەچی ئەو گوڵە خوارسکە دەبی ڕێی تێ بچێ  بەلای بابای خوانەناسەوە- کە بەبێ خاوەن و هەر لەخۆیەوە ڕوابێت؟!!

## دوو - ڕێکوپێکی بەبێ ڕێکخەر نابێ (لا نظام بلا مُنَظِّم):

ئەمیش یەکی دیکەیە لە یاسا عەقڵییە ڕوونەکان، جا با سەرنج بدەین چۆن چۆنی دەکرێتە بەڵگەی سەلماندنی بەدیهێنەرایەتی خوا؟ جارێ ئەگەر ئینسان سەرنجێکی سەرپێی بداتە ئەم بوونەوەرە بە ئاسمانەوە، بە مانگ و خۆرەوە، بە دەریاکانی دەوری زەوییەوە، بە چیاکان و ئەو هەوایەی دەوروبەری زەوییەوە، بە هەرچی کە لەسەر زەوی هەیە لە گڵ، لە کانزایەکان، لەڕووەك و دارو درەخت و گیاوگوڵ، لە گیاندارانی جۆراوجۆر، لە هێزی کێشندە کە زەوی شتەکانی پێ بەخۆیەوە چەسپاندوون، هەروەها کە زەوی بە دەوری خۆی و بە دەوری خۆردا دەخولێنێتەوە، لە ئاوی شیرین و زولاڵ و کانی و سەرچاوەکان... هتد.

کاتێك ئینسان سەیری بوونەوەرو زەوی دەکات بەم شێوەیەی دێتە پێش چاو: وەك کۆشکێك یان ئوتێلێك کە ئامادەکراوە بۆ پێ شوازیکردن لە میوان و خەڵك کە بێن تێیدا نیشتەجێ بن و تێیدا بژین و هەر چی

پێداویستی ژیانیانە لەوێدا ئامادەکراوە! ئەم دنیایەش بە هەمان شێوە شتێك نیە کە ئینسان پێویستی پێی بێت لەم سەرزەوی یەدا نەبێت، هەر لە جێگـــەو رێ گاوە بۆ گرە، هەتا بەرگ و پۆ شاك، خواردن و خواردنەوە... هتد، ئنجا ئێستا با تۆزێك وردتر سەرنج بدەین، داخۆ خوای بەبەزەیی چی لە کۆشکی دنیادا بۆ مرۆڤ دروستکردوە:

1) رۆژێکی ڕوون کە بتوانێ کارو کەسابەتی تێدا بکات.

2) شەوگار کە بتوانێ پشووی تێدا بدات.

3) هاوسەرێك کە پێکەوە خێزان دروست بکەن و بەهۆی یەکدی یەوە ئارامی و ئۆخژنیان بۆ بێت و زاوزێ بکەن و درێژە بە وەچەی ئینسان بدەن لەسەر زەوی.

4- (خۆر) کە بە سەخاوەتەوە تیشکی دەداتێ، گەرمی دەداتێ، بەلاّم ئەو تیشك و گەرمییە وانیە کە ئەو شتانەی لەسەر زەوین هەلّیان بپڕووکێنێ و واش نیە کە هێندە کەم بێ سەرزەوی ببە ستێ، وا تە بەشێوەیەك نیە کە ئینسان لەسەرمان ڕەق بێتەوە، یان لە گەرمان بسووتێ، خۆ ئەگەر خۆر یەك ئەندازەی کەم نزیکتر بووا یە ئەوە هەموو شتێك دەسووتا، وە ئەگەر یەك ئەندازەی کەم دوورتر بووا یە هەموو شتێك دەیبەست، ئەگەر ئەندازەی دووری خۆر لە زەوی لە هەموو شوێنەکانیدا بە ئەندازەی دووری لە بە ستەلّەکی سەروو و خواروو بووایە ئەوە ژیان لەسەر زەوی نەدەما، یان ئەگەر ئە ندازەی

نزیکی خۆر وەك هێڵی نێوەڕاست یان نزیکتریش بووایە بێگومان هەموو شتێك دەسووتا و ژیان تێكدەچوو.

5- (مانگ) كە بەدەوری زەویدا دەخولێتەوەو هەڵكشین و داكشینی دەریاكان(المدّ والجزر) پەیوەندی بە مانگەوە هەیە، دیارە مانگ ئەگەر لەو مەسافەیەی ئێستای لە زەوی دوورتر بووایە رەنگە هەڵكشان و داكشان هەر دروست نەبووایە، وە ئەگەر نزیكتر بووایە هەڵكشان و داكشانەكە زۆر زیاتر دەبوو، ئەوكاتەش ئاوی دەریاكان زەرەروزیانی گەورەیان لە خەڵك و دانیشتووانی كەنار دەریاكان دەداو دایدەپۆشین!

6- (هەوا)، هەوا (با)ش هەر ئەوە نیە كە ئێمە لەكاتی هەناسەداندا هەڵی دەمژین، بەڵكو (با) بۆ دارودرەخت و گژوگیا پێویستە كە ئێمە ئۆكسجینەكەی هەڵدەمژین و ئەوانیش دووەم ئۆكسیدی كاربۆنەكەی، ئنجا (با) هەر ئەوەندە دەورەش نابینێ، بەڵكو بۆ متوربەكردن(تلقیح)ی دارودرەخت، بۆ ڕامالێنی پیسی و بۆگەنی، بۆ هێنانی هەورەكان كە بەبێ با (هەوا) هاتوچۆ ناكەن. ئنجا بۆ بینین و بەرچاوڕوونی، چونكە لەو شوێنانەدا كە هەوای لێنیە یان كەمە لەبەر تەمومژو تاریكی هیچ نابینرێ.

7- (ئاو)، دەبینین كە (3⁄4)ی زەوی بە (ئاو) داپۆشراوە، ئاوی دەریاكان، ئنجا ئاوی دەریاكانیش سوێرە تا بۆگەن نەبن، پاشان لەگەڵ سوێریش دا هەمیشە هەڵكشان و داكشانیان هەیە و

دەجووڵێن، ئنجا ئەو ئاوە شیرین و زوڵاڵەی کە دەیخۆینەوە، لە ئەسڵدا بوونی نیە، بەڵکو لە ئاوە سوێرەکانەوە پەیدا دەبێ و خوای پەروەردگار بۆمان دەپاڵێوێ، تیشکی رۆژ لێی دەدات و دەیکات بە هەڵم و خوێیەکەی بەجێ دەمێنێ، چونکە قورسە، ئەوەی دیکەش بەرز دەبێتەوەو دەبێ بە هەڵم و بایەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن و دەبێت بە هەور، پاشان لە ئەنجامی ساردیدا گەردە هەورییەکان لێك نیزیك دەبنەوەو بۆ لای یەك دەکشێن و دەبن بە دڵۆپە و بە شێوەی تەرزە یان بەفر یان باران دەبارێت و بە شیرینی و بە زوڵاڵی دێتە بەردەستمان!

بەڵێ بەڕێزان!

ئەم بوونەوەرە ئەگەر هەر بە شێوەیەکی سەرپێیی سەرنجی بدەی و زۆر بە قووڵیی و وردیشەوە نەبێ، دەزانی کە وەك کۆشکێك وایەو سەرجەم پێداویستییەکانی ژیانی تێدا ئامادەکراون و ئینسان هەرگیز پەکی لەسەر هیچ شتێك ناکەوێ و بە ئەندازەی ئەوە کە دونیا قەرەباڵغ دەبێ و ژیان بەرەو پێش دەچێ خوای کاربەجێ نیعمەتی دیکە بۆ مرۆڤ دەرەخسێنێ و ئینسان رۆژ بۆ رۆژێ پەی بە نهێنییەکانی بوونەوەر دەبات و نیعمەت و پێداویستییە هەڵگیراو و پاشەکەوتکراوەکانی نێو زەوی کە خوا تێیدا ئەمبار کردوون.. دەدۆزێتەوەو مەداری خۆییان پێ ساز دەکات.

ئنجا ئەگەر بێت و سەیری جەستەو لاشەی خۆمان بکەین، ئەویش هەروا بەشێوەیەکی ڕواڵەتی و سەرپێیی وا کە هەموو ئینسانێك بتوانێ

شتەكان هەست پێ بكات. هەڵبەتە ئێمە باسی ڕووح ناكەین كە شتێكی زۆر نهێنی و پەنهانەو تەنیا بەهۆی شوێنەوارەكانییەوە هەستی پێ دەكرێت، بەڵام بەڕاستی پەیوەندی نێوان ڕووح و جەستە شتێكی زۆر سەرسوڕهێنەرەو شایستەی لێ وردبوونەوەیە، بە هەرحاڵ ئەوە بۆ زانایان دەبێ، ئەوانەی كە زۆر ورد دەبنەوە، بەڵام تێوەڕامان و سەرنجدانی جەستە بۆ هەموو كەس دەبێ، جا سەرەتا با سەرنجێكی كەللە سەری ئینسان بدەین، دیارە تەنها ڕواڵەتەكەی بزانین چی دەبینین؟! كەللەسەری ئینسان چوار ئاوی تێدان، هەر ئاوە تامێكی تایبەتی هەیە، یەكیان سوێر، یەكیان تاڵ، یەكیان مزر، ئەوی دیكەشیان شیرینە، جا ئایا تۆ بەردێكت دیوە كە ئەوەندەی كەللەسەرێك بێت و چوار سەرچاوەی تێدابن و هەر كامێكیان ئاوەكەی تامێكی جیای هەبێت؟! بێگومان ئەوە بۆ هەموو كەسێك جێگەی سەرنجە! ئاوی نێو گوێ تاڵە بۆ چی؟! لەبەر ئەوەی كە ئەو شتانەی گوێ دەیانبیستێ كە دەنگە بێ سنوورەكانن لە ماوەی كەمتر لە چركەیەكدا دەیانبیستێ، كەواتە دەبێ گوێ هەمیشە كراوە بێت، چونكە ئەگەر لەو ماوە كەمەدا نەتبیست ئەوە دەنگە كە دەڕوات و تێدەپەڕێ، وەك دیتن نیە كە دیمەنەكان هەر لەبەر چاو بن و هەركاتێك بتەوێ دەتوانی سەیریان بكەیت، بەڵام گوێگرتن بۆ دەنگەكان وەك سەرنجدانی دیمەنەكان نیە، هەركاتێك ویستت بتوانی گوێ بگریەوە، نەخێر ئەوەی گوێت بۆ نەگرت یەكسەر تێدەپەڕێ، كەواتە دەبێ گوێ هەمیشە كراوەبێت، هەر بۆیەش خوای بەبەزەیی ماددەیەكی تاڵی تێدا

داناوە بۆ ئەوەی هەر زیندەوەرێك بچێتە نێوی بیكوژێ![1]

ئنجا ئاوی نێو چاو سوێرە، چونكە چاو زیاتر ماددەیەكی پیو (بەز)ە، شتی بەزو چەوریش ئەگەر لەنێو ئاوی سوێردا نەبێت بۆ گەن دەبێت و دەرزێت و بەكتریای پیسی تێدا پەیدا دەبێت، ئاوی نێو چاو بۆیە سوێرە تا هەمیشە (تعقیم)ی بكات و خاوێنی بكاتەوە لە تۆزو گەردو هەرشتێك كە دەچێتە نێویەوە.

ئاوی نێو لووت ترش و مزرە، لەبەرئەوەی كە ڕۆژانە ملیۆنەها غوبارو خۆڵ و میكرۆب لە ڕێگەی هەناسەوە بە كونەلووتدا هەڵدەمژرێ و دەچێــە نێو سییەكان، چونكە بەزۆری وایە كە هەناسە لە كونەلووتەوە دەدرێ، جا لەنێو لووتدا مووەكان دەیگرێنەوەو ئەو ماددە مزرەش زوو زوو دێت و تۆزو گەردو میكرۆبەكان دەكاتە ( چڵم) و پاشان زوو زوو ئینسان چڵمەكەی دەسڕێ، كە ئەو (چڵم)ە لە ئەسڵدا ئاوێكی لینج و مزرو زۆر ڕوونە، بەڵام بەهۆی ئەو میكرۆب و پیسییەوە ڕەنگی ئاوا زەردو شین و بۆر و تڵخ هەڵدەگەڕێت.

بەڵام ئاوی دەم شیرینە، بۆ ئەوەی ئەو پارووەی مرۆڤ دەیخوات لیكەكە شیرین و خۆشی بكات و تامی زیاتری لــێ بكات!

دیارە هەركام لەو چوار ئەندامەش وردەكاریی زۆریان هەیە، بەڵام من دەمەوێ لێرەدا تەنها شتە سەرەتاییەكان ئاماژە پێ بكەم.

---

(1) دیارە ئێمە لێرەدا تەنها باسی ئەو شتانەو ئەو لایەنانەی دروستكراوەكانی خوا دەكەین كە هەموو خاوەن عەقڵ و هۆشێك بتوانێ دەركیان بكات و لە باسێكی دیكەدا لە رووی وردەكاریی زانستییەوە قسەیان لەبارەوە دەكەین.

ئنجا ئەگەر سەیری دوو (لێو)ەكان بكەین كە شتێكی زۆر سادەن، بەڵام ئەگەر ئینسان لێوی نەبوایە شتێكی زۆر سەیرو دزێو دەبوو! خواردنی بەباشی بۆ نەدەخوراو قسەشی بۆ نەدەكرا! بەڵێ، (لێو) دەوری زۆری هەیە، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ﴾ (البلد-)، واتە: زمانێك و دوو لێومان بە ئینسان بەخشیوە! (عەلی كوڕی ئەبوو طالیب)یش خوا لێی ڕازی بێت، لەو بارەوە جوانی گوتوە: عجباً لهذا الأنسان، يسمع بعظم، ويبصر بشحم، ويتكلم بلحم واتە: ئینسان چەند سەرسوڕهێنەرە! كە بە ئێسقان دەبیستێ و بە بەز دەبینێ و بە گۆشت قسە دەكات!!

ئنجا با سەرنجی زمان و ددانەكان بدەین و هاوكاری و پەیوەندی نێوانیان، كە زمان بۆ خۆی دەورێكی سەرەكی دەبینێ، چونكە بە كەیفی خۆی دەجووڵێ، هەم بۆ هەڵگێڕو وەرگێڕی پاروو لە زارداو قوت دان و ئاودیوكردنی و فڕێ دانی و تفكردنەوەی، هەم بۆ قسەكردن و چۆنیەتی دەربڕینی سەرجەم پیتەكان بە هەموو جۆرو شێوازێك، جارێك بە سەری زمان، جارێك بە نێوەڕاستی زمان، جارێك بە ئەو پەڕی زمان و جارێكیش بە قەراغەكانی!

ددانەكانیش سەیر دەكەین سێ بەشن: بڕەرەكان (القواطع)و كەڵبەكان (الأنياب)و خڕێیەكان (الأضراس)، چونكە ئینسان ئەگەر شتێك بخوات سەرەتا دەبێ بە ددانەكانی پێشەوە (بڕەرەكان) بیپچڕێ، دوایی پێویستە قڵت قڵت و پارچەپارچەی بكات بە كەڵبەكانی، پاشان بە خڕێیەكانی

بیهارێ، جا ئەگەر خرێیەکان لەپێشەوەو بڕەرەکانی لەدواوە بوونایە بێگومان هیچی بۆ نەدەبڕدرا.

ئەگەر بێت و سەیری هەر ئەندام و پێکهاتەیەکی دی ئینسان بکەین، هەمووی جێگای تێوەڕامانو سەرنجدان و لێوردبوونەوەیە، لە هەموویدا ئەوپەڕی رێکوپێکی دەبینرێ، هەروەك لە تێکڕای ئەم بوونەوەرە پان و پۆڕو فراوانەدا بە وردو درشتییەوە ئەوپەڕی رێکوپێکی هەیە، کەواتە بە تەئکید ئەم بوونەوەرە پڕ وردەکاریی و رێکوپێکە خواو خاوەن و پەروەردگارێکی هەیە،چونکە هەرگیز (رێکوپێکی بەبێ رێکخەر نابێ)و بوونەوەریش ئەوپەڕی رێکوپێکی تێدایە.

**سێ - کەسێك شتێکی نەبێ پێی نابەخشرێ (فاقد الشيء لا يعطيه):**

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو یاساو بنچینە ژیرییانەی کە ناچارمان دەکەن دان بە بوونی خوادا بێنین، چونکە ماددە کە لە بەرچاومانە کەڕو کاس و بێگیانەو عەقڵ و هەست و شعوری نیەو ئیرادەو ژیان و قسەی نیە، ئەدی باشە ڕووەك کە نەشونومای هەیەو زاووزێی هەیە، وە گیانداران کە وێڕای نەشونوماو زاووزێ، چەندان غەریزەیان هەیەو جۆرێك لە هەست و شعوریان هەیە، ئنجا ئینسان کە وێڕای ئەمانە عەقڵی هەیەو ئیرادەی هەیە!

جا ئێستا بۆمان هەیە بپرسین: ئایا ئەو سیفەتە زیادانەی ڕووەك و گیانداران و ئینسان لەچیەوە هاتوون و لە کوێوە هاتوون، خۆ ماددە هیچ کام لەو سیفەتانەی نیە؟! ئنجا مادام بۆ خۆی شتێکی نەبێت چۆن

ئەو شتەی پێ دەبەخشرێ؟ مادده چیه؟! وەك زانا ـیانی فیز ـیا دە ـڵێن: ئەسڵی مادده دەچێتەوە بۆ گەردیلە (ذرة)و گەردیلەکان یەکەمین خشتی بینای ماددەن، گەردیلەش لە سێ بەشی سەرەکی پێك دێت، لە (نێوك) ئەویش بریتـ ـیە ـلە (پرۆ ـتۆن) و (ن ـیۆترۆن)، پرۆ ـتۆن بارگە ـیەکی (موجب)ی هەیەو نیۆترۆن بێ بارگەیە، وە لە دەرەوەکەشی (ئەلکترۆن) هەیە ـکە ـبە دەوری نێوکە ـکەدا دەخولێـ ـتەوەو ـئەویش بارگە ـیەکی (سالب)ی هەیە، کە لەگەڵ (پرۆتۆن)دا یەکدی کێش دەکەن.

جا ئەمانە پێکهێنەرە سەرەکیەکانی گەردیلەن، ئەگەرنا وێڕای ئەمان چەندان جۆرە تەنۆلکەی دیکەی بچووکیش هەن کە ژمارەیان لە سەد (100) زیاترە!

ئەو گەردیلەیە ئەلکترۆنەکەی (1837) جار سووکترە لە نێوکەکەی و ئەوە زانایانی ئەو بوارە لە سەری یە ـکدەنگن، وە ـئەو گەردیـ ـلە ـبەو بچووکیەیەوە وەك کۆمەڵەی خۆر وایە، خۆر چەند گەورەیەو چۆن زەوی و خرۆ ـکەکانی دی ـبەخۆیان و مانگەکانیـ شیانەوە ـبەدەوری خۆ ـیدا دەخولێنێتەوە، نێوکی گەردیلەش ئەلکترۆن یان ئەلکترۆنەکان ـبەدوری خۆیدا دەخولێنێتەوە، واتە کتومت وەك کۆمە ـڵەی خۆر وا ـیە! ئنـ ـجا گەردیلە ـیەك ـلە ڕووی ـقەبارەوە (1□100.000.000)ی سانتیمەترێکە، وە لە ڕووی کێشەوە، گرامێك بکەی بە ملیۆنێك ملیار ملیار بەش، ئنجا یەك بەشی بریتیە لە قورسایی گەردیلە! کە بە ژمارە ـئاوا دەنوو سرێ:

(1 1.000.000.000.000.000.000.000.000). ئا ئەوە خشتی یەکەمی (ماددە)یە، ئنجا لە چەند گەردیلەیەك (گەرد)یك[1] پێك دێت، گەردیلەکان جیاجیان و ئەگەر هەر یەك جۆرە گەردیلە هەبووایە، ماددە هەر یەك شت و یەك جۆر دەبوو، بەڵام تا ئێستا زیاتر لە (100) سەد توخم (عنصر) دۆزراوەتەوە، ئنجا ئایا توخمەکانی ماددە بۆچی جیاجیان؟! بەهۆی جیاوازی نێوك و ئەلکترۆنی نێو گەردیلەکانەوە، بۆ وێنە، (هیدرۆژین) یەك پرۆتۆن و یەك ئەلکترۆنی هەیە، بەڵام (هیلیۆم) دوو دووی هەیە، دوو پرۆتۆن و دوو ئەلکترۆن، (لیتیۆن) سێی هەیە، (بریتیۆم) چواری هەیە و... هتد.

کەواتە: جیاوازی توخمەکان بەهۆی جیاوازی جۆری گەردیلەکانەوە یەو خوای پەروەردگار وای دروستکردوون کە جیاجیا بن بۆ ئەوەی کە توخمی جیاجیایان لــێ پێك بێت!

کەواتە ماددە ئەوەیە کە نە عەقڵی تێدایە نە ژیان، نە دیتن و نە بیستن و نە قسەکردن و نە ویســـــت و ئیــرادەو نە هیچ، بەڵام باشە ئەو سیفەتە زیادانەی کە لە ڕووەك و لە گیانداران و لە ئینسانەدا هەن لەکوێوە هاتوون؟! دیارە ماددە بۆخۆی نینی، بۆیە ناچارین بڵێین لە دەرەوەی ماددە بۆ ماددە هاتوون و پێی بەخشراون.

بۆچی؟! چونکە هەر شتێك خۆی شتێکی نەبێت ناتوانێ ئەو شتە ببەخشێ. دەجا ماددە کە ژیانی نیە، عەقڵی نیە، ئیرادەی نیە، زانیاری و

---

(1) (گەرد) بە عەرەبی (جزئي) و بە ئینگلیزی مۆلیکۆل (Molecule)ە.

دیتن و بیستن و هەستی نیە، ناتوانێ ڕووەك و گیاندارو مرۆڤێك دروست بكات، خاوەنی كۆمەڵێك سیفەت بن كە لە خودی ماددەدا نین، بەڵكو عەقڵ ناچارمان دەكات كە بڵێین: خوایەكی بەدیهێنەرو پەروەردگار هەر كام لە ڕووەك و گیاندارو مرۆڤی دروستكردوون و ئەو سیفەتانەشی پێ بەخشیون كە لە خودی ماددەدا نین.

كەواتە یاسای: ‌هەر كەسێك و هەر شتێك شتێكی نەبێ ناتوانێ ئەو شتە ببەخشێ‌، بەڵگەیەكی دیكەی ڕوون و بێچەندو چوونی عەقڵییە لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریّتی خوا.

هەروەها لەو یاسا عەقڵییە فیطرییانەی كە هەموو ئینسانێك لە مێشكیدا هەن بریتیە لە:

### چـوار- هەر دروستكراوێك سیفەتی خاوەنەكەی تێدا دەدرەو شێتەوە (تتجلّی صفات الصانع في صنعه):

بۆ تیشك خستنە سەر چەمك و واتای ئەم یاسا عەقڵییە دەڵێین: شتێكی ئاشكراو ڕوون و بەڵگەنەویستە كە سیفەتی هەر دروستكەرو هەر خاوەن پیشەیەك لەو دروستكراوەی خۆیداو لەو پیشەیەی خۆیدا دەردەكەوێت.

بۆ نموونە: زانایانی ئیسلام ئەوانەی كە كتێبیان نووسیون و بەرهەمیان لەدوای خۆیان جێهێشتوون، هەركامێكیان مۆرك (طابع)و ڕێ ڕەوێكی تایبەتی خۆیان هەیە، بۆ وێنە: (النووي، ابن تیمیة،

الغزالي، ابن القيم الجوزية، سعيد النورسي، سيد قطب، حسن البنا، ابو الأعلى المودودي) خوا ليّيان خۆش بێ. هەركە سێك موماره سەی خوێندنەوەی كتێب و بەرهەمەكانی هەر كامێكيانی كردبێ هەر كە چاوی پێی كەوت، بە پێی شێوازو دارِشتن و تەعبيريان، يەكسەر دەزانێ كە ئەو كتێبە يان ئەو برِگەيە هی فلاّن زانايەيە، هەروەها هەر كارو پيشەيەكی دی سيفەتی خاوەنەكەی تێدا دەدرەوشێتەوە.

بەلّێ ئەمە قانوون و ياسايەكی عەقلّييەو ئينسان سيفەتی خاوەنی هەركارێك لە كارەكەيدا دەخوێنێتەوە.

جا ئايا ئێمە ئەگەر تەماشای بوونەوەر بكەين، سيفەتی كێی تێدا دەبينين؟! بوونەوەر بە وردو درشتييەوە، لە گەرديلەوە تا كەهكەشان (مجرّة)، لە زەوييەوە تا ئاسمان، لە (ئەميبا)وە تا ئينسان! ئەوەی كە لە بوونەوەردا بە خەتێكی درشت و روون دەيخوێنينەوە، بريتيە لە:

1- زانياری و شارەزايی بێ كۆتا.
2- حيكمەت و كارامەيی.
3- توانا و دەستەلاّتی بێ سنوور.
4- بەزەيی گشتگير.
5- بەخشندەيی و كەرەمی بێوێنە.
6- رێنيشان دانی هەموو دروستكراوەكان.
7- دابينكردنی پێداويستيەكانی هەر مەخلووقێك.

بەڵێ بەڕێزان!

هەر کەسێك بە هۆشیاریو بەویژدانەوە سەرنجی سەرلەبەری کائینات‌و بوونەوەر بدات، سەرجەم ئەو سیفەتانەو زۆری دی کەش لە سەر ڕووپەڕەکانی دەخوێنێتەوە، جا ئێستا دەپرسین: ئایا بێجگە لە خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار (سبحانه وتعالى) کە لە ڕێی پێغەمبەرانیەوە (عليهم الصلاة والسلام) خۆی بە ئێمە ناساندوەو باسی خۆی بۆ ئێمە کردوە، هیچ کەس‌و هیچ شتێکی دی کە هەیە کە ئەو سیفەتانەی پاڵدەینە لا کە بە خەتێکی ڕوون و درشت لەسەر ڕووپەڕی یەك یەکی دروستکراوەکان تۆمارکراون؟! بێگومان نەخێر ئەگەرنا کوا، کێیەو چیە؟!!

هەڵبەتە ئەم یاسا عەقلیە: (( هەر دروستکراوێك سیفەتی دروستکەرەکەی تێدا دەردەکەوێ)) کاتی خۆی (موسى)ش علیه السلام بەکاری هێناوە بۆ دەمکوتکردنی فیرعەون کاتێك کە لێی پرسیوە: جا ئەی مووسا پەروەردگارتان کێیە (ئەگەر من نیم!)؟! ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَى﴾ ( طه 49)، مووساش لە وەڵامدا فەرموویەتی: ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾(طه 50) . واتە فەرمووی: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو پاشان ڕێنمایی شی کردوە. واتە: خوای خاوەن و پەروەردگارمان کەسێکە کە کاڵای بوون (وجود ) بە باڵای هەموو دروستکراوێك پۆشیوەو لە دەریای نەبوون

(عَدَمْ) دەریهێناون و پاشان هەرکامێکیش شیانی ڕێنمایی کردوە کە بتوانێ ئەو ئامانجەی بۆی وەدیهێنراوە بیهێنێتە دی و ئەو ئەرکەی پێی سپێرراوە ئەنجامی بدات.

جا بەڕای من ئەم وەڵامەی (موسی) (علیه الصلاة والسلام) لە یەك کاتدا دوو نیشانەی پێ پێکاون:

یەکەم: وەڵامی فیرعەون دەداتەوە، کە تۆ خوا نی! خوا ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە، ئەدی ئەی فیرعەون تۆ چیت بەدیهێناوە؟!

دووەم: ئەی فیرعەون، تۆ بۆشت نیە داوای پەروەردگاریێتی (ربوبیة) و پەرستراویێتیی (الألوهیة)بەسەر خەڵکییەوە بکەیت، چونکە کەسێك بۆی هەیە پەروەردگاری خەڵك و فەرمانڕەوای خەڵك بێ کە بتوانێ ڕێگایان نیشان بدات و ڕێنماییان بکات، کە سێکیش مافی ڕێنیشاندانی خەڵك و مافی دیاریکردنی حەڵاڵ و حەرامی بۆ خەڵکی هەیە، کە دروستی کردبن، ئەویش تەنها خوای پەروەردگارو بەدیهێنەریانە، واتە (موسی) بەم ڕستە کورتە هەم وەڵامی ئەوەی دەداتەوە کە تۆ خوای خەڵك نی، وە هەم ئەو ڕاستیە شی پێڕادەگەیەنێ کە تۆ بۆت نیە بەندەکانی خوا بخەیە ژێر رکێفی خۆتەوەو حەڵاڵ و حەرامیان بۆ دیاری بکەیت و بەرنامەیان بۆ دابنێی!

بەڵێ خوای پەروەردگار هیچ شتێکی دروست نەکردوە کە ڕێی نیـ شان نەدابێت، وە ئێمە کە سەیری ئەم بوونەوەرە دەکەین، سیفەتەکانی خوای تێدا دەدرەوشێنەوە چونکە زاتی خوا لە سـیفەتەکانیدا دەدرەو شێنەوەو سیفەتەکانی خواش لە دروستکراوەکانیدا.

ئێـ ستاش ـبا ـبۆ ز ـیاتر ڕوونکرد ـنەوەی چۆنیەتی درەو شانەوەی سیفەتەکانی خوای ـبەرزو ـمەزن ـلە درو ستکراوەکانیدا دوو وێ ـنان بێنینەوە:

یەکەم: کۆرپەی مرۆڤـ لەسکی دایکیدا.

دووەم: ژیانی گیانداران و چۆنیەتی خواردن و زاوزێ و... هتدیان.

هەڵبەتە لێرەدا ئێـ مە ـهەر ـبە ـکورتی ـباس دە ـکەین و دەر ـفەتی درێژەپێدانمان نیە.

## کۆرپـــەی مرۆڤـ:

خوای پەروەردگار باسی دەکات، کە ئینسانم لە دڵۆپەئاو (نطـ فة)[1] دروست کردوە، پاشان بووە بە خوێنپارە(علقة) ئنجا بووە ـبە زار چووە گۆشت (مضغة)، دوای ئەوە بۆتە ئێسقان و بە گۆشت داپۆشراوە، ئنـ جا

(1) (نطـفة) لە زمانی عەرەبیدا بە دلۆ پە ئاو یان پرِیشکە ئاو یان تۆزە ئاوێکی کەم دەگوترێ، کە مەبەست پێی تۆو(منی)ی پیاوو ژنە، کە تۆزە ئاوێکە، بەڵام ئێستا وەك زاراوەیەك بۆ ئەو گیاندارە زۆر بچووکەش بەکاردێ کە کۆرپەی لێ دروست دەبێ و لە ئەنجامی یەکگرتنی حەیمەن (الحیوان المنوی)ی پیاو هێلکۆکە(بویضة)ی ئافرەتدا دروست دەبێ، کە دەتوانین بە کوردی بە (نطفة) بڵێین: (تۆویلکە) چونکە (نطفة) بەشێکی بچووك و کەمە لە تۆو(منی)ی هەر کام لە پیاوو ژن، نەك هەموو تۆوەکەیان منداڵی لێ دروست بێ‌وەك کاتی خۆی گومان دەبرا.

دوای چوار مانگ و زیاتر ڕووحی بەبەردا کراوە، وە وردەوردە سەرجەم ئەندامەکانی تەواوبوون و بۆتە کۆرپەیەکی ئامادە.

جا ئێستا با سەرنج بدەینە هەندێك حاڵ و باڵی دروستبوونی کۆرپە:

ئەو کۆرپەیە هەر لەو کاتەوە کە لە منداڵداندا جێگیر دەبێت، ئافرەت خوێنی حەیزی نایەت و دەوەستێت، بۆچی؟! چونکە ئەو خوێنە دەبێتە گۆمیلکەیەك لە خوێن و ئەو (نطفة)یە لەو خوێنەدا گەشە دەکات، پاشان کە ئەندامەکانی لێ پەیدابوون و گەورە بوو، دیارە هەر بەو کەمە خوێنە مەدار ناکات، بۆیە خوای پەروەردگار وای بۆ ڕەخساندوە کە ڕیخۆڵەیەك بە نێوکیەوە بڕوێت، کە پێی دەگوترێت پەتی نێوك (الحبل السري)، جا لە ڕێگای ئەو ڕیخۆڵەیەوە خۆراك بۆ نێو لاشەی ئەو کۆرپەیە دەچێت، ئەو ڕیخۆڵەیەش وەك زانایانی پزیشکی گەریی ( طب) دەڵێن: ئەو منداڵەی بەستۆتەوەو ئەوەندەش درێژ نیە کە لە گەردن و دەست و قاچی بئاڵێت، بەڵام مەجالیشی دەدات کە بجووڵێت لەنێو منداڵدانەکەدا، وەك ئەوانەی کە دەچن بۆ نێو هەوا (فضاء)و سەر مانگ چۆن دەبەسترێنەوە، ئەویش ئاوا بەستراوەتەوە! ئنجا ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە کۆرپە لە منداڵدانی دایکیدا سەری لە سەرەوەو پێیەکانی لە خوارەوەن، کەچی لەکاتی منداڵبووندا یەکسەر پێچەوانە دەبێتەوە، سەری دێتە خوارێ و پێیەکانی دەچنە سەرێ، دیارە ئەگەر ئەوکاتیش هەر وەك پێشدا بووایە منداڵ لەدایك نەدەبوو مەگەر بەنەشتەرگەریی (العملية الجراحية).!

پاشان دوای هاتنەدەرەوەی بە سەلامەتی، ئەو منداڵە یەک سەر یەك چریکەی لــێ بەرز دەبێتەوە، چونکە یە کەمجارە کە هەنا سە دەدات و کۆئەندامی هەناسەدانی دەکەوێتە گەڕ! ئنجا هەر کە لەدایك بەربۆوە، بەبێئەوەی کە هیچ کەس فێری کردبێت بەشێوەیەك دەزانێت مەمکی دایکی بمژێت کە هیچ کەسێك وا نازانێت! چونکە مەمك مژین، وەك زانایان دەڵێن، ئەویش هونەرێکی زۆر گەورەیە! پاشان ئەو خواردنەی کە لە مەمکی دایکیدا هەیە (شیــر)، هەموو پێداوی ستییەکانی ئەو منداڵەی تێدا هەیە، جگە لەوەش شیــری دا یك بەرگریی (منا عة) دەدات بەو منداڵە بۆ پارێزگاریی لــێکردنی لە میکرۆب و نەخۆشی!

### ژیــانی گــیانــداران:

بە هەمان شێوە ئەگەر سەیری جیهانی گیانداران بکەین، دەبینین کە هەر جۆرە گیاندارێك و زیندەوەرێك هەتا بچووکترو لاوازتر بێت، خوای بەبەزەیی وکاربەجێ ژمارەی زیاتر کردوون، وەك: بەکتریاو میکرۆ بەکان و کرم و زیندەوەرو مێش و مەگەزو... هتد. بۆچی؟! چونکە لاوازن و زوو زوو لەبەین دەچن وگیانداری دی دەیانخۆن، جا هەم بۆ ئەوەی ببنە خۆراکی ئەوان و هەم لە قەلاچۆو فەوتانیش پارێزراو بن، خوای زا ناو شارەزا ژمارەیانی هێندە زۆرو زەوەند کردوە بێجگە لە خۆی کەس نایزانێ!

ئنجا زیندەوەرو گیانداران هەتا بێهێزتریش بن، خواردنیشیان ئاسانتر بۆ دابین کراوە، بەڵام گیا ندار هەتا گەورەترو دڕ ندەتر ب یێت، هەم وەچە(نسل)ی کەمترەو هەم خواردنیشی بە زەحمەت ترە، جا ئایا بۆ چی

وەچەی کەمترەو زاووزێ کەمتر دەکات؟! ئەوە حیکمەتی زۆری تێدایە، ئێمە دەبینین لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن کە لەناو جەنگەڵەکاندا شێرێك یان دووان، پڵنگێك یان دووان کۆمەڵێك مامزو ئاسك یان گاو مانگا کێوی ڕاو دەنێن و بە ئاسانی دەیانگرن و دەیانخۆن، جا ئەگەر بە ژمارەی ئەو هەموو ڕەوە ئاسك و مامزو گاو مانگا کێوی یانە، شێرو پڵنگ هەبوونایە، بێگومان بە چەند ڕۆژێك گیانداری ئاوا بە ستەزمان لە دارستان و جەنگەڵەکان دا نەدەمان و بنبڕ دەبوون! بۆیە ژمارەی گیاندارە دڕندەکان هەمیشە کەمترەو بێهێزەکانیش ژمارەیان زۆر زۆرترە، کە هەم بەشی خواردنی دڕندەکانیش دەکەن و بەشی ڕاوکردنی ئینسانیش دەکەن کە کەڵکیان لێ ببینێت، وەبەشی مانەوەش دەکەن!

ئەوەی کە باسمان کرد هەر بۆ نموونەیە، ئەگەرنا ئەگەر بە وردی باسی ژیان و گوزەران و بژێووڕۆزی گیانداران و چۆنیەتی خۆپاراستنی بێهێزەکانیان و پەیداکردنی بژێوی دروستکردنی لانەو هێلانەو جێگەو ڕێگەیان بکەین، سەرمان لێی دەسوڕمێ! هەر لە باڵندەو ماسی و مارو کرم و مێش و مەگەزەوە بگرە هەتا چەندان گیاندارو دەعبای جۆراوجۆر کە تەنیا خاوەن و بەدیهێنەریان جۆرو ژمارەکانیان دەزانێ! لە ژیان و گوزەران و حاڵ و باڵی هەموویاندا زانیاری وحیکمەت و بەزەیی و بەخشندەیی و سەرجەم سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی خوا دەدرەوشێنەوە، چونکە هەر کامیان فێرکراوەو ڕێنمایی کراوە کە چۆن چۆنی بژیەت و

بژێوو جێ و ڕێ پەیدا بکات و بەرگری لەخۆی بـ کات و زاوزێ و وەچە خستنەوەی بەردەوام بێ.

کەواتە: ئەگەر بە وردی سەرنجی بوونەوەر بدەین لە هەر شتێکیدا سەرجەم ناوو سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی خوای تاك و پاك دەدرەوشێتەوەو بێجگە لەخواش شوێنەوارو شوێن پەنجەو سیفەتی هیچ کەس و هیچ شتێکی دیکە بەهیچ دروستکراوێکی یەوە نابینرێ!

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ (لقمان 11)، واتە: ئا ئەوە دروستکراوی خوایە، دەکوا پیشانم بدەن غەیری وی چی یان دروستکردوە! بەڵکو ستەمکاران لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

## پێنج مشوور لێخوران بەڵگەیە لەسەر بوونی مشوورخۆر (التدبیر دلیل علی وجود مدبر) :

ئەمیش بنچینەیەکی دیکەی عەقڵییەو بەڵگەیەکی دیکە لە سەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریتی خوا پێکدێنێ، جا هەرچەندە ئەم یاساو بنچینەی پێنجەمە لەوەی پێ شوویەوە نێزیکەو خاڵی هاوبەش و پێکگەیشتنیان زۆرن، بەڵام لەیەکیش جیان.

دیارە ئەم بنچینەیەش وەك هەرکام لە بنچینەکانی پێ شوو دەگونجێ نموونەی زۆر و زەوەندی لەسەر بێنینەوە، بەڵام ئەو دەرفەتە نییە، تەنیا یەك نموونە دەخەینە ڕوو:

مشوور لێ خورانی ژیانی مرۆڤ بە عەمبارکردنی کانزاو سووتەمەنییە جۆراوجۆرەکان لە بن زەویدا:

خوای بەبەزەیی و مشوورخۆر (عزّوجل) بە هەزاران و بگرە ملیۆنان ساڵ پێش نیشتەجێکردنی ئادەم و حەووا (علیهما والصلاة السلام)و وەچەکەیان لەسەر خڕۆکەی زەوی، هەر چی کە زانیویەتی ژیان و گوزەرانیان پێویستی پێی دەبێ و پەکی لەسەری دەکەوێ، لە جۆرەها کانزا وەك: ئاسن، پۆڵا، مس، فافۆن، زێڕ، زیو، پلاتین... هتد، وە لە جۆرەها سووتەمەنی وەك: خەڵووزی بەرد، نەوت، غاز.. بۆی لەژێر زەویدا عەمبارو ئامادە کردوون، وەك فەرمووویەتی: ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاء لِّلسَّائِلِينَ﴾ (فصلت-١٠) واتە: وە (خوا- شاخەکان لەسەر زەوی لەنگەر پێگرتوون ودایکوتاون، وە پیتزو بەرەکەتی تێخستوە، وە بژێو- و پێداویستی یەکانی بۆ داواکاران لەماوەی چوار ڕۆژ -قۆناغ-ان دا بە شێوەیەکی ئەندازەگیری کراوانە تێدا داناون.

ئاشکراشە کە خوای کاربەجێ و زاناو شارەزا زانیویەتی کە هەزاران ساڵ مرۆڤ لەسەر خڕۆکەی زەوی دەژی و نە پێویستی دەبێ و نە تواناشی دەبێ کە گەلێك لەو کانزا (معدن)و سووتەمەنی (وقود)یانەی بن زەوی بەکاربێنێ و بەوشتانەی کە لەسەر ڕووکاری ڕواڵەتی زەوین و بە ئاسانی دەستی دەیانگاتێ مەداری ژیان و گوزەرانی خۆی ساز دەکات. بەڵام بێگومان زانیوشیەتی کە ڕۆژگارێك دێ سەرزەوی قەرەباڵغ دەبێ و

ژیانو گوزەرانی بەرەوپێش دەچێ، قەیرانی سووتەمەنیی (أزمة الوقود)و قەیرانی کەرەسەی خاوی پیشەسازی، یەخەی پێ دە گرێو تەنگی پێ هەڵدەچنێ و ئەوشتانەش کە لەسەر ڕووکاری زەوین بە تایبەت جەنگەڵ و دارستانەکان زوو کۆتاییان پێ دێ و بنبڕ دەکرێن، بۆیە خوای بەخشەرو کاربەجێ هەموو ئەوپێداویستی یە یەدەگ (إحتیاطي)انەی لەنێو زەوی‌دا بۆ عەمبار کردوون‌و بۆ هەڵگرتوون، تاوەکو هەرکات ئەو سووتەمەنییەی لە دارو درەخت و جەنگەڵ دا بین دە کرێ تەواوبوو، جۆرەکانی دیکەی سووتەمەنی وەك نەوت و غازو خەڵووزی بەردو هەڵم‌و کارەبا وزەی ئەتۆمیی ئەو کەلێنە پڕ بکەنەوە، هەر کامێکیان لە قۆناغی خۆیانداو، کاتێکیش ژیانی بەرەو پێش چوو و ئەو ئامرازانەی کە لە چاخی بەردی (العصر الحجري)دا لە بەردو ئێسقان و قۆچ دروستی دەکردن مەدارییان ساز نەکرد، ئاسن و پۆڵاو ... هتد لەبەردەست بێت بۆ دابین کردنی ئامێرو وەسیلەی دیکەی گونجاو لەگەڵ پەرەستاندنی ژیان و گوزەران و پێداویستییەکانی!

جا ئێستا دەپرسین: ئایا ئەو تەدبیرکردن‌و مشوور لێخواردنەی ژیان‌و گوزەرانی مرۆڤ لەسەر زەوی و هەڵگرتن و ئەنبارکردنی ئەو هەموو کەرەسەو پێداویستییانەی قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ژیانی، درەوشاوەترین بەڵگە نیە لەسەر بوونی خوای بەبەزەیی و مشوورخۆر؟!

## 2- چۆنیەتی شایەدیی دانی زانیاری لەسەر بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتی خـوا:

ئەم بابەتەش لە دوو خاڵی سەرەکیدا دەخەینە ڕوو، واتە لە دوو خاڵاندا باسی چۆنیەتی شایەدیی دانی زانیاری لەسەر بوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار دەکەین:

**خـاڵی یەکـەم: (بوونـەوەرو دەوروبـەر)**

**ئاسـمان:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ **أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ** ﴾ (ق 6) واتە: ئایا سەرنجی ئاسمانیان نەداوە لە سەرووی خۆیانەوە، چۆن بینامان کردوەو ڕازاندوومانەتەوەو هیچ کەلێن و نارێکوپێکییەکی تێدا نیە!

ئێستاش بۆ ئەوەی شتێك لە بارەی گەورەیی وگرنگیی و فراوانی ئاسمان بزانین و ئەو فەرمانەی خوا جێبەجێ بکەین، باسەیری فراوانی و زەبەلاحی بوونەوەر[1] بکەین، بەڵام سەرەتا دەڵێین: مەبەستمان لە بوونەوەر هەموو ئاسمان نیە، بەڵکو مەبەستمان تەنیا ئەو گۆشەیەتی

(1) پێشتریش باسمان کرد کە وشەی بوونەوەر(الكون) تەنیا تەعبیر لە بەشێکی کەمی ئاسمان، بگرە ئاسمانی یەکەم دەکات، کە بریتیە لەو بەشەی هەتا ئێستا مرۆڤ لە ڕێی تەلسکۆبەکانەوە پەی پێ بردوە.

کە ئینسان بەو ئامرازانەی ئێستا لەبەردەستی دان پەی پێ بردووەو ناسیویەتی.

خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاء بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ (الذاريات ) واتە: ئاسمانمان بەهێز دروست کردوە ( یاخود بەدە ستی خۆمان دروستمان کردوە)، وە ئێمە ئاسما نمان فراوان درو ست کردوە (یاخود ئاسمان فراوان دەکەین).

جا ئەگەر واتای دووەمیان بگرین، ئێستا بیـردۆزە (نظرية)یەك هە یە دەڵێ: بوونەوەر بەردەوام لەکشان دا یەو فراوان دە بێ و وەك فوودا نە (میزڵدان)یەکی کە چەند نوختەیەکی لەسەر بکەی دوایی تا فووی تێبکەی وردەوردە نوختەکان لەیەك دوور دەکەو نەوەو تاکو قەبارەی گەورەترو فراوانتر بێت نوختەو خاڵەکان زیاتر لە یەك دوور دەکەو نەوە، زانایان دەڵێن بوونەوەر بەم شێوەیەیەو ڕۆژ بۆ ڕۆژ فراوان دەبێو دەکشێ، جا ئەوەی ئەم ئایەتە ئاماژەی پێکردوە، ئەگەر بیردۆزەکە ڕاست دەر چوو ئەوە ئایەتەکە پێشتر فەرموویەتی، ئە گەر ڕا ستیش دەرنە چوو ئەوە ئایەتەکە مانای دی هەیەو پێویستی بەوە ن یە بە دوای بیردۆزە کانی بخەین، چونکە ئایەتەکە وێڕای ئەم مانا دووەمەی باسمان کرد، ئەوەش دەگەیەنێ کە: ئاسمانمان فراوان دروست کردوە! دیارە ئەوەش لا یەنێکی ئیع جازی قورئا نە کە ڕا ستییەکانی بێکۆ تاو بێ سنوورن و ئایەتەکانیشی ماناو چەمکی جۆراوجۆر هە ڵدەگرن! وە لە ڕا ستیدا زانیاری (علم) لە کوێ بوە ستێ قور ئان لەوێوە دە ستی پێکردوەو

هەمیشە قورئان لە پێش زانیارییەوەیە، چونکە قورئان فەرمایشتی خوایەو لە زانیاری بێ سنووری خواوە سەرچاوەی گرتوە، بەڵام زانیاری وەسفی دروستکراوەکانی خوا دەکات، جا جاری وایە زانیاری بەراستی وەسفیان دەکات کە لەگەڵ فەرمایشتی خوا دەگونجێ و تێکدەکاتەوە، جاری واش هەیە بە هەڵە وەسفیان دەکات و ئەوەی دەیلێ هەر بیردۆزەیەکەو نەبۆتە ڕاستی یەکی زانستی، بۆیە لە فەرمایشتی خوا بەجێ دەمێنێ!

بۆ ئەوەی فراوانی بوونەوەرمان بێتە بەرچاو، با لە نیزیکترین خڕۆکەوە دەست پێبکەین کە (مانگ)ە، کە بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، مانگ (222.000) هەزار تا (253.000) هەزار میل لە زەوی یەوە دوورە،[1] چونکە جاری وا هەیە نزیك دەکەوێتەوەو جاری وا هەیە دوور. بەڵام خۆر (93.000.000) نەوەدو سێ ملیۆن میل، یاخود (150.000.000) سەدو پەنجا ملیۆن کیلۆمەتر لە زەوی یەوە دوورە.

ئنجا هەر لە کۆمەڵەی خۆردا (زوهرە) کە لە کۆمەڵەی خۆردا نێزیکترین خڕۆکەیە لە زەویەوە، ئەویش (26.000.000) بیست و شەش ملیۆن میل لە زەویەوە دوورە، (مەریخ)یش کە یەکێکی دیکەیە لە خڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر، (34.000.000) سی وچوار ملیۆن میل لە زەویەوە دوورە.

---

(1) الفلك العام، لاپەڕە 176.

هەرچەندە خۆر بۆ چاوی ڕواڵەتی وادیارە لە ئەستێرەکان دوورتر بێت، بەڵام لەراستیدا نیزیکترین ئەستێرەیە لە ئێمەوە، لە ئەستێرەکانیش جیا نیەو هەر یەکێکە لەوان، بەڵام لەبەر نێزیکتـر بوونی لە ئێمەوە ئاوا بە حەجمێکی گەورەو بە تیشکێکی زۆرەوە دیارە.

ئنجا لەدوای (خۆر) نێزیکترین ئەستێرە لە ئێمەوە (260.000) هەزار هێندەی دووری خۆر لە ئێمەوە دوورە، واتە (260.000 × 93.000.000) ملیۆن میل، بکە، ئنجا دەکاتە دووری نێوان خۆرو ئەو ئەستێرەیە کە نیزیکتـرین ئەستێرەیە لەدوای خۆر لە ئێمەوە.

تیشکی خۆریش لە چرکەیەکدا (186.000) میل دەبڕێت کە دەکاتە (300.000) هەزار کیلۆمەتر، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو تیشکە بە (8) هەشت خولەك (دقیقە) دەگاتەلای ئێمە.

کەهکەشان (مجرّة)ی (کاکێشان) نیزیکترین کەهکەشانە لە زەویـیەوە، کە لە ئاسماندا سپی دەچێت، بۆیەش ئەو ناوەی لێیە، چونکە خەڵك لە دێر زەمانەوە پێیان وابووە کە ڕێیەکەو (کا)ی پێدا کێشراوە، ئەوە لە کوردەواریدا، هەڵبەتە لەنێو نەتەوەکانی دیکەشدا بە هەمان شێوە ناوێکی لەو بابەتەی هەیە، عەرەب پێی دەڵێن (مجرّة درب التبّان) واتە کەهکەشانی ڕێی کاکێشان، فارس پێی دەڵێن: (راهی شیری) واتە ڕێگای شیری، ئینگلیزیش پێی دەڵێن: Milk way بە هەرحاڵ کۆمەڵەی خۆر، واتە: خۆر لەگەڵ کۆمەڵەکەی کە (9) نۆ خڕۆکەن لە گۆشەیەکی دووری ئەو کاکێشانەیەدایە!

ئەو کەهکەشانەش هەندێك لە زانایانی گەردوونناس دەڵێن (100.000.000) سەد ملیۆن ئەستێرەی تێدایە، کە قەبارەیان وەك ئەم خۆرەی خۆمان و گەورەترو بچووکترن. هەندێکیشیان دەڵێن (200.000.000) دووسەد ملیۆن ملیۆن ئەستێرەی تێدایە، واتە (200.000) دوو سەد هەزار ملیار(200.000.000.000.000)!(1)

ئنجا بۆ ئەوەی قەبارەی ئەو کەهکەشانە نیزیکەی خۆمان بزانین دەڵێین: تیشك بە(100.000) سەد هەزار ساڵ لەوسەری کاکێشانەوە دەگاتە ئەمسەر، واتە دەبێ تیشکێك بۆ ماوەی(100.000) سەد هەزار ساڵ بڕوات ئەوجا لەمسەرەوە دەگاتە سەرەکەی دی،گوتیشمان کە تیشك لە یەك چرکەدا (300.000) کیلۆمەتر دەبڕێت! ساڵی تیشکیش بریتیە لە (300.000) کیلۆمەتر کە لە چرکەیەکدایە (×)ی (60)ی بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە تیشك لە دەقیقەیەکدا چەند دەبڕێ، دوایی (×)ی (60)ی دی بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە لە کاتژمێرێکدا چەندە، دوایی (×)ی (24)ی بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە لە شەوو ڕۆژێکدا چەندە، دوای (×)ی (365)ی بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە لە ساڵێکدا چەندە، کە دەکاتە

(1) کتێبی (بمن من بگـو چـرا؟!) بەرگی (1) لاپەڕە 105 کە تەرجەمەی کتێبی: (Tell me why?) یەو هی: ئارکد لئۆکۆم)ە و چوار بەرگی قەبەیە.

(10.000.000.000.000) دە مليۆن مليۆن كيلۆ مەتر، ياخود (6.000.000.000.000) شەش مليۆن مليۆن ميل.[2]

نێزيكترين كەهكەشان (مجرّة) (700.000) حەوسەد هەزار ساڵى تيشكى لە ئێمەوە دوورە، ئنجا زانايان دەڵێن: تا ئێستا (500.000.000) مليۆن كەهكەشان دۆزراوەتەوە، ئەوە هەندێك لە زانايان وا دەڵێن. ئەگەر نا هەندێكى ديكەيان دەڵێن زۆر زۆريش لەوە زياتر دۆزراونەوە، ئنجا ئەوەى كە زۆربەى زانايان لەسەرى يەكدەنگن، بە تايبەت ئەوانەيان كە بڕوايان بە بوونى خواى بەرزو مەزن هەيەو بە تايبەتى تر ئەوانەيان كە مسوڵمانن، دەڵێن: واپێ دەچێ كە هەرچى كە لێمانەوە ديارەو بە تەلسكۆبەكان دەيبينين هەمووى لە سنوورى ئاسمانى يەكەمدا بێت و هەتا ئێستا ديار نيەكە كۆتايى سنوورى ئاسمانى يەكەم كوێيە! ئنجا هەر خوا دەزانێ چەندى دى دەڕوات تا دەگاتە سنوورى ئاسمانى يەكەم، ئنجا لە سەرووى ئەويشەوە شەش ئاسمانەكانى دى لە سەرووى ئەوانيشەوە عەرش و درەختى كۆتايى (سدرە المنتهى)و ئەوەى كە خواى شارەزا باسى كردوەو ئەوەى كە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە شەوى (ميعراج)دا بينيويەتى!

جا بەڕێــــزان!

---

(2) قصة الكون من السديم الى الأنسان/ د.محمد جمال الدين الفندي ومحمد يوسف حسن.

ئەوەی ئاماژەمان پێی کرد لە زەبەلاحیی و فراوانی بوونەوەر تەنیا بە شێوەیەکی خێراو سەرپێی بوو، بەلاَم لە گەلَ ئەم هەموو فراوانییەی بوونەوەردا، زانایانی گەردوونناس دەلَێن: ئایا دەگونجێ ئە ستێرەیەك بە ئەستێرەیەکی دی بکەوێت، چ جای کەهکەشانێك بە کەهکەشانێکی دی؟!

زانایان دەلَێن: نەخێر بەلَکو ئەو ئەگەرە سفرەو هەرگیز ڕووداوێکی وا ڕێی تێناچێ! چونکە دەلَێن: ئەم بوونەوەرە بە شێوەیەك بنیات نراوە کە ئەوپەڕی وردەکاریی تێدا رەچاوکراوە، هیچ کام لە خرۆ کەو ئە ستێرەو کەهکەشانەکان لە خولگە( مدار)ی خۆ یان دەرنا چن، وەك خوای بالاَدەست فەرموویەتی: ﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾(یس-40)وا تە: وە هەر کامێکیان لە سوڕگەی خۆ یدا مە لە دە کات و دە سووڕێتەوە، بێئەوەی لەو خولگەوسوڕگانەی خۆیان دەربچن و لە ئەنجامدا لە یەك بدەن!

جا بەڕێـــزان!

بەڕاستی ئەو مەسەلەیە زۆر جێی سەرنج و ڕاما نە: ئێ مە سەیر دەکەین کە شتە دە ستکردەکانی ئین سان لە سەیارەو فڕۆ کەو شەمەندەفەرو کەشتی، لەگەلَ ئەو هەموو جادەو ڕێگاوبانە تایبەتییەی بۆیان ڕێکخراون و ئەو هەموو یاسایانەی هاتوچۆ (قوانين المرور)ەی کە بۆیان دانراون، کەچی ڕۆژ نیە ڕووداوو کارەساتی لەیەکدان (دعم) بە تایبەت لەسەر زەوی ڕوو نەدەن و زیان و زەرەری زۆریان لـێ نەکەوێتەوە، بەلاَم ئەو هەموو خڕۆکەو ئەستێرەو کەهکە شانانە د ێن و دە چن لە

بوونەوەردا لەوەتەی خوا بوونەوەری داناوەو تا ئێستاش کارەساتێکی لەو جۆرە ڕووی نەداوەو زانایان دەڵێن: ئیحتمالیش نیە کە هیچی بە هیچ بکەوێت.(1)

## زەوی :

ئەمجارە با بێینە سەر باسی خڕۆکەی (زەوی)، وە هەلومەرجەکانی ژیان و گوزەران کە تێیدا ڕەخساون بۆ ئەوەی ئینسان و گیانداری لەسەر بژین، بزانین خوای بالادەست چ تەگبیرێکی کردوەو چ مەشوورێکی خواردوەو چ نەخشەو بەرنامەیەکی داناوە.

خـــوای زاناو کـــاربەجێ دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا ....﴾ (غافر-64) واتە: خوا ئەو زاتەیە کە زەوی بۆتان کردوە بە شوێنی نیشتەجێ بوون و مایەی سەقامگیر بوونتان.

وە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا﴾ (النبأ-6). واتە: ئایا زەویمان بۆ نەکردوون بە لانکە، یاخود جێگایەکی ڕاخراو و شوێنی ئاسودەیی و ئارام لەسەرگرتن؟!

وە دەفەرموێ: ﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴾ (الذاريات-20). واتە لە زەویدا نیشانەو بەڵگە زۆرن (لەسەر دەستەڵاتی خوا) بۆ کەسانێك بە چاوی ئیمانەوە سەیر بکەن و زانیارییان هەبێت.

---

(1) کتێبی (بمن من بگــو چــرا؟!) بەرگی (2) لاپەڕە 240-241

ئنجا با بزانین زانایانی زەوی ناسی چۆن باسی زەوی دەكەن:

زانایانی (جیۆلۆجیا) دەڵێن: زەوی ئێمە وەك تۆپێكی گەورە وایە، كە زیاتر لە بەرد دروستكراوەو بە توێكڵێكی تەنكی ئاوو گڵ دەورە دراوەو ئەگەر بێت و ئەندازەی(10) هەتا (30)میل بە قووڵایی و بە ناخی زەویدا بچینە خوارێ دەبینین هەمووی چینە بەردەو زۆر سەخت و رەقە، جگە لە توێكڵە گڵییەكەی، بەڵام ئەگەر بە ئەندازەی (2) میل بە قووڵایی زەویدا بچینە خوار، پلەی گەرمی ژێر زەوی دەگاتە ئەندازەی ئاوكوڵاندن، چونكە نێو زەوی هەمووی ئاسن و بەردو كانزای تواوەو قاڵبووەوەیەو لەوپەڕی گەرمی دایە، وەك دوایی باسی دەكەین.

زانایان دەڵێن: تیرەی ئەو تۆپە بەردینە بریتییە لە (4000) چوار هەزار میل، واتە لەمسەر بۆ ئەو سەری گۆی زەوی، وە ئەو چەقە ئاسنینەی زەوی و توێكڵی زەوی، توێكڵێكی ئەستوور بە ئەندازەی (2000) دوو هەزار میل لە یەكیان جیادەكاتەوە.

بۆ پێوانی ئەندازەی گەرمی نێو زەوی، زانایان پێوەرێكیان داناوە دەڵێن: هەر بە ئەندازەی (130) سەدو سی پێ بچیتە خوار یەك پلەی گەرمی زیاد دەكات، پاشان (130) پێی دی بچیتە خوارتر پلەیەكی دی زیاد دەكات، هەتا ئەگەر (30) میل بچیتە خوارێ پلەی گەرمی دەگاتە (1200) هەزار و دووسەد پلە، واتەی پلەی (سەنتیگراد) كە لەو ئەندازەیەدا بەردو ئاسن دەتوێتەوە، واتە ئەو شوێنەی لە قوڵایی (30) سی میل دا هەیە هەمووی بەردو ئاسنی تواوەیە!

زانایان پێیان وایە چەقی زەوی (5500) پێنج هەزارو پێنج سەد پلەی سەنتیگراد گەرمە!

دەربارەی کێشی زەوی دەڵێن: (6600) شەش هەزارو شەش سەد تریلیۆن تەن دەبێت، واتە زەوی (6.600.000.000.000.000.000.000) شەش هەزارو شەشسەد ملیار ملیار تەن قورسە!

وە زەوی چەند خولانەوەیەکی هەیە،زەوی بە خێراییی(680) شەشسەدو هەشتا کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بەدەوری خۆریشدا بەخێرایی 180.000 سەدو هەشتا هەزار کیلۆمەتر لە هەر سەعاتێکدا دەخولێتەوە. لەگەڵ کۆمەڵەی خۆریشدا بە دەوری ئەستێرەی (دالّی ڕاوەستاو)دا سووڕانەوەو خولانەوەیەکی دی هەیە، لەگەڵ دالّی ڕاوەستاویش بە دەوری چەقێکی دیکەدا خولانەوەیەکی دی هەیە. لەگەڵ کاکێشانیش دا بە دەوری چەقێکی دیدا خولانەوەیەکی دی هەیە، کە تەنیا هەر خوا دەزانێ ئێمە چۆن و چەند جار لەنێو ئەم بوونەوەرەدا دەخولێینەوە!!

ئنجا زەوی هێزی کێشندەی هەیەو بەهۆی هێزی کێشندەوە دەریاکان بە دەوری زەوییەوەن، وە هەر بەو هۆیەوەیە کە هەوا بە دەوری زەوییەوەیەو ئەگەر هێزی کێشندە (قوة الجاذبية) نەبوایە نە هەوا بە دەوری زەوییەوە دەماو نە ئاوی دەریاکانیش و نە هیچ شتێکی دیکەش بەسەر زەوییەوە بەند دەبوو، چونکە زەوی بەهۆی هێزی کێشندەوە هەموو شتەکان بەخۆیەوە دەگوشێ.

ئنجا ئەم خرۆکەی زەوی یە بە چینێکی هەوا دەورە دراوە کە ئەستوورییەکەی سەدان میل دەبێت، کە وەك گوتمان زەوی بەهۆی هێزی کێشندەوە بەخۆیەوە نووساندوە، ئەندازەی فشاری هەوا بە ئەندازەی کیلۆگرامێك بۆ سەر هەر یەك (سم$^2$)، بەڵام لەسەر مانگ ئەندازەی هێزی کێشندە بریتیە لە ($1/6$)ی ئەوەی کە لە سەر زەوی یە، وا تە ئەگەر شتێك لەسەر زەوی (6) کیلۆ قورس بێ لەسەر مانگ تەنها کیلۆیەکە.

## هــەوای دەوری زەوی:

ئەو چینە هەوایەی کە دەوری زەوی داوە 78% ی نایترۆجین نە، 21% ئۆکسجینە، 0.3% دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، هەروەها چەند توخمێکی دیشە کە ئۆقیانووسی هەوا پێکدێنن.

جێگای سەرسوڕمان ئەوەیە کە ئینسان بەبێ ئۆکسجین ناژیت، هەروەها گیانلەبەرانیش، بەڵام بۆچی ئۆکسجین هەر کۆتایی پێ نەهات و تەواو نەبوو؟!

وەڵام: چونکە ڕووەك و دارو درەختەکانیش بەبێ دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ناژین، ئێمە ئۆکسجین هەڵدەمژین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەدەینەوەو ڕووەك و دارو درەختیش بە پێچەوانەوە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژن و ئۆکسجین دەدەنەوە، خوای زانا و توانا ئاوا هاوسەنگیی (توازن)ی ڕاگرتوە، ئەگەرنا هەم ڕووەك و دارو درەخت دووەم

ئۆکسیدی کاربۆنیان دەبڕاندو کۆتاییان پێ دەهێنا، هەم ئێمەش ئۆکسجینمان تەواو دەکردو دەبڕاند!!

ئنجا ئەو چینە هەوایەی کە دەوری زەوی داوە بێجگە لە هەناسەدانی گیانداران و ڕووەك چەندان سوودو کەڵکی دیشی هەیە، یەکێك لەوانە ئێمە بەهۆی ئەو چینە هەوایەوە لە ملیۆنان پارچە ئەستێرەو پارچە خڕۆکە دەپارێزرێین، کە بەرەو زەوی دێن و زەوی کێشیان دەکات بەرەو خۆی، کە لە شەوو ڕۆژدا بەردەوام دێن و خێراییەکەیان لە چرکەیەکدا لە (6 تا40) میلە. بەڵام ئایا بۆچی ئێمە نا سووتێین و لەنێو نا چین؟! چونکە ئەو چینە هەوایەی زەوی یەکسەر دەیانکات بە خۆڵەمێش و دەسووتێن لە نێویدا لەبەر ئەوەی لەوپەڕی گەرمی دان، مەگەر جاروبار پارچەیەکی بچووکیان لێ بمێنێتەوەو بگاتە سەر زەوی کە دیارە بەر هەر شتێك بکەوێ دەیکاتە قەرەبرووت[1]! هەر بۆیەشە کە خوا لە بارەی هەوای دەوری زەوییەوە فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا السَّمَاء سَقْفًا مَّحْفُوظًا ...﴾ (الأنبياء-32) واتە: ئاسمانمان کردوە بە سەربان (سقف)ێکی پارێزراو (کە کون ناکرێت).

دیسان هەوا دەورێکی زۆر دەبینێ لە متوربەکردنی گوڵی چەندان دارو درەخت و میوەدا وەك خوای پەنهانکار دەفەرموێ: ﴿ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ ﴾ (الحجر-□□) واتە: بایەکانمان ناردوە کە هۆی متوربەکردن (تلقیح)ن.

---

(1) قەرەبووت: چتێکە زۆر سوتابێ و ڕەش هەڵگەڕابێ، باروتی ڕەش .

هەروەها بەهۆی ئەو هەوایەوە کە دەوری زەوی داوە هەڵمی ئاو لەسەر دەریاکانەوە دێت و ئنجـــا دەبێتە هەورو بارانمان بۆ پەیدا دەبـێت، وەك خوای پەروەردگـــار دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَـلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيـرُ سَحَابًا ...﴾ (فاطر-9). واتە: خوا بایەکانی ناردوە هەور پەیدا دەکەن.. (واتە بەهۆی ئەو بایەوە کە دێت و هەڵدەکات ئەو هەڵمە لەگەڵ خۆی دێنێت و دوایی دەیکات بە هەورو دێتە شوێنە ساردەکان و باران و بەفرو تەرزە دەبارێت).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَالذارِيَاتِ ذَرْوًا، فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا﴾(الذاریات 1-2) واتە: سوێند بەو بایانەی کە شت ڕادەماڵن، وە ئەو بایانەی کە شتی قورس هەڵدەگرن. بەڵێ هەوا بەشێوەی (با) بە ملیۆنان تەن ئاوی نێو هەورەکان هەڵدەگرێ.

حیکمەت و سوودێکی دیکەی هەوا ئەوەیە کە کە شتی چارۆکەدار دەگوازێتەوەو لێی دەخورێ لەنێو دەریاکاندا کە ماوەیەکی زۆر ئینسان بەو هۆیەوە لە دەریاکاندا ئیشی خۆی کردوە، وەك خوای شارەزا ئاماژەی پێ کردوەو فەرموویەتی: ﴿ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ الرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَى ظَهْرِهِ ....﴾ (الشوری-[illegible]) واتە: خوا ئەگەر بیەوێ بایە کە دەوەستێنێ و کەشتیەکان لەسەر دەریا قەرار دەگرن و لەوێ دەمێننەوە (بێ ئەوەی دەستتان بە هیچ شوێنێك بگات).

حیکمەتێکی دی هەوا ئەوەیە کە (با) هەر چی پیسییەك هەیە هەمووی لادەبات و ڕای دەماڵێ، بۆ گەنی و میکرۆبات و هەموو پیسییەك و سەر زەوی لێ پاك دەکاتەوەو گەسکی دەدات.

حیکمەتێکی دیکەی هەوا بریتییە لە هەڵگرتنی فڕۆکەو ڕۆکێت و کەشتییە ئاسمانییەکان و هەموو ئەو شتانەی کە بە هەوادا دێن و دەچن.

## ئـــــاو:

یەکی دی لەو دروستکراوانەی خوای بەرزو مەزن، کە لەم سەر زەوییەی ئێمە هەلومەرجی ژیان و گوزەرانی بۆ پێ ڕەخساندووین بریتییە لە (ئاو)، زایانان دەڵێن ئاو (3⁄4)ی پانتایی خڕۆکەی زەوی داپۆشیوە، کە مەبەستیان پێ ئۆقیانووسەکانە، بەڵام ئایا ئەو سوێری و ماددە خوێیەی، کە لەنێو ئاوی ئۆقیانووسەکاندا هەیە، لە چییەوە هاتوە؟!

زانایان تا ئێستا لەو بارەوە نەگەیشتوونە ئەنجامێکی زۆر ڕوون، کە بتوانن شی بکەنەوە، ئەو خوێیە چۆن تێکەڵ بەو دەریاو ئۆقیانووسانە بووە، چونکە ئەندازەیەکی زۆر خوێیان تێدایە، کە یەکێك لە زانایان دەڵێ: (ئەگەر ئاوی دەریاکان وشك بکرێتەوە، خوێیەکەی لــێ بپازنەرێ، دەتوانین دیوارێکی پێ دروست بکەین کە 180 میل بەرز بێت و یەك میل پان بێت، وە بە باری درێژی زەویدا، یانی لە قوتبی سەرێ وە بۆ قوتبی خوارێ و لە هێڵی نێوەڕاست (خط الأستواء) هەردووك سەرەکانی بگەنەوە بە یەك، واتە دەوری هەموو خڕۆکەی زەوی بداتەوە)[1] کەواتە: دەریاکان ئەندازەیەکی زۆر بیـرەزا خوێیان تێدایە.

دیارە هەندێك لە دەریا و ئۆقیانووسەکان خوێیان زیاتر تێدا یە لە هەندێکیان، بۆ نموونە دەریای مردوو (بحر الميت) کە ڕووبەرەکەی

(1) خاوەنی کتێبی (بمن بگو چـرا؟!).

(340) مـ ـیل2 سێ سەد و چل مـ ـیل دووجا ـیە، نیزیـ ـکەی (11.600.000.000) یازدە ملیار و شەشسەد ملیۆن ـتەن خوێی تێدایە، هەر بۆیەش هیچ زیندەوەرێکی تێدا ـناژی، چونکە ئەـندازەی خوێیەکەی یەکجار زۆرە، بەڵام ئاوی ئۆقیانووسەکانی دیکە هەر چەندە خوێی تێدایەو زۆرە، بەڵام پڕیەتی ـلە زیـندەوەری جۆراو جۆرو خوای کاربەجێ ئەوەندەی خوێ تێدا زۆر نەکردوە کە زیندەوەران نەتوانن تێیدا بژین.

ئاوی شیرین و زوڵاڵیش پێشتر باسمان کرد کە لە ڕێی ـباران باریـنەوە خوای بە بەزەیی ئەو ئاوە سوێرو تاڵ و تفتەمان بۆ دەپاڵێوێ و ـئاوێکی شیرین و زوڵاڵمان دەست دەکەوێت، وەك فەرموویەتی: ﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ، أَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ﴾ (الواقعة 68-70) واتە: ئەو ئاوە دەبینن کە دەیخۆنەوە (واتە ئاوی شیرین و زوڵاڵ و سازگار) ئایا ئێوە دەینێرنە خوارێ لە هەورەکان، یان ئێمە ناردوومانەتە خوار؟! (کەس هەیە بتوانێ بڵێ من هەورم دروست کردوەو بارانم لێی ناردۆـتە خوارێ؟ بێگومان نەخێر)، دوایی دەفەرموێ: ئەگەر ویـستبامان ـئاوی بارانیشمان هەر سوێرو تاڵ دەکرد وەك ئاوی دەریاکان، بۆچی سوپاسی خوا ناکەن؟!

ئنجا ئاوی شیرین ئەوە دیارە کە لە باران و بەفرو تەرزەیەو ڕاستەوخۆ شیرینە، دوایی ئەو باران و بەفرو تەرزەیە لەژێر زەویدا عەمبار دەـکرێ، خوای مەزن زەوی وا دروست کردوە کە بتوانێ ئەو ئاوە شیرینە ـلەنێو

خۆیدا بهێڵێتەوە تاکو لەڕێی کانی و سەر چاوەو بیرەوە بێتەوە دەرێ و ئینسان و گیانلەبەران کەڵکی لێ وەربگرن.

ئنجا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین کوێ لەسەر زەوی بەرزتربێ زیاتر باران و بەفرو تەرزەی لێ دەبارێ، چونکە ئاو عادەتی وایە لە بەرزییەوە دەچێ بۆ نزمیی، بەڵام لە نزمییەوە نایەت بۆ بەرزی.

بەڵێ بەڕێزان!

ئینسان کە سەرنجی ئاو دەدات بەئاشکرا دەستی خوای بەرزو تاکی تێدا دەبینێ و دەزانێ کە تەرتیب کردنی وەزعی ئاویش بەو جۆرە لەسەر زەوی، جۆرێکی دیکەیە لە مشوورخواردنی خوا لە دروستکراوەکانی لەسەر زەوی لە ڕووەك و گیانلەبەرانەوە هەتا ئینسان!

دیارە (ئاو)یکیش کە هیچ زیندەوەرێك بە بێ ناژی و هەموو زیندەوەرێکی لێ دروست کراوە، وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنبياء-30). واتە: هەموو زیندوویەکمان لە ئاو دروست کردوە، شایستەی تەرتیب و ڕێکخستنێکی حەکیمانەی لەو جۆرەشە، ئایا هەر باوەڕ ناکەن.

## گڵ ، چیایەکان ، ڕووەك و دارو درەخت، گیانداران :

دیسان لەو شتانەی کە هەلومەرجی ژیان و گوزەرانیان لە سەر زەوی بۆ ئینسان ڕەخساندوە، بریتین لە: گڵ، چیایەکان، ڕووەك و دارو درەخت، گیانداران، سووتەمەنی عەمبارکراوی ژێر زەوی بە هەموو جۆرەکانیەوە،

ئەوانەش هەموویان دەوری سەرەکییان هەیە لەوەدا کە ئینسان بتوانێ لەسەر زەوی بژی و مرۆڤ ناتوانێ بەبێ هیچ کامیان ژیان بەرێتە سەر.

**(گــــڵ) :**

کە لەبەردەستمانەو ڕووەك و درەختی تێدا دەچێنین، لە ڕاستیدا بۆ ئینسان لەزێڕ بە نرخترە، چونکە ئەگەر سەر زەوی هەمووی زێڕ بووایە، دەنکە (تۆو)ێکی نەدەڕواندو سەوز نەدەکردو نەمامێکی تێدا نەدەڕوا، بەڵام خوای کاربەجێ ئەو گڵو خۆڵەی کە خستوویەتە توێڵکی زەوی، بۆی کردووینە کانگای پیت و بەرەکەت و سەدان جۆرە دانەوێڵەو ڕووەكو دارو درەختی تێدا دەڕوێ و بەردەگرێ!

**(چیایـــەکان):**

هەروەها چیایەکان، ئەو شاخە بەرزانە، کە زانایان دەڵێن چەندیان بە دەرەوەیە شەش حەوت ئەوەندەیان بەناخی زەویدا چۆتە خوارێ، بۆیەش خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ (النبأ-7). واتە: وە ئایا چیایەکانمان بۆ زەوی نەکردۆتە سینگ؟! وە دە فەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ﴾ (الأنبياء-31). واتە: لەسەر زەوی چیای وەك کەشتی لەنگەرگرتوومان دروست کردوون، بۆ ئەوەی زەوی جووڵەیان پێ نەکات و سەقامگیر بێت!

**(ڕووەك و شـــینایی):**

ئنجا ڕووەك و شینایی، كە سەرچاوەی بەرهەم هێنانی ئۆكسجینە، كە ئینسان بەبێی ناژی، وە ڕووەك و دارو درەخت سەرچاوەی بنەڕەتی بژێوی ئاژەڵ و گیانداران و مرۆڤیشە.

(ئاژەڵ و گیانداران):

دیارە كە چەندان سوودیان لێ دەبینین، لە گۆشتیان، لە موویان، لە تووك و خوری و پەڕو پێستیان، كە بەرگ و پۆ شاك و پێڵاو یان لێ دروست دەكەین، بۆ هاتوچۆو گواستنەوە كەڵكیان لێ وەردەگرین، وە بۆ سواریی و بۆ جوانیی وەك خوای بە بەزەیی فەرموویەتی: ﴿لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً﴾ (النمل-8).

(سووتەمەنیی):

پاشان ئەو سوتەمەنییەی كە لەنێو زەو یدا عەمبار كراوە، ئەو هەموو نەوت و غازو خەڵووزی بەردە! وەك پێشتر لەو بارەوە دواین.

خاڵی دووەم (جەستەی خۆمان):

ئنجا با سەرنجی خۆمان بدەین، جەستە[1]و لاشەمان، چونکە خوای خاوەنمان پێمان دەفەرموێ: ﴿وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ (الذاريات-). واتە: وە لە خۆتاندا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن لە سەر پەروەردگاریتی خوا، بۆچی نایبینن؟! وەك دەبینین لێرەدا خوا (جل جلاله) بە سەرزەنشتەوە پێمان دەڵێ.

(خانە (خلیە) یەکەمین خشتی بینای جەستەیە):

سەرەتا دەڵێین: وەك چۆن خشتی یەکەمی دروستبوونی ماددە گەردیلە (ئەتۆم)یە، خشتی یەکەمی دروستبوونی هەر زیندەوەرێکیش بریتیە لە خانە(خلیة)، خانەش بەکورتی، بریتیە لە شتێکی زۆر بچووك کە بە توێکڵ و پەردەیەکی دوو چین دەوردراوە، ماددەیەکی شلی تێدایە پێی دەگوترێ (سایتۆپلازم)و لەنێو ئەو ماددەیەدا نهێنی ژیان شێردراوەتەوەو جیاوازی نێوان گیاندار و بێگیان لەو (سایتۆپلازم)ەدا شێردراوەتەوە، ئنجا لەنێو (سایتۆپلازم)یشدا نێوك هەیە، لەنێو ئەو نێوکەش دا نێوکێکی دی هەیە، لەنێو ئەو نێوکەدا (کرۆمۆسۆم)ەکان هەن، کە سیفەتی دایك و باب بۆ ڕۆڵە دەگوازنەوە، جا ئەوە وردەکاری زۆری تێدایەو بەوەندە وازدێنین.

خانە زۆر زۆر بچووکە، بۆ نموونە ئەو تۆویلکە(نطفة)یە کە ئینسانی لێ دروست دەبێ قەبارەکەی بریتیە لە (1 1.000.000)ی

---

(1) لە راستیدا حەقیقەتی مرۆڤ لە ڕووح دا شێرراوتەوەو جەستە بۆ ڕووح وەك بەرگ و پۆشاك وایە بۆ جەستە، بەڵام لەبەرئەوەی ماهیەتی ڕووح بەس خوا دەیزانێ ئێمە لێرەدا بەس سەرنجی جەستە دەدەین.

گرامێك، دیارە تۆویلکەش یەکێکە لە جۆرە کانی خا نە، جا ئە گەر بەراوردێك بکەین لەنێوان هێلکەی حوشترمەل (نعامة) کە هێلکەکەی (100) گرامە، لەگەڵ تۆویلکەی ئینسان کە ئینسانی لـی درو ست دەبێ، هێلکەی حوشترمل (100.000.000.000) سەد ملیار جار لەو (نطفة)یە گەورەترە کە ئینسانی لـێ دروست دەبێت! کەواتە ئینسان لە شتێکی یەکجار وردو بچکۆڵە دروست دەبێت، بۆیە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ﴾ (یس-77). وا تە: بۆچی ئینسان سەرنج نادات کە ئێمە لە تۆویلکە(نطفة) درو ستمان کردوە! هەڵبەتە کاتی خۆی نەیانزانیوە، بەڵام ئێ ستا زان یاری دەری خستوە کە لە دڵۆپەیەك تۆو (منی)دا ملیۆنان گیانلەبەری تۆو (حیوان منوي)ی هەیە کە بە تەنیا یەکێکیان لەگەڵ هێلکۆکە (بویضة)ی نێو تۆی ئافرەتدا یەك دەگرن و سەرەنجام ئەو زی ندەوەرە گ چکەیان لـێ پێکدێت کە کۆرپەی ئینسانی لـێ درو ست دەب ێت، وا تە تۆویلکە (نطفة)!

قەبارەی خانەکانیش بۆ پێوانەیان یەکەیەکی قیاسی[1]یان بۆ دا ناوە پێی دەگوترێ (مایکرۆم) کە (1⁄1000)ی میل لی مەترێ کە، کە سانتیمەترێك (10) میللی مەترە، واتە میللی مەترێك ب کەی بە (1000) بەش، یەکێك لە بەشەکانی پێی دەگوترێ (مایکرۆم)، بۆ وێنە: خرۆکەی سور کە لە خوێندا هەیە، قەبارەکەی (7) مایکرۆ مە،

(1) یەکەی قیاسی: الوحدة القیاسیة.

وە ئەو هێلکۆڵەی کە لە ئاوی ئافرەتدا هەیە، تیرەکەی نیزیکەی (200) مایکرۆمە.[2]

ئنجا وەك چۆن گەردیلەکان گەردی یان پێکدەهێناو ئەوانیش شتەکانی دیکەیان پێکدەهێنا، خانەکانیش شانە (نسیج) پێك دێنن، لە کۆمەڵێك شانەش ئەندام (عضو) پێك دێت و لە کۆمەڵێك ئەندامیش کۆئەندام (جهاز) پێك دێت، پاشان لە کۆمەڵێك کۆئەندامیش زیندەوەرێك (کائن حي) پێك دێت، چ ئینسان چ هەر زیندەوەرێکی دیکە.

جەستەی ئینسان لە چرکەیەك دا دەوری (125.000.000) سەدو بیست و پێنج ملیۆن خانە سەرف دەکات، واتە: لە دەقیقەیەك دا (7.500.000.000) حەوت ملیارو نیو خانە سەرف دەبێت! بۆ وێنە: خوێن لە هەر چرکەیەك دا (2.000.000) دوو ملیۆن خڕۆکەی سوور سەرف دەکات، واتە لە سەعاتێکدا لە جەستەی ئینسان دا چەند قاتی ژمارەی دانیشتوانی سەرزەوی خانە لە جەستەی ئینساندا دەمرن و سەرف دەبن و پاشان ئیدیکە دروست دەبنەوە، کە دانیشتوانی سەرزەوی ئێستا بە شەش ملیار مەزەندە دەکرێ![2]

ئنجا خانەکان تەمەنیان جیاجیایە، هەیانە تەنیا چەند ڕۆژێك دەژی و هەیانە نیزیکەی دوو مانگ دەژی، وەك خڕۆکە سوورەکان، هەشیانە لەو کاتەوە کە ئینسان لەدایك دەبێ تا دەمرێ، هەر دەژی، ئەوانیش بریتین لە خانە هەرە گرنگەکانی جەستەی ئینسان کە خانەکانی (مێشك)ن.

(2) الطب محراب الإيمان، بەرگی 1 ، لاپەڕە 35-36 ، د. خالص الجلبي

(2) ئێستا ئەو ژمارەیە زیاتریش هەڵکشیوە.

## خانەکانی مێشک :

خانەکانی مێشك (الخلايا العصبية) هەر لەو کاتەوە کە خوای زانا و بەبەزەیی بۆ مرۆڤیان دروست دەکات، ژمارەکەیان نەگۆڕەو نامرن و لەنێو ناچن، مەگەر ئافەت و بەڵایەکیان بۆ بێت، هەتا ئەو کاتەی ئینسان دەمرێ، حیکمەتی ئەوەش لەوەدایە کە ئەگەر ئەوانە گۆڕابان دەبوو ئینسان ئەمڕۆ شتێك لەبەر (حفظ) دەکات سبەینێ دووبارە لەبەری بکاتەوە، نەك هەر لەبەرکردن، بەڵکو ناسین، تۆ دایك و باب و براو خوشك و خزمت هەیەو چەندان دۆست و ئاشناو برادەرت هەن، ئەگەر خانەکانی مێشکت گۆڕابان، پێویستی دەکرد کە هەموو جارێ دووبارە هەوڵی ناسینیان بدەیەوە، هەروەها هەموو مەعلومات و زانیارییەکی دیکەش هەروا!! ئنجا کۆئەندامی مێشك (الجهاز العصبي) بەگشتی بە (14.000.000.000) چواردە ملیار خانە دانراون، کە (9.000.000.000) نۆ ملیاری ئەو خانانە بەس لەنێو(مێشك)دا هەیە.

زانایەکی بەناوبانگی ئەمریکی بەناوی (جوتسون گویك) لە (محاضرة)یەکی خۆیدا کە لە پەیمانگای مێژوو لە (نیویۆرك) لە ساڵی (1957)ی زاینیدا داویەتی دەڵێ: (ئەگەر بێت و هەر چی ئامێری ڕاداری سەرزەوی هەیەو هەر چی ئامێری تەلەگراف و تەلەفزیۆن و تەلەفۆن هەیە، هەمووی کۆبکرێتەوەو پاشان زۆر بچووك بکرێتەوە بە ئەندازەی قەبارەی مێشکی ئینسان، ئەوجاریش مێشکی ئینسان بە

چەند قات لەو هەموو ئامێرانە ئاڵۆز(معقد)ترەو وردە کاری زیاتری تێدایە).[1]

**پێکەوە هاوکاربوونی خانەکـان :**

لە جەستەی ئینسان دا دەوری (1000) هەزار ملیۆن ملیۆن خانە هەیە، کە بە ژمارە دەکاتە (1.000.000.000.000.000) هەزار تریلیۆن خانە، کە هەموو ئەندام و کۆئەندامەکانی جەستەی ئینسان لەو خانانە پێك دێن.

جا ئێستا با سەرنج بدەین، جاری وا هەیە دەبینین کە بە سەدان ئەندازیارو وەستاو کرێکار لە (بینا)یەکی گەورەو فراواندا کار دەکەن و هەر کۆمەڵە ئەندازیارو وەستاو کرێکارەی جۆرە کارێك دەکەن و پاشان بە هەموویان وێکڕاو لە ئەنجامی هاوکاری پێکەوە کردن و دەستبار بۆ یەکدی گرتنیان دا پرۆژەی ئەو بینایە تەواو دەکەن.

جا لێرەدا دەپرسین: ئایا هیچکەس دەڵێ هەرکام لەو ئەندازیارو کرێکارو وەستایانە لەخۆیەوە ئاوا دەکات و سەرەنجام ئەو بینایە رێکوپێکە -کە هەمووی بەیەکەوە گونجاوە- دروست دەبێت؟! بێگومان نەخێر، بەڵکو هەرکەسێك عەقڵی هەبێت و ورد بێتەوە دەزانێ کە ئەو بینایە لەپێشدا نەخشەیەکی بۆ دانراوەو پاشان نەخشەکە دابەش کراوە بەسەر ئەو کۆمەڵە ئەندازیارو وەستاو کرێکارانەداو هەر کامێکیان

(1) (الطب محراب الإيمان)، بەرگی 1 ، لاپەڕە 40-41 ، د. خالص الجلبي

ئیشی خۆی تەواو دەكات و سەرەنجام هەمووی یەك شتی تەیرو تەواوی لــێ دروست دەبێت كە بینایەكەیە.

دەجا بەڕێزان خانەكانی جەستەی مرۆڤیش بە هەمان شێوە: ئەو هەموو هەزار ملیۆن ملیۆن خانەیە كە لە جەستەی ئینسانندا هەنە، هەر هەموویان بەیەكەوە هاوكارن و هەركامێكیشیان ئیشوكارێكی دیاریكراوی بۆ دانراوەو هەمووشیان بەیەكەوە هاوكارن، سەیر دەكەین كۆئەندامی هەناسەدان(الجهاز التنفس)، كۆئەندامی هەرس (الجهاز الهضمي)، كۆئەندامی میز (الجهاز البولـي)، كۆئەندامی زاوزێ (الجهاز التناسلي)، كۆئەندامی خوێن (الجهاز الدموي)، كۆئەندامی ماسوولكە (الجهاز العضلي)، كۆئەندامی ئێسقان (الجهاز العظمي)، كۆئەندامی دەمار(یان مێشـك) (الجهاز العصبـي)، كۆئەندامی پێست (الجهاز الجلدي)، كۆئەندامی لینفاوی (الجهاز اللینفاوي)، هەستەكانی بیستن (السمع)و دیتن (البصر)و تام كردن (الذوق)و بۆنكردن (الشم)و دەست لــێكوتان (اللمس)، ئەوانە هەموویان لەو خانانە پێكدێن، كۆئەندامی وا هەیە كە لە ژمارەیەكی زۆر ئەندام پێك دێت، بۆ نموونە كۆئەندامی هەرس (الجهاز الهضمي)لە ئەندامەكانی زارو زمان و گەدەو گەروو و قورگ و سورێنچك و دوازدەگرێ و ریخۆڵە وردەكان و ریخۆڵە گەورەكان و كۆڵۆن و هەموو ئەوانە پێكدێت و بەهەموویان یەك كۆئەندامیان پێكهێناوە!

بەڵێ بەڕێزان!

وەك گوتمان هەركام لەم خانانە ئەو ئیشەی خۆی دەكات كە بۆی دیاری كراوە، بۆ وێنە: خانەكانی ماسوولكە یەكسەر كاری گرژكردن وكردنەوە ئەنجام دەدەن و، خانەكانی چاو یەكسەر بەكاری دیتن هەڵدەستن، هەروەها هەموویان هەرواو تەنانەت بۆ جارێكیش نیە یەكێكیان ئیشی خۆی لێ تێك بچێ، مەگەر لە حاڵەتی نەخۆشیدا كە خانەكان تووشی نارێكی بن، بەڵام چەندان جار ئەندازیارو وەستاو كرێكار ئیشی خۆیان لێ تێكچووەو ڕیسیان لێ بۆتەوە خوری و زیانی گەورەیان لێكەوتوە!

## هەندێک لە كارە سەرسوڕهێنەرەكانی مێشک:

ئەگەر بێت و سەرنجی (مێشك) بدەین، مێشك بەپێی مەزندەو ئەندازەگیری زانایان دەڵێن: جێگای (90.000.000) نەوەد ملیۆن بەرگ كتێبی پڕ لە زانیاری تێدا دەبێتەوە، لەگەڵ (10.000.000.000) دە ملیار وێنەو چەند ملیۆن جۆرە دەنگ و تام و بۆن! بەڵام تا ئێستا بە وردی نازانرێ ئەو زانیاری و وێنەو دەنگ و تام و بۆنانە لەكوێی مێشكداو هەركامێكیان لە چ بەشێكی دا كۆدەبێتەوە؟!

مێشك نەك هەر كۆیان دەكاتەوە، بەڵكو وەك باسمان كرد لێكیان دەداو بەیەكەوەیان گرێ دەدات و شییان دەكاتەوەو ئەنجام گیرییان لێ دەكات و بەڵكو داهێنان(ابداع)یان تێدا دەكات و فیكرەو زانیاری تازەیان بەهۆوە دادەهێنێ و بەرهەم دێنێ!

ئنجا لە هەمووی سەیرتر جاری وا هەیە خاوەنی کتێبخانەیەك كە بە هەزاران کتێبی تێدایە ماندوو دەبێت تا کتێبێك دەبینێتەوە كە دەیەوێت، بەڵام جاری وا هەیە پێش بیست ساڵ لە مەوپێش كە سێكت بینیوەو ناسیوەو لەو کاتەوە تا ئێستا نەت دیوەتەوە، کەچی یەکسەر كە چاوت پێی کەوت دەیناسییەوە كە كێیە؟

جا بێگومان ئەو ئیشوکارانەی (مێشك) زۆر سەرسوڕهێنەرن، بۆیەش زانایانی دەروناس(علم النفس)ی ئیسلامی دەڵێن: پرۆسە(عملية)کانی بیرکردنەوەو وەبیرهاتنەوەو ناسینەوەو ...هتد، هەموویان (رووح) ئەنجامیان دەدات و مێشك تەنیا ئامراز (وسیلە)یکە بەدەست رووحەوە وەك سەرجەم ئەندامەکانی دیکە.

ئنجا جاری وا هەیە شتێکت لەبیر دەچێتەوەو ماوەیەك بیری لێ دەکەیەوە پاشان دێتەوە بیرت، بۆچی؟! چونکە ئەو زانیارییە کۆن بووە لە مێشکدا، یاخود هەندێك كەس (ذاکرة)ی لاوازە، یان لە ئەنجامی نەخۆشی و کەوتنە تەمەنەوە بەشێك لە خانەکانی مێشکی كە پەیوەندی یان بەو کارەوە هەیە لە بەین چوون یان زیانیان بینیوە!

ئنجا ئەوە كە ئایا عەقڵ چۆن کار دەکات؟ چۆن بیردەکاتەوە؟ ویست و ئیرادە چییە؟ چۆن عەقڵ لە دەنگ و دیمەنەکان تێ دەگات و ئەنجامگیرییان لێ دەکات؟ چۆن عەقڵ شت هەڵدەسەنگێنێت؟ خەیاڵ چییەو خەون چییەو چۆن ڕوو دەدەن؟ ئەندامەکان پەیوەندییان لە گەڵ (رووح)دا چۆنە؟! ئەمانە هەموویان پرسیاری بێ وەڵامن.

(ئەلکسیس کاریل) لە کتێبەکەی (ئینسان ئەو نەناسراوە- الإنسان ذلك المجهول)دا دەڵێ: بێئاگا نەبین تا ئێستا زانیاریمان دەربارەی خۆمان زۆر سەرەتاییە.[1]

## دڵ:

ئەمجار با سەرنجێکی (دڵ) بدەین:

دیارە من هەروا بەکورتی ئاماژەیەکی پێ دەکەم، دڵ بە شێوەیەکی گشتی لە دوو ترومپا پێکهاتوە، تروپای لای چەپ و ترومپای لای ڕاست، هەریەك لەو دوو ترومپایەش لە دوو بەش پێك هاتوون، لە گوێچکۆڵەیەك و سکۆڵەیەك (الأذيْن والبُطين) لە گوێچکۆڵەی لای چەپەوە خوێن دەچێت بۆ سکۆڵەی چەپ و دەروازەیەکیان لە نێواندا هەیە دەکرێتەوە، وە لە سکۆڵەی چەپەوە خوێن دەچێت بۆ هەموو خانەکانی بەدەن، لەکاتێکدا دڵ دێتەوە یەك خوێن فڕێ دەدات، لە کاتێکیشدا کە دەکرێتەوە خوێن دێنێتەوە بۆ نێو دڵ، ئەنجا مەدانی ئەو کردارەش لە نزیکەی چرکەیەکدایە یاخود شتێك زیاتر، هەڵبەتە لە حاڵەتی جیاجیادا جیاوازی هەیە، لە کاتی وەرزش و ماندووبوون و چەند حاڵەتێکی تایبەتدا چەند قاتی حاڵەتی ئاسایی دڵ دێتەوە یەك و دەکرێتەوە، دڵی منداڵ زیاتر لێدەدات و خێراترە لە دەقیقەیەك لە90

---

(1)الإنسان ذلك المجهول، لا پەڕە 221. ئەلکسیس کاریل، خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە لە ئادابدا.

تا 100 جارە، ئینسانی گەورە 70 تا 80 جار، لە حا ڵەتی خەوتـندا سست دەبێتەوە.

گوێچکۆڵەو سکۆڵەی لای ڕاستیش، دوای ئەوەی کە خوێنی پیس ـلە بەدەنەوە دێتەوە بە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و زبڵ و زاڵەوە، گوێچکۆڵەی ڕاست دەیداتە سکۆڵەی ڕاست و ئەویش ڕەوانەی دەکات ـبۆ سییەکان تاکو بیپاڵێون و پا شان ـئەو دووەم ئۆک سیدی کاربۆـنەو ز ـبڵو زاڵو پاشەڕۆکەی کە لە خانەکانەوە هاتۆتەوە مرۆڤـ لە ڕێگای هەناسەدانەوە فڕێی دەداتە دەرێ، کاتێك هەناسە هەڵدەکێشێ ئۆکسجین وەردە ـگرێ و دەچێتەوە بۆ گوێچکۆڵەی چەپ و لەوێشەوە بۆ سکۆڵەو ئەویش دوو ـبارە ئەو ئۆکسجین و خواردن و خۆراکە پاکە ڕەوا ـنە دە ـکات ـبۆ سەرجەم خانەکان و.. ئا بەم شێوەیە ئەو دوو ترومپایە بەردەوام ئیش دەکەن، یەك دەنێرێ و یەك دێنێتەوە، بۆیەش دەمارەکانی خوێن هە ـندێکیان پێ ـیان دەگوترێ (خوێنبەر- شریان)، چونکە خوێنی پاك دەبەن بۆ خا ـنەکان، هەندێکی دیش پێیان دەگوترێ (خوێن هێنەر- ورید) چونکە خوێنی پیس دێننەوە بۆ دڵ و دووبارە دڵ دەیپاڵێوێتەوە.

کار بەم شێوەیە بەردەوامە هەتا دڵ لە لێدان دەکەوێ و ژیانی مرۆ ـڤـ کۆتایی پێ دێ!

ئنجا دڵی ئینسان ڕۆژانە دەوری (100.000) سەد هەزار جار ـلـێ دەدات، دێتەوە یەك و دەکرێتەوە، واتە ساڵانە دەوری (40.000.000) چل ملـ ـیۆن ـجار، ـلە تە ـمەنێکی ـمام نێوە ـندی دا دەوری

(2.000.000.000) دوو هەزار ملیۆن جار دڵی ئینسان لێی دەدات، بێ ئەوەی بوەستێ و هەر کە وەستا یەکسەر ئەو ئینسانە دەمرێ.

ئنجا بێجگە لەو خوێن بەرو خوێن هێنەرانە کە دە ماری گەورەن و ڕاستەوخۆ بە دڵ و سییەکانەوە پەیوەستن، دەزوولە خوێنییەکانیش هەن کە زۆر باریکن و پێنج دانەیان بە ئەندازەی (موو)یەك ئەستوور دەبن، ئەوانیش خوێن دەبەن بۆ خانەکان و دەشیگێڕنەوە بۆ دڵ بۆ دووبارە پاڵاوتنی.

ئەمە هەروا سەرنجێکی سەرپێیی بوو دەربارەی دڵ.

ئێستاش با سەرنجێکی دیکە لە کۆئەندامە سەر سوڕهێنەرەکانی جەستەی مرۆڤ بدەین:

## کۆئەندامی بیستن (جهاز السمع):

کۆئەندامی بیستن بەشێوەی گشتی لە سێ بەش پێك هاتوە: گوێی دەرەوە (الأذن الخارجية)، گوێی نێوەڕاست (الأذن الوسطى)، گوێی پەنهان (الأذن الداخلية).

گوێی دەرەوە تەنیا بریتیە لەوەی کە وەك چەترێك وایەو بەس دەنگ کۆدەکاتەوە، کە لە ماددەیەکی کرۆژ کرۆژە (غضروفي) یی پێک هاتوە، لەگەڵ لوولەیەك تا دەگاتە پەردەی گوێ.

گوێی نێوەڕاستیش لە سێ پارچە ئێسقان پێک هاتوە، کە پێیان دەگوترێ: چەکوش و سندان و ئاوزینگ (المطرقة والسندان والرّكاب) کە سێ ئێسقانی بچووکن و بە هەرسێکیان (55) پەنجاوپێنج گرام قورسن

و هەمووشیان بەیەکەوە پەیوەستن، چەکوشەکە یەکسەر پەیوەستە بە پەردەی گوێ و سندانەکەش لە نێوان دایەو ئاوزینگەکەش پەیوەستە بە گوێی پەنهان یان گوێی نێوخۆوە کە هەر وردترین هەست هەبێت، دەنگێك، پشوەبایەك، چرپەیەك، هەناسەیەك، یەکسەر ئەو پەردە یە دەلەرێتەوە کە ئەو لەریەوە چەکوشەکەش دەلەرێتەوەو لە سندانەکە دەدات، سندانیش پەیوەستە بە ئاوزینگەوەو ئەویش پەیوەستە بە لوولەیەکەوە کە یەکسەر بە خانەکانی مێشکەوە بەندە، ئەوانەی کە دیاریکراون بۆ وەرگرتنی دەنگەکان و سەرەنجام ئەو دەنگە دەگات بە مێشك و مێشك یەکسەر بە زۆر زۆر کەمتر لە چرکەیەك ئەو دەنگە شیدەکاتەوەو لێی حاڵی دەبێت!

## چــــاو:

چاو کە وردەکاری یەکجار زۆری تێدایەو هەتا بڵێی ئاڵۆز (معقد)ەو ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی پێکهاتەی چاوو بەشە جۆراوجۆرەکانی و ئیشوکاری هەر بەشێکیان و هاوکاری نێوانیان زۆری دەوێ، بەڵام هەر بەکورتی دەڵێین چاو بریتییە لە دووربینێك، بەڵام دووربینێکی زۆر سەرسوڕهێنەری ئۆتۆماتیکی! بەشێوەیەك کە ئەگەر تیشك و ڕووناکی زۆر بێت چاو کەم خۆی دەکاتەوەو، ئەگەر تیشك و ڕووناکیش کەم بێت چاو زۆر خۆی دەکاتەوەو لەکاتی خەوتندا چاو پێڵوەکانی دەچنەوە سەر یەك. وە لە هەر چاوێکدا (140.000.000) سەدو چل ملیۆن خانەی درێژکۆڵە (عُصَيّ)ی هەیەو، (7.000.000) حەوت ملیۆن خانەی

خرۆکەیی (مخروطي) هەیە، وا تە: هەر چاوێك (147.000.000) سەدو چلو حەوت ملیۆن خانەی تێدایە، تەنیا بۆ ئەوەی کە شت وەربگرێ و وێنە بگرێ و بیگەیەنێتە مێشك![1]

## دەوڵـەتی جەسـتە:[2]

لە کۆتایی ئەم باسەدا با سەیری جەستەی ئینسان بکەین کە وەك دەوڵەتێك سەیر دەکرێت، با بزانین چۆن و بە چ شێوەیەك؟!

هەموو خانەکانی لاشەی ئینسان وەك هاوولاتیانی ژێر سایەی ئەو دەوڵەتە وان و مێشك و دەمارەکان (الجهاز العصبي) وەك حوکمڕان و کاربەدەست و هەڵسوڕێنەری ئەو دەوڵەتە وان، چونکە لە مێشکەوە سەرجەم ئەمرو نەهییەکان دەردەچن، مێشك پەیوەندی لە گەڵ هەموو کۆئەندامەکانی جەستەدا هەیەو هەموویان پەیوەستن بە جێبەجێکردنی ئاراستەکانی مێشکەوە، واتە هەرچی خانەو ئەندام وکۆئەندام لە بەدەنی ئینساندا هەیە هەمووی لەو (14.000.000.000) چواردە ملیار خانەیەوە، کە کۆئەندامی مێشك و دەمارەکان پێ کدەهێنن، ئاراستە (توجیهات)ی بۆ دەچێ.

ئنجا دەزگای دڵو سووڕی خوێن، وەکو وەزارەتی هاتو چۆو گەیاندن وایە، هاتوچۆوگەیاندن چ دەورێك دەبینێ؟ ڕێگاوبان پاك دەکا تەوەو خۆشی دەکات، هەروەها وەك وەزارەتی شارەوانیش دەچێ چونکە زبڵو

(1) الطب محراب الإيمان، بەرگی 1 ، لاپەڕە 224 ، د. خالص الجلبی

(2) بۆ نووسینی ئەم باسەش سوودێکی زۆرم لە (الطب محراب الإيمان) وەرگرتوە.

زاڵو پاشەڕۆكی خانەكان دێنێت و فڕێی دەدات، چونكە سووڕی خوێن لە ڕێگای هەناسەدانەوە فڕێی دەداتە دەرێ.

كۆ ئەندامی هەرس (الجهاز الهضمي)یش كە خواردن و خۆراك بە سەرجەم جەستە دەگەیەنێ و پاشەڕۆكی خواردن و خۆراكیش دەرداوێتە دەرێ، وەك وەزارەتی ئازووخە گەیاندن (وزارة التموين) وایە.

ئنجا كە لە هەموو جەستەی ئینساندا لوولەی عەرەق ڕێژ هەیە، ئەوانیش زۆر وەك وەزارەتی گەشت و گوزارو هاوینە هەوارەكان وان، چونكە كاریان بریتیە لە فێنك كردنەوەی بەدەن! دەزانی بۆچی ئاسنێك لە زستاندا ئەوەندە ساردەو لە هاوینیش دا ئەوەندە گەرمە؟! بەڵام جەستەی ئینسان لە هاوین و زستاندا پلەی گەرمییەكەی (37.5) سی و حەوت و نیو، یان شتێك زیاترە یان كەمترە؟! چونكە جەستەی ئینسان بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی خۆی فێنك دەكاتەوەو خۆشی گەرم دەكاتەوە، ئەگەر سەرما بێت ئەو كون و دەروازانە هەمووی دادەخرێن تاكو گەرمی لە لاشە نەچێتە دەرێ، وە سەرماش لە دەرەوە نەیەتە ژوورێ. ئەگەر گەرماش بێت دەكرێنەوە تاكو گەرمی نێو لاشە بچێتە دەرێ و فێنكی بێتە ژوورێ، هەر بۆیەش ئینسان لە هاوینان دا ئەوەندە ئارەقە دەكات.

پێست و پێڵوی چاو و نینۆك و مووەكانیش تا ئەندازەیەك دەوری وەزارەتی دەرەوە دەبینن و نوێنەری جەستەی ئینسانن بۆ دەرەوەو هەڵسوكەوت و مامەڵە لەگەڵ دەرەوەدا.

کۆئەندامی هەناسەدانیش تا ئەندازە یەك وەك وەزارە تی ئابووری دەچێت، چونکە بە هەردوو کاری هێنان و ناردن (الإ یراد والتـ صدیر) هەڵدەستێت وئۆکسجین دێنێت ودووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەنێرێتە دەرەوە.

کۆئەندامی ئێسك و جومگەکان و ماسولکەکانیش، زۆر وەك وەزارەتی بەرگری و سوپای دەوڵەت دەچن، چونکە بەوانە ئینسان دیفاع لە خۆی دەکات و هێرش دەکات.

جەرگ(کبد)یش زۆر بە نێوەندی گومرگی گ شتی (مر کز الجـ مارك العام) دەچێت، چونکە هەر خواردنێك لە گەدە (مـ عدة)دا هەرس دەکرێت حەتمەن دەبێ بە جگەردا بڕوات، جگەریش ئەوەی کە مەقبووڵ بێت بۆ نێو ڕیخۆڵەو خانەکانی لاشە ڕەوانەی دەکات و ئەوەش کە تێ یدا لە گومان دابێت دەیگێڕێتەوەو ئەوەی کە قا چاخیش ب یێت لە ر یێی گورچیلەکانەوەو بە هۆی میزەوە بە خێرایی فڕێ دەدرێتە دەرێ!

سپڵ (طحال)یش وەك گۆڕستانێك وایە بۆ خڕۆکە سوورەکان کە دوای ئەوەی کۆچیان کردوەو مردوون هەموویان دەچن بۆ نێو سپڵو لە سپڵدا دەشارڕێنەوەو دەنێژرێن.

جێگای سەرنجیش ئەوە یە، هەر خڕۆکە یەکی سوور کە دە چێت گەردێکی ئاسنی لەگەڵدایە، کە وەك تابووت وا یە بۆی، بەڵام کە دەچێت بە تابووتە کەوە ناذ یژرێت، چونکە سپڵ وەك گۆڕ ستانی مسوڵمانانەو لەسەر شەریعەتی ئیسلامییەو ئەوە نامسوڵمانانن کە بە تابووتەوە مردوو دەنێژن! جا ئەو گەردە ئاسنەی کە لەگەڵ ئەو خڕۆ کە سوورە مردووە دەچێت لەگەڵی نانێژرێت، بەڵکو دەگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی دووبارە خڕۆکەیەکی سووری دیکەی پێ دروست بکرێتەوە، لە شەریعەتی

ئیسلامی دا نابێت تابووتەکە لەگەڵ مردووەکەدا بنێژرێت، بەڵکو دەبێ تابووتەکە بگەڕێنرێتەوەو چارێکی دی بۆ مردوویەکی دی بەکار بهێنرێتەوە.

هەروەها (مۆخ) کە لە کرۆکی ئێسقانەکان دا هەیەو، هەڵدەستێ بە دروستکردنی خڕۆکە سوورو سپییەکان (واتە خڕۆکەی سپی دەنکۆڵەدار)، وەك وەزارەتی پیشەسازی (وزارة الصناعة) دەچێ.

شایانی باسیشە خڕۆکە سوورەکان ئۆکسجین و خواردن دەبەن بۆ خانەکان و لەوێشەوە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دێننەوەو خڕۆکە سپییەکانیش بەرگری لە وڵاتی لەش دەکەن و هەر میکرۆبێك بچێتە نێو جەستەی مرۆڤەوە خڕۆکە سپییەکان یەکسەر بەگورج و گۆڵی شەڕی لەگەڵ دا دەکەن و ئەو کێم و زووخاوەی کە لە برینەکانی جەستەدا دەبینرێ، هەمووی جەستەو لاشەی خڕۆکە سپییەکانە کە لە شەڕی بەرگریدا کوژراون!

کۆئەندامی میز (الجهاز البولی)یش کە سیستەمی نێووەی جەستە دەپارێزێ و هاوسەنگی دەکات و پاك و پوختەی ڕادەگرێت، وە شلەمەنییەکانی نێو بەدەن ڕێکوپێك دەخات، ئەوەی کە بەکەڵك نەیەت دوای ئەوەی کە دەیپاڵێوێت لە ڕێگەی میزەوە فڕێی دەداتە دەرێ و، ئەوەش کە بەکەڵك بێت لەنێو میزدا دەیهێڵێتەوە، بەڵێ ئەم کۆئەندامەش زۆر وەك وەزارەتی نێوخۆ دەچێ، چونکە ئەرکـــی وەزارەتی نێوخۆ ئەوەیە کە کاروباری نێو وڵات ڕادەگرێ و دەیپارێزێ.

پێنج هەستەکانیش بەتەواو کەر و هاوکارانی وەزارەتی دەرەوە دادەنرێن، وەك چەند دەزگاو چەند ئۆرگانێکی زۆر چوست و چالاك.

کۆئەندامی دەنگ و زمانیش وەك وەزارەتی ڕاگەیاندن (وزارة الاعلام)ەو مرۆڤ هەرچییەکی بوێ لە ڕێی کۆئەندامی دەنگ (الجهاز الصوتي)و زمانەوە بە خەڵك و دەوروبەری خۆی ڕادەگەیەنێ.

ئەدی وەزارەتی ئەوقاف لە کوێیە؟!

جێی سەرنجە کە لەنێو ئەو هەموو وەزارەتانەدا وەزارەتی (ئەوقاف) دیار نیە!! جا ئایا هۆی دیار نەبوونی ئەو وەزارەتە چیە؟! هۆیەکەی ئەوەیە کە لە ڕوانگەی شەریعەتی خواوە (دین) دائیرەی تایبەتی نیە کە لەوێ دا کورت هەڵبێ! بەڵکو (دین) دەبێ بچێتە هەموو بوارو مەیدانەکانی ژیانەوەو پێویستە لە هەموویدا دەوری هەبێ و دەستی هەبێ! خوای کاربەجێ ئیسلامی وا ناردوەو دیاری کردوە کە سەرچاوەی سەرجەم ڕێساو یاساکانبێ و دەزگاکانی دەوڵەت بەپێی ئاراستە(توجیە)ی وی بەڕێوە بچن نەك تەنهایەك وەزارەت بەناوی وەزارەتی (ئەوقاف) یان (کارو باری ئایینی) یان (کارو باری ئیسلامی)!![1]

بەڵێ بەڕێزان!

(1) دیارە لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە بوون(وجود)ی ئیسلام بەس لە وەزارەتی ئەوقاف دا کورت هەڵنەهێنرێ و سەرجەم وەزارەت و دەزگاکانی دیکەش (ئیسلامی) بن، نەك تەنها وەزارەتی ناوبراو، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە وەزارەتی ناوبراویش نەهێڵرێ و بە یەکجاری هەر چی پەیوەندی یە لە گەڵ ئیسلام دا -لە سەر ئاستی حکوومەت- بپچڕێنرێ!

ئینسان هەمووی ملکەچە بۆ فەرمانی خوا بۆیە خوای کار بەجێ شوێنێکی تایبەتی لەنێو جەستەی دا دیاری نەکردوەو تایبەت نەکردوە بە دینداربیەوە! چونکە کیانی مرۆڤ هەمووی دیندارەو مل کەچە بۆ خواو ئەو یاسا فیطری‌یانەی کە بۆی دانراون! دیارە هەر میللەت و دەوڵەتێکیش بیەوێ بە مسوڵمان لە قەڵەم بدرێ، نابێ تەنیا مزگەوت‌و ئەوقاف‌و شتی وا بۆ دین دیاری بکات! بەڵکو دەبێ لە هەموو لایەنەکانی ژیان دا ملکەچی شەریعەتی خوا بێت و پێوەی پابەند بێت!

جا بەڕێزان!

ئەوەی ڕابرد کورتەیەك بوو سەبارەت بە چۆنیەتی شایەدییدانی زانیاری و زانست لەسەر بوون و بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوای بێ وێنەو هاوتاو هاوەڵ (سبحانه وتعالى).

ئێستاش نۆرەی خستنەڕووی چۆنیەتی شایەدییدانی سێیەمین شایەدی دادگەر (شاهد عدل)ە لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوای بەرزو مەزن کە بریتیە لەو سروشت (فطرة)ەی کە خوا مرۆڤی لە سەر سروشتاندوە.

بەڕێـــــزان!

ئەم دوو دەرسە کە تەرخانمان کردوون بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی شایەدییدانی فیطرەتی ساغ و سەلامەتی مرۆڤ لەسەر ئەوە کە تەنها خوای بێ وێنەو بەرز، بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگاری بوون و بوونەوەرو کائیناتە، دابەش دەبن بۆ شەش خاڵ، کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە:

1- پێناسەو نیشانەکانی فیطرەت و سیفەتە خوارسکەکان.

2- چەند دەقێکی قورئان و سوننەت لە سەر خوارسک بوونی خواناسیی و خواپەرستیی لە سروشتی مرۆڤ دا.

3- ڕیشەکانی خوارسك بوونی خواناسی لە دەروونی مرۆڤ دا.

4- پەرچەکانی رێی فیطرەت لە بواری خواناسیی و خواپەرستیدا.

5- هۆکارەکان و چۆنیەتی لابردنی پەرچەکانی رێی خواناسیی و پاککردنەوەو بێدارکردنەوەی دڵ و دەروون.

6- چەند قسەیەکی نەستەقی زانایانی هۆشیار و بێدار.

الحمدلله وحده والصلاة والسلام على من لا نبـيّ بعده وكل من الـتزم دربه.

بەڕێزان!
بە پشتیوانی خوا ئەم بابەتەمان لە شەش خاڵاندا دەخەینە ڕوو:

## خاڵی یەکـەم:
## پێناسـە و نیشانەکانی فیطرەت و سیفەتە خواڕسـکەکان:

پێشتر باسمان کرد کە فیطرەت کە بە (الخِلقة، السجية، الطبع) یش ناودەبرێ، بریتیە لەو سروشتەی کە خوا (سبحانەو تعالی) مرۆڤی لەسەر خولّقاندوە بەر لەوەی هۆکارە دەرەکییەکان بیگۆڕن یان کەم و زۆر بیخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە.

مەبەست لە فیطرەتی مرۆڤ ئەو حاڵەتە ئەسڵییە خواڕسك و سروشتییەیە کە خوا ئینسانی لەسەر خولّقاندوەو لە سەر سرو شتاندوە ئەویش بریتیە لەوە کە ئینسان خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی خۆی دەناسێ و پێی ئاشنایەو بۆی تینوو یەو لەناخەوە حەز لە بەندایەتیی بۆ کردن و پەرستنی دەکات.

ئەوە لەبارەی پێناسەی فیطرەتەوە، لەبارەی سیماو نیشانەکانی سیفەتە فیطری و خوارِسکەکان و تایبەتمەندییەکانیشیانەوە دەڵێین:

سیفەت و خەسڵەتە فیطرییەکان چوار نیشانەو تایبەتمەندیی سەرەکییان هەن:

1) سیفەتە فیطرییەکان- کە یەکێکیان خواناسییە- گشتی و هەمەلایەنەن و هەموو خەڵك تێیاندا بەشدارە، بۆ وێنە سۆزی دایك بۆ کۆرپەکەی، عیشق و پەیوەندی نێرو مێ لەگەڵ یەکتر، یان ئەوە کە ئینسان حەز دەکات شتی هەبێت و خاوەنی شت بێت، ئەوە کە ئینسان حەز دەکات لە ناخۆشی دوور بێت و حەز لە خۆشی دەکات، ئەمانە سیفەتی فیطرییان پێ دەگوترێ و هەموو مرۆڤێك ئەو سیفەتانەی هەن و خەڵك بەگشتی تێیان دا بەشدارە.

2) نیشانەی دووەمی سیفەتە فیطرییەکان ئەوەیە کە ئینسان بۆ خۆی هەستیان پێ دەکات و پێویستی بە فێرکردن ناکات، پێویستی بەوە ناکات کە هیچ کەس، دایك یان باب فێری خۆشویستنی منداڵەکانی بکات، بەڵکو خوای کاربەجێ وای ئینسان دروست کردوە کە منداڵی خۆی خۆش بوێت، هەروەها مرۆڤ پێویستی بەوە ناکات کە فێری ئەوە بکرێت کە ئارەزووی جینسی هەبێت، یان پێی خۆش بێ زیان و زەرەری لێنەکەوێ و هەر لە خۆشیدا بژێت، ئەمانە هەموویان شتی فیطریین و ئینسان بەبێ فێرکردن و فێربوون، دەیانزانێ و هەستیان پێ دەکات، جا خواناسیش یەکێکە لەوانەو

ئینسان بە فیطرەت خواناس و خواپەرستەو پێویست نا کات کەس فێری بکات، هەڵبەتە کاکڵ و جەوهەرەکەی وەك ڕیشەو ئەسڵ، بەڵام چۆنیەتی و وردە بابەتەکانی ئەوە شتێکی دیکەیە.

3) سیفەتە فیطرییەکان دەگونجێ کپ و خەفە بکرێن، بەڵام لەنێو ناچن و وەك ژیلەمۆی ژێر خۆڵەمێش هەر دەمێنن، بۆ وێنە: خۆشەویستی گەل و نیشتمان یەکێکە لە سیفەتە فیطرییەکان و هەموو ئینسانێك ئەو شوێنەی لێی گەورە دەبێت و ئەو خەڵکەی لەنێویاندا گەورە دەبێت خۆشی دەوێن، یەکێتی سۆڤێتی پێ شوو لە سەر بنچینەی فەلسەفەی مارکسیزم، بۆ ماوەی (70) حەفتا ساڵ دژایەتی ئەو سیفەتە فیطرییانەی کرد: خۆشویستنی گەل و نیشتمان، خۆشویستنی شت هەبوون و موڵکایەتی تاکیی (الملكية الفردية)، ئازادیی فیکرو بیروڕا دەربڕین، ئازادیی کەسیی.. بەڵام لە ئەنجامدا فیطرەت زاڵ بوو بەسەر حکومەت و سیستەم داو خەڵك ئەو ڕژێم و سیستەمەی ڕەفز کرد!! کەواتە فیطرەت دەگونجێ کپ بکرێ و خەفەو بێدەنگ بکرێ، بەڵام ناگونجێ لەنێو ببردرێ، دیارە هەستی خواناسین یەکێکە لەو هەست و نەستە فیطریی و خوارسکانەی کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ دا تێکهەڵشێلراون.

جا هەر کاتێك ئەو زەخت و فشارە کە بە شێوەیەکی کاتی چۆتە سەر ئەو سیفەتە فیطرییەو کپی کردوەو خەفەی کردوە، ئەما دیسان ئەو سیفەتە دێتەوە دۆخی خۆی.

خوای زاناو شارەزا (سبحانەو تعالی) بە ڕوون و ڕاشکاویی لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئاماژە بەو حەقیقەتە دەکات، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾ (لقمان-32)، واتە: کاتێك شەپۆلێکی وەك کۆمەڵێك هەوری تاریك دایان دەپۆشێ، لە خوا دەپاڕێنەوەو گەردن کەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوەو دەڵێن: خوایە بەس بۆ تۆ گەردن کەچین! لە جێگایەکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِ ﴾ (الزمر-□)، واتە: کاتێك ئینسان ناڕەحەتییەکی دێتە ڕێ لە پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوەو بۆ لای دەگەڕێتەوە لە ناخییەوە، بەڵام پاشان کە ئەو ناڕەحەتی و گرفتارییە بەسەر چوو، وە چاکەیەکی پێ بەخشی، ئەوە کە لە پێشدا لەخوا دەپاڕایەوە ئەو حاڵەتەی نامێنێ و لەبیری دەچێتەوە، وە هاوبەشان بۆ خوا دادەنێ، بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕێگەی خوا لابدات..

4) چوارەمین نیشانەیان ئەوەیە کە سیفەتە فیطرییەکان، لە کاتێکدا هەلومەرجی پشکووتن و گەشەکردنیان بۆ نەڕەخسێ، یاخود پەرچ (مانع)ێکیان بێتە ڕێ، مەرج نییە گەشە بکەن و سەرهەڵبدەن و پەیدابن.

واتە: هەرچەندە وەك ئامادەیی (بالقوة) لە هەموو ئینسانێكدا هەن، بەڵام هەتاكو هەلومەرجیان بۆ نەڕەخسێ و زەمینەیان بۆ ساز نەبێ بە كردەوە (بالفعل) پەیدا نابن.

زانینی ئەم ڕاستییەش بۆیە گرنگە چونكە ڕەنگە یەكێك بڵێ: باشە بۆچی لە ڕوسیاو لە چین، یان لەو شوێنانەی كە زۆر بانگەشە بۆ بێدینایەتیی و بێبڕوایی و بانگەشە بۆ خوانەناسیی دەكرێت، بۆ خەڵك خوانەناس دەردەچێت؟! لە وەڵامدا دەڵێین لەبەر ئەوەی لەو جێیانە فیطرەتی خەڵكیان شێواندووەو پەرچ(مانع) هەیە لەبەردەم فیطرەتداو ئیشیان لەسەر ئەو مەسەلەیە كردوە، كاتی خۆی لە یەكێتی سۆڤێت لە قۆناغی ساوایی و باخچەی ساوایانداو لە قۆناغی سەرەتاییشدا وەك ڕژێم ئیشیان دەكرد لەسەر منداڵ كە تێی بگەیەنن: خوا نیە! كەواتە: كاتێك كە هەستە فیطرییەكان دژایەتییان بكرێ و سەركوت بكرێن، عەجایب و سەیر نیە كە خەفەو كز بن و كپ و بێدەنگ بن و دەرنەكەون، هەرچەندە وەك ئامادەیی هەر هەن، بەڵام مادام ڕێیان لێ بگیرێ دەرنەكەوتنیان بەكردەوە شتێكی چاوەڕوان كراوە.

## خاڵی دووەم:

## چەند دەقێکی قورئان و سوننەت لەسەر خواڕسك بوونی خواناسیی و خواپەرستیی لە سروشتی مرۆڤدا:

خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (الروم-30). واتە: ڕووی خۆت بەرامبەر بە دینی ڕێك ڕابگرە، ئەو دین و شەریعەتە کە خوا فەرمانت پێ دەکا کە خۆتی لەگەڵدا ڕێکبخە هەر ئەو فیطرەت و سروشتەیە کە خوا خەڵکی لەسەر خوڵقاندوەو دروستکراوی خوا ناگۆڕێ، هەر ئەوەیە ئایینی ڕێك و ڕاست بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

واتە: ئەو شەریعەتە کە خوا ناردوویەتی، وەڵامگۆی داخوازییەکانی ئەو فیطرەت و سروشتەیە کە خوا مرۆڤی لەسەر سروشتاندوەو کەس ناتوانێ فیطرەتێك کە خوا ئینسانی لەسەر دروست کردوە بیگۆڕێ، ئا ئەوە دینێکی ڕاستە کە بە پێی سروشت و داخوازی دەروونی ئینسانە، بەڵام زۆرینەی خەڵك نازانن کە شەریعەتی خوا وەڵامگۆی داخوازییە سروشتییەکانی ئینسانە.

لەم ئایەتەوە دەردەکەوێ کە (دین)[1] و(فیطرەت) یەکن، فیطرەت و سروشتی ئینسان لەگەڵ شەریعەتێك کە خوا ناردوویەتی یەکن، وا تە پێکەوە تەباو گونجاون و دوو ڕووی یەك حەقیقەتن، هەر بۆیەش هەندێك لە زانایان گوتوویانە: خوای پەروەردگار دوو شەریعەت و بەرنامەی بۆ ئینسان داناون، شەریعەتێکی ڕواڵەتی[2] (ظاهري) کە بریتییە لەو دینەی خوا ناردوویەتی و ئەوەیان بەڵگە(حجة)یە لە سەر خەڵك، وە شەریعەتێکی دەروونیی(باطني)یشی لە دەروونی هەموو کەسێکدا داناوە کە بریتیە لە سروشت(فطرة)ی!

لە سووڕەتی (النور)یش دا خوای پەنهانکار هەر ئاماژەی بەو مەسەلەیە کردوە کە فەرموویەتی: ﴿.... نُورٌ عَلَى نُورٍ ....﴾(35)، واتە: نووری شەریعەت لەگەڵ نووری فیطرەت، کە ئەگەر هەردوو ڕووناکییەکان یەکتر بگرنەوە بۆ ئینسان دەبێتە ڕۆشنایی لە سەر ڕۆشنایی.

پێغەمبەری خواش (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((کل مولود یولد علی الفطرة، فأبواهُ یُهودانهِ أو یُنصرانهِ أو یُمجسانه، کما تولد البهیمة بهیمة جمعاء هل تُحسّون فیها من جدعاء؟!))[3] واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیطرەت و سروشت (ئەو فیطرەت و سروشتەی کە خوای

---

(1) واتە دینی ڕاست و تەواوی خوا (عزّو جل) کە لەم ڕۆژگارەدا تەنها لە ئیسلامدا بەرجەستەیە.

(2) ڕواڵەتی: واتە بینراو و بەرچاو، نەك ڕووکەشی .

(3) رواه البخاري ومسلم.

پێ دەناسێ) لەدایك دەبێت، دوایی دایك و باوكی و دەورو بەری خراپ دەیگۆڕن و دەیكەن بە جوولەكە، یان بە نەصرانی، یان بە ئاگرپەرست (مجوسی)، (ئنجا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) نموونەیەك دەهێنێتەوەو دەفەرموێ): وەك چۆن ئاژەڵ بە تێرو تەواویی لەدایك دەبێت و هیچ كەموكووڕی لە ئەندامەكانیدا نیە، جا ئایا هەست دەكەن هیچی گوێی بڕابێت (یان داخ كرابێت)؟!

بێگومان نەخێر، بەڵكو دوایی ئینسان بۆ خۆی دەستكاری دەكات و بەشێك لە گوێی دەبڕێ، یان شوێنێكی داخ دەكات بۆ نیشانەكردن یان هەر مەبەستێكی دیكە.

كەواتە منداڵیش كە لەدایك دەبێت خواناسە، بەڵام دوایی دایك و باوكی خراپ و دەوروبەر و ژینگەی خراپ سروشتە خواییەكەی دەگۆڕن.

هەروەها پێغەمبەر (علیه الصلاه والسلام) لە فەرموودەیەكیدا فەرموویەتی: خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ((خلقتُ عبادي حُنفاء فأجتالتهم الشّياطين))[1] واتە: بەندەكانی خۆمم پاك و وازهێنەر لە شتی پووچ و ڕوو لە خواكەر دروستكردوون، بەڵام شەیطانەكان بە دەوریاندا دێن و دەیانگۆڕن (واتە لە خواناسییەوە بەرەو دوور لە خوایی).

هەروەها ئەم سێ ئایەتەش زۆر لە زانایان بە بەڵگە دەیانهێننەوە لەسەر ئەو مەسەلەیەی بە فیطرەت و زگماك خواناس بوونەی مرۆڤ: ﴿وَإِذ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ

---

(1) رواه البخاري ومسلم .

أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ أو تقولوا انما أشرك آباؤنا من قبل وكنّا ذرّيةً ضعفاء من بعدهم، أَوْ تَقُولُواْ إِنَّمَا أَشْــرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّــا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ ، وَكَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ (الاعراف 172-174)،

واتە: وەیادبکەوە کاتێك کە پەروەردگارت لە پشتی ئادەم وەچەی ئادەمی وەرگرت، وە کردنی بە شایەد بەسەر خۆیانەوە و پێی فەرموون ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! گوتیان با، شایەدیی دەدەین لەسەر خۆمان (جا دەفەرموێ) بۆیەش ئەو شایەدییەمان لێیان وەرگرت نەوەك رۆژی دوایی بڵێن ئێمە بێئاگابووین لەم (خواناسی و خواپەرستی)ە، یاخود نەوەك بڵێن باب و باپیرانمان هاوبەشیان بۆ تۆ دانابوو لە پێشداو ئێمەش وەچەو نەوەیەك بووین لەدوای ئەوان (و بەدوای ئەوان کەوتین و لاسایی ئەوانمان کردەوە) جا ئایا بەو کردەوەیەی کە رێ لێ تێک چووە خرا پەکارەکان کردیان دەمان فەوتێنی؟! (دوایی دەفەرموێ) ئاوا ئایەتەکانی خۆمان شی دەکەینەوە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە (لە رێی چەوتی دوور لە خواییەوە بۆ رێی راستی خواپەرستی).

ئەم ئایەتانە زانایان لە تەفسیرەکانیان دا مشتومڕو جیاوازی زۆر یان لەسەریان هەیە کە دەتوانین بڵێین، لە دوو راوبۆچوونی سەرەکیدا کورت هەڵدێین:

**رای یەکــــەم:** هەندێکیان دەڵێن: بەکردەوە خوای دادگەر (عزّوجل) لە دەشتی (عەرەفات) ئادەمی(علیە السلام) هێناوەو هەرچی وە چەو نەوەیەتی لە شێوەی گەردیلەی ورددا لە پشتی دەرهێناوەو عەقڵ و

شعووری پێداون و دواندوونی و فەرمووویەتی: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش هەموویان گوتوویانە بەڵێ تۆ پەروەردگاری ئێمەی، بۆ ئەوەی بیانکات بە شایەد لەسەر خۆیان! جا ئەوانەی ئەم بۆ چوون و ڕا یەیان هە یە و ێڕای سێ ئایە تەکان چەند فەرموودەیەکیش بە بەڵگە دەهێننەوە.

ئنجا ئەو فەرموودانەش کە لایەنگرانی ڕای یە کەم بە بەڵ گەیان دێننەوە گرنگترینیان لە ڕووی بەڵگەهێنانەوە (استدلال)وە ئەم دووانەن:

1) عن أنس رضي الله عنه عن النبـي ﷺ قال: ((يُقال للرّ جل من أهل النار يوم القيامة: أرايت لو كان لك ما على الأرض من شيء أكُنت مُفتدياً به؟! قال يقول: نعم، فيقول: قد اردّتُ أهون من ذلك، قد أخذت عليك في ظهر آدم ان لا تُشرك بي شيئاً فاب يت الاّ أن تُشرك بي.)). رواه البخاري ومسلم.

واتە: ئەنەس لە پێغەمبەرەوە گێڕاویە تەوە کە فەرموو یەتی: بە ئینسانی دۆزەخی لە ڕۆژی دواییدا دەگوترێ: ئایا ئەگەر هەرچی لەسەر زەوی هەیە، هەمووی موڵکی تۆ بێ، دەیکەی بە بەلاّ گێڕەوە(فدیە) بۆ خۆت؟ دەڵێ: بەڵێ. ئەویش پێی دەفەرموێ: کاتی خۆی لەمە کەمترم لە تۆ داواکرد، لە پشتی ئادەمدا بووی بەڵێنم لـێ وەرگرتی کە هاوبە شم بۆ دانەنێی، بەلاّم ڕازی نەبووی و هاوبەشت هەر بۆم دانا!

2) پێغەمبەری خوا ﷺ: ((إن الله تعالى أخذ المي ثاق من ظ هر آدم (عليه السلام) بنعمان يوم عرفة، فأخرج من صُلبه كل ذريةٍ ذرأ ها

فنثرها بين يديه ثم كلّمهم قُبُلا، قال تعالى: الـ ست بربكم؟! قالوا بلى.. الـى... مبطلون)).[1]

واته: خوای بەرز پەیمانی لە پشتی ئادەم لە (نعمان -کە شوێنێکە لە عرفات) لە ڕۆژی عەرەفەدا وەرگرت لە وەچەی ئادەم (علیە الـ سلام) و هەر وەچەیەکی کە لە ئادەم دەبێت هەمووی لە پشتی دەرهێناو لە پێش خۆی بڵاوی کردنەوە، ئنجا ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ کردن و فەرمووی ئایا من پەروەردگارتان نیم؟! گوتیان: با.. هەتا و شەی (مبط لون). وا تە: وەچەی ئادەم (علیە السلام) گفتوگۆکەیان لەگەڵ خوای بەرزو بێوێنەدا بەردەوام بووە بەو شێوەیە کە لە ئایە تەکانی ژ مارە (172، 173)ی سوورەتی (الاعراف)دا هاتوە.

ئەمە لەبارەی چۆنیەتی بەڵگەهێنانەوەی لایەنگرانی ڕای یە کەم بۆ سەلماندنی ڕاو بۆ چوونەکەیان دەر بارەی تەف سیری سێ ئایەتە کەی (الاعراف).

**ڕای دووەم:** هەندێکیشیان دەڵێن: مەبەست لەم ئایەتانە ئەوە نیە کە خوای بێوێنە وەچەی ئادەمی لە پشتی ئادەم دەرهێنا بێو قسەی لەگەڵ کردبن و ئەوانیش شایەدییان لەسەر خۆیان دابێت! بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە خوا مرۆڤەکانی وا خوڵقاندوە بە زمانی حاڵ هەموویان شایەدیی دەدەن کە تەنها خوا (تبارك وتعالى) پەروەردگارو خاوەن و پەرستراویانە.

---

(1) رواه الإمام أحمد والنسائي وحاكم وقال صحيح على شرط الشيخين.

لایەنگـرانی ڕای دووەم و چۆنیەتی بەلگـەهێناوەوەیان:

لایەنگرانی ڕاوبۆچوونی (دووەم) کە (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: ئەمە ڕای زۆرێك لە زانایانی پێشین (سلف)و پاشین (خلف)ە، کە دەڵێن: مەبەست لەو ئایەت و فەرموودانەی ڕابردن، ئەوەنیە کە خوای بێهاوەڵ بە کردەوە وەچە (ذُرّیة)ی ئادەمی لە پشتی ئادەم دەرهێنابێ و کردبی بە شایەد بەسەر خۆیەوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە خوا ئینسانەکانی لەسەر سروشتی خوا بەیەکگرتن (التوحید)و خواناسی و بەندایەتی بۆ خواکردن سروشتاندوەو خوڵقاندوە، وەك گوتوویانە: (المراد بهذا الأشهاد أنّه فَطَرَهم علی التوحید)[1]، وە گوتوویانە: مەبەست لە (وأشهدهم علی أنفسهم) واتە: (أوجدهم شاهدین بذلك قائلین له حالاً) واتە: خوای بەبەزەیی وای دروستکردوون کە بە زمانی حاڵ ئەوە بڵێن. چونکە هەم وشەی شایەدیی (شهادة)و هەم وشەی پرسیار (سؤال) دەگونجێ بە زمانی وتار بن وە دەشگونجێ بە زمانی حاڵ بن، چۆن؟

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَى أَنفُسِنَا﴾ ئەوە دیارە بە زمانی وتارە، بەڵام مەبەست پێی زمانی حاڵە، بەڵام لە سوورەتی (التوبة)دا کە دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَاجِدَ الله شَاهِدِينَ عَلَى أَنفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ﴾ (التوبة-[illegible])، لێرەدا مەبەست زمانی حاڵە، دەفەرموێ: هاوبەش دانەر (مشرك)ەکان بۆیان نیە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان

(1) واتە: مەبەست لە کردنە شایەت ئەوەیە کە (خوا) لە سەر خوا بە یەکگرتن سروشتاندوونی.

بکەنەوە لە کاتێکدا شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن بە کوفر، ئاشکراشە کە شایەدیی لەسەرخۆدانی هاوبەش دانەرەکان ئەوە نەبووە کە بۆ خۆیان هاوار بکەن کە ئێمە کافرین، بەڵکو بە زمانی کردارو حاڵ شایەدییان لەسەر خۆیان داوە کە ئەهلی کوفرن.

هەروەها بۆ پرسیارکردنیش، جاری وایە بەزمانی وتار(مـقال)ەو جار وایە بە زمانی حاڵە، بۆ نموونە: خوا لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ (□□□)﴾. واتە: پرسیار لە هەندێك شت مەکەن کە ئەگەر بۆتان دەربکەوێ پێی تووشی زیان ببن، لێرەدا ئەو پرسیارکردنە بە زمانی وتار(مقال)ە.

جاری واش هەیە، پرسیارکردنەکە، بەزمانی حاڵ و کردارە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ﴾(إبراهيم-34)، واتە: هەر شتێك کە داواتان کردوە خوا پێی داون، دیارە ئینسانەکان پێش ئەوەی داوا لە خوا بکەن بۆ هەموو پێداویستیەکانیان خوای بەخشەر بۆی خوڵقاندوون، کەواتە مەبەست داواکردنە بە زمانی حاڵ و کردار.

ئنجا من پێم وایە ڕای دووەم بەهێزترو پەسندترە، بۆ چی؟! چونکە: ڕای یەکەم لەسەر مرۆڤ نابێتە بەڵگە(حجة)، بەڵام خوای پەروەردگار لە ئایەتەکەدا وەك بەڵگە(حجة) باسی ئەو شایەدیی لەسەرخۆدانە دەکات، کە هەم بۆ ژیانی دنیاو هەم بۆ ڕۆژی دوایی بەڵگە(حجة)یە لە سەر مرۆڤەکان، بۆیەش دەڵێین: شایەدییدانی مرۆڤان لە سەر خۆیان و ئیعیتراف لێوەرگرانیان لە لایەن خواوە بەپێی تەفسیرو ڕای یەکەم،

نابێته بەڵگە لەسەریان، چونکە هیچ کەس لە بیری نیە کە لە ڕۆژی بەرێ وە خوا (عزّوجلّ) لە پشتی ئادەم دەری هێنا بێ و دوا ندبێتی و بەسەرخۆیەوە کردبێتی بە شایەدو پەیمانی لێوەرگرتبێت!! شتێکیش کە ئینسان لە بیری نەمابێت نابێتە بەڵگە لە سەری! بەڵام هەموو ئینسانێك ئەوەی لەیادو لەبیرەو ئەوەی ئاگا لێیە کە بە دڵو هەناو و بە فیطرەت تینوو و عەودالە بۆ خوای بەرزو میهرەبان و، دیارە ئەوەش دەبێتە بەڵگە(حجة) لە سەری هەر چەندە خوای کاربەجێ تاکو بەڵگە(حجة)ی شەریعەت نەنێرێ بە تەنیا بە بەڵگەی (فیطرەت)ئینسان سزا نادات وەك فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولاً ﴾(الإسراء-15).

## خاڵی سێیەم:

## ڕیشەکانی خواپرسك بوونی خواناسیی لە دەروونی ئینساندا:

بەڕێـــزان!

هەست و هاندەری خواناسیی و خواپەرستی لە فیطرەت و دەروون و ناخی مرۆڤـدا کۆمەڵێك بنج و ڕەگ و ڕیشەی هەن کە گرنگترینیان بە بۆچوونی بەندە- ئەم پێنجەی خوارەوەن:

**(ڕیشەی یەکەم):** بریتیە لە تینوو بوون و عەودالّ بوونی دروستکراو (مخلوق) بۆ بەدیهێنەر(خالق)، واتە دروستکراو (مخلوق) دروستکەر

(خالق)ی خۆی خۆش دەوێ و بۆی تینوویەو حەز دەکات لێی نزیك بێت و فەرمانبەریی بۆ بکات.

بەڵگەمان ئەوەیە، کە خوای بەرزەیی، نەك هەر بۆ ئینسان بەڵکو دەربارەی دروستکراوەکانی بەگشتی بە گیاندارو بێ گیانەوە فەرموویەتی: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ﴾ (الإسراء-44). واتە: حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی تێیان دا هەیە، هەمووی پاکی بۆ خوا ڕادەگەیەنێ و هیچ شتێك نیە کە خوا بە پاك نەگرێ و ستایشی خوا نەکات.

بەڵێ.. هەموو دروستکراوەکان بەدیهێنەر(خالق)ی خۆیان خۆش دەوێو ستایشی دەکەن و بەپاکی دەگرن.

**(ڕیشـــەی دووەم)** بریتیە لە: خۆشەویستی و ڕێزو سەرسامی ئینسان بەرانبەر بە تەواویی و جوانیی و پایەبەرزیی خوای تاك و پاك و یەکجار جوان و بەرزو چاك، چونکە ئینسان لە دەروونەوە تێروتەواویی(کمال)و جوانیی (جمال)و شکۆو پایەبەرزیی(جلال)ی خۆش دەوێ و ئەم سیفەتانەو سەرجەم سیفەتە بەرزو جوانەکانی دیکەش بە چاکترین و بەرزترین شێوە لە خوای بەرزو بێ وێنەدا هەن، بۆیە مرۆڤ لە دەروون و قوڵایی ناخییەوە ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستی و سام و هەیبەت و سەرسامیی بەرانبەر بە خوا (تبارك وتعالى) هەیە.

ئنجا با سەرنجێکی ئەم چەند ئایەت و فەرموودەیەش بدەین:
خوای بەبەزەیی و بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (الروم-27)، واتە: سیفەتی هەرە تەواو، تێروتەواویی(کمال)ی رەها (مطلق) تەنها بۆ خوایە لە ئاسمانەکان و زەویدا، وە ئەو زاڵی کاربەجێیە.

دەربارەی جوانییش، کە خوا (عزّوجلّ) ئەوپەڕی جوانیی هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ان الله (عزّوجلّ) جميل يُحب الجمال)) رواه البخاري. واتە: خوا زۆر جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت. وە لە فەرموودەیەکی راست (صحیح)دا هاتوە کە ئەهلی بەهەشت کاتێك لە بەهەشتدا خوای بەرزو مەزن دەبینن، هەر نیعمەتێکی دی کە لە بەهەشتدا پێیان دراوە لە چاو شادبوون بە دیداری خواو دیتنی خوا (تبارك وتعالى) هەموویان لەبیر دەچێتەوە، یان نیعمەتی تەماشاکردنی رووی خوای پەروەردگاریان پێ لە هەموو نیعمەتەکانی دیکە بەرزترو گەورەترو چاکتـرە.

دەربارەی شکۆ(جلال)و پایەبڵندیی خوای بەرزو مەزنیش، خوا فەرموویەتی: ﴿تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ ذِي الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾(الرحمن-78). واتە: بەرزو بەپیزە ناوی پەروەردگارت کە خاوەنی ئەو پەڕی پایەبڵندیی و رێزو حورمەتگرتنە. (واتە هەم بەرزو بەرێزەو هەم رێزیش لە غەیری خۆی دەگرێ).

**(ڕیشەی سێیەم)**ی خواناسیی لە دەروونی ئینساندا، ئەوەیە کە ئینسان ئەسڵی چاکەکاریی و چاکەکارانی خۆش دەوێت، هەموو ئینسانێك وایە، بۆ وێنە کە باسی (حاتەمی طائی) دەکرێت، کە زۆر بەخشەر بووە، ئینسان هەر لە خۆیەوە حاتەمی خۆش دەوێت، بێ ئەوەی هیچ چاکەو بەخشێشیکیشی لە حاتەمەوە پێ گەیشتبێت، بۆچی؟ چونکە تۆ چاکەو چاکەکارانت هەر لە دەروونەوە خۆش دەوێت، یاخود کاتێك باسی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و سیفەتە بەرزەکانیان دەکرێت، یان باسی بوێریی و ئازایەتی (حمزة، علی، خالد، زبیر)و جەنگاوەرانی دیکەی ئیسلام دەکرێ، یان باسی هەر سیفەتێکی دیکەی باشی هەر کەسێك بکرێت، ئینسان ئەو کەسەو سیفەتەکەیشی خۆش دەوێت.

کەواتە: ئەسڵی چاکەکردن و چاکەکاران بە سروشت خۆشەویستن، جا بێگومانیش خوای پەروەردگار لە هەموو کەس چاکەکارترە، بەڵکو هەر ئەو چاکەکاری ڕەهایەو هەر نیعمەت و چاکەیەکیش هەیە هەمووی لە خواوەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ﴾ (النحل-53)، واتە: هەر چاکەیەك لە دەستی ئێوەو دەوروبەرتاندا هەیە هەمووی لە خواوەیە، وە کاتێك ئازارو زیانێکیشتان تووش بێ هەر هانا بۆ لای خوا (عزّو جلّ) دەبەن.

ئنجا بە تەئكید چاكەی خواش لەگەڵ چاكەی خەڵكی خوادا بەرانبەر ناكرێ و ئینسان ئەگەر ئینسانێكی چاكەكاری خۆش بوێ، وە چاكەی ئینسانێكی چاكی خۆش بوێ، دەبێ چاكەو نیعمەتەكانی خواو دەبێ خوای خاوەن چاكەی چەند خۆش بوێ؟! وەك گوتراوە: ((أين التراب من رب الأرباب)) گڵ لەكوێیە لەچاو پەروەردگاری هەرەبەرز!

**(ڕیشەی چوارەم)** بریتیە لە تینوێتی و شەیدابوونی ئینسان بۆ هەرمانەوەو دەوڵەمەندیی و ساغ و سەلامەتی و بۆ دەسەڵات و پلەوپایە.

بەڵێ ئەم چوارە هەرچواریان داخوازی خوارسك و ڕیشەدارن لە فیطرەتی هەموو ئینسانێكدا، ئینسان پێی خۆشە بمێنێتەوەو زۆر ڕقی لە لەنێو چوونەو هەرمانەوە (خلود)ی حەز لێیە، وە زۆر دەوڵەمەندیی و بێنیازیی خۆش دەوێت و زۆر ڕقی لە نەداریی و هەژارییە، وە زۆری سەلامەتی پێ خۆشەو زۆر ڕقی لە نەخۆشی و دەردو بەڵایە، زۆر حەزی بە دەستەڵات و پلەوپایە دێت و زۆریش بە بێدەستەڵاتی و زەبوونیی قەڵس و نارەحەتە.

هەر بۆیەش (ئیبلیس) نەفرینی خوای لێبێ، كاتێك دەیەوێت (ئادەم) فریو بدات، لە كوێوە بۆی دەچێت؟ وەك خوای پەنهان زانیش هەواڵی پێداوین: ﴿**قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَى**﴾ (طه-120). واتە: ئیبلیس گوتی: ئەی ئادەم درەختێكت نیشان

بدەم کە ئەگەر لێی بخۆی هەرگیز لەنێو نەچی و بمێنییەوەو مولکێکیشت پیشان بدەم کە هەرگیز نەفەوتێ؟!

بەڵێ ئیبلیس لە دەروازەی ئەو حەزو ئارەزووە ڕیشەییانەوە پارێزی بۆ ئادەم (علیه السلام) بردوە! چونکە حەزکردن بە مانەوەو نەفەوتان و حەزکردن بە موڵك و دەسەڵات شتێکی فیطرییە لە دەروونی ئینساندا، ئادەمیش (علیه السلام) ئەوکاتە لە بەهەشت(جنة)دا بووە، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: لە باخێکدا بووە لە باخەکانی سەر زەوی، بەڵام ڕاستتر وایە لە بەهەشتدا بووبێ، ئەوەندە هەیە خوای کاربەجێ بۆ تاقیکردنەوە درەختێکی لێ قەدەغە کردوە، ئیبلیسیش لەعنەتی لێ بێ پارێزی بۆ دەبات بە مۆڵەت وەرگرتن لە خوا دەچێت دەڵێت: ئەی ئادەم! درەختێکت پێ نیشان بدەم کە ئەگەر لێی بخۆی هەرگیز نەمری؟ دیارە ئادەمیش زۆر حەزی لێبوە کە نەمرێ، وە شەیطانیش خۆی لێ دەکات بە دڵسۆزێکی ئەمیندار (ناصح أمین) چونکە پێی دەڵێ: ﴿إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ﴾(الاعراف-21)، واتە: بێگومان من زۆر بۆتان دڵسۆزم، دیارە ئادەمیش وادەزانێ کە ئەو قسەکەرە یان فریشتەیەکی خوایە، یان دڵسۆزێکی دیکەی خواییەو بە هەرحاڵ بە قسەکەی فریو دەخوات و لە درەختەکە دەخوات.

کەواتە ئیبلیس لەو لایەنەوە بۆی دەچێ کە شتێکی فیطری و خوارسکە لە دەروونی ئینساندا.

بەڵێ بەڕێزان!

هەموو ئینسانێك حەز دەكات و پێی خۆشە بمێنێتەوەو دەوڵەمەند بێت و سەلامەت و سەربەرزو خاوەن دەسەڵات بێت، بەڵام ئایا ئەو شتانە لای كێ دەست دەكەون؟! بێگومان تەنها لای خوا، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا ﴾(فاطر-10). واتە: هەركەسێك سەربەرزیی و دەسەڵاتی دەوێ، ئەوە بێگومان دەسەڵاتی ڕەها(مطلق) تەنیا لای خوایە (و هەر لەلای ئەویش دەست دەكەوێت)، هەروەها بە گشتی فەرموویەتی: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ الدُّنْيَا فَعِندَ اللّهِ ثَوَابُ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَكَانَ اللّهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ (النساء-134). واتە: هەركەسێك پاداشت و چاكە و دەستكەوتی دنیای دەوێ بێگومان خوا پاداشت و چاكەو دەستكەوتی دنیاو دوارۆژی لەلایە.

واتە: چ خێرو خۆشییەكتان مەبەستە تەنیا لەلای خوا بۆی بگەڕێن، كەواتە مرۆڤ بۆ ئەوەی دەستی لەو نیعمەتانە گیربێت كە فیطرەتی بۆیان تینوویەو دەشزانێ كە تەنها لای خوا چنگ دەكەون، بۆیە ڕووی ئەو ئاوات و هیوایانەی دەكاتە خوای بەبەزەیی و بەخشەر!

**(ڕیشەی پێنجەم)**ی خوارِسکبوونی خواناسی و خواپەرستی لە دەروونی ئینساندا، ئەوەیە کە ئینسان حەز دەکات ملکەچ و فەرمانبەر بێت بۆ خوا.

بەڵگەشمان ئەوەیە کە ئینسان هیچ کاتێك مەدارو قەنا عەت ناکات کە شتێك نەبێ گەردنی بۆ کەچ بکات، جا ئەگەر خوای پەروەردگاری دۆزیەوە کە تاکە پەرستراوی ڕاستەقینەو تەنها کەسێکە شایستەی بەندایەتی بۆکران و مل بۆ کەچکران بێت، ئەوە دیارە گەیشتۆتە ئاواتی خۆی و مەداری کاری ساز بوە، بەڵام ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك بوو دەستی لەو ئاواتە گیر نەبوو و بۆی نەکرا کە خوای بەرزو مەزن بپەرستێ، ئەوە وەك چۆن بابای تینوی ئاوی پاك و سازگار چنگ نەکەوتوو، بەناچاری هی لیّڵ و پیسیش نۆش دەکات! ئەویش هەرچۆن بووە بت و پەرستراوێکی ساختە پەیدا دەکات کە فەرمانبەریی بۆ بکات و لێی بپاڕێتەوەو بیپەرستێ، بەدرێژایی مێژوو هەر ئاوا بووە، ئینسان بەبێ پەرستراو ناتوانێ بژیت، جا ئەگەر بەهۆی هیدایەت و ڕێنمایی خواوە، خوای پەروەردگاری لێ‌هەڵکەوت و پەرستی، کە هەر ئەو پەرستراوی ڕاستەقینە (المعبود الحقیقی)یە، ئەوە باشە، ئەگەرنا شتێکی دی بۆ خۆی هەر پەیدا دەکات، تەنانەت ماددی و بێبڕوایەکانیش ئەوانیش شتێکیان هەر هەیە بیپەرستن، بۆ نموونە: کاتی خۆی مارکسییەکان ڕەخنەیان لە مسوڵمانان دەگرت کە دەچن حەج دەکەن و

بەدەوری کەعبەی خوادا دە سووڕێنەوەو ز یارەتی دە کەن، کە چی خۆشیان بەدەوری تەرمی مۆمیاکراوی (لینین)دا دە سووڕانەوەو سەردانیان دەکرد کە لە کۆشکی (کرملین)دا دایان ناوەو ئێ ستاش هەر لەوێیــە!

ئەگەر سەرنجی خەڵکی دنیا بدەین بە گشتی دەبینین ئە گەر بە دەوری کەعبەشدا نەسووڕێنەوە، کە بێگومان هەر ئەوە بۆ مرۆ ڤ شایستەیە کە تەنها بەدەوری ماڵی خوادا ب سووڕێنەوەو پێوی ستە مرۆڤ پەپولەی دەوری چرای دینی خوا بێت و هەر ئەوە شای ستەی خەلیفەی خوایە، بەڵام وەنەبێ کاتێك مرۆڤ ئەو ڕێ گاو ڕووگە یەی لــێ بزر دەبێ واز لە سووڕانەوە ( طواف) بێ نێ، بەڵکو حە تمەن شتێکی دیکە، ڕووگە (قبلە)یەکی دیکە هەر پەیدا دەکات کە بە هۆی ڕووتێکردن و بە دەوردا خولانەوەیەوە ئەو هەستەی خۆی ت ێر بکات، بۆیە دەبینی بابای بێ دین بەدەوری موڵك و ساماندا یان بە دەوری بیردۆزەکاندا یان بەدەوری دەسەڵات و پلەوپا یەدا یان بە دەوری طاغووت و خۆ بە خوازانێ کدا، بە دەوری شتێکدا هەر دەخولێتەوەو حەتمەن ئینسان بەبێ ملکەچکردن ناحەوێتەوە، دە بێ مل بۆ شتێك هەر کەچ بکات.

جا ئەوە کە ئینسان دەبێ مل بۆ شتێك هەر کەچ بکات و شتێك هەر بپەرستێ، دیارە وەك گوتمان ئەو شتەش دە بێ تەنهاو تەنها خوای تاك و پاك و خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێکی بەرزو چاك بێ،

بەڵام جاری وا هەیە لێی تێك دەچێ یان لێی تێك دەدەن و شتێكی دیكە دەپەرستێ. ئا ئەوەش یەكی دیكەیە لە ریشەكانی دینداریی و خواناسیی و خواپەرستیی لە دەروونی ئینساندا.

بەڕاستی ئەو ئایەتەی سوورەتی (الفاتحة) كە دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحة-5)، واتە ئەی خوایە! بەس تۆ دەپەرستین و داوای یارمەتیش تەنیا لە تۆ دەكەین و پشتیمان هەر بە تۆ دەبەستین، بەڕاستی ئەوە خوای پەنهانبین لەسەر زمانی فیطرەتی ئینسانەكان فەرموویەتی و تەعبیر لە هەناوو دەروونی ئینسان دەكات و بەڕاستی هەموو ئینسانێك ئەگەر فیطرەتەكەی تێك نەچووبێت دەڵێ: خوایە بەس تۆ دەپەرستین، داوای یارمەتیش تەنیا لە تۆ دەكەین و پشتیمان هەر بە تۆ دەبەستین!

## خاڵی چوارەم:
## پەرچەكانی ڕێی فیطرەت لە بواری خواناسیی و خواپەرستییدا:

مادام ئینسان ئاوا تینوویە بۆ خوای پەروەردگارو ئاوا بۆی عەودالە، ئەی چ شتێك وای لێدەكات كە خوا نەناسێ و لە خواپەرستی بترازێ و لە دینداریی دوور بكەوێتەوە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: لەڕاستیدا دڵ و دەروونی ئینسان وەك ئاوێنەیەك وایە، ئاوێنە ئەگەر ڕوون بێ و چڵك و تۆزو گەردی لێ نەنیشتبێ، هەر

شتێك بچێتە بەرانبەری وەکو خۆی نیشانی دەدات، بەڵام ئەگەر ئاوێنەکە شکا، یان تۆزو گەردو چڵك و چەپەری لەسەر کۆبۆوە، ئەوکاتە یان هیچ شتێك نیشان نادات، یان هەر شتێك نیشان بدات دەیشێوێنێت و وەکو خۆی نیشانی نادات.

فیطرەت و دەروونی ئینسانیش وەك ئاوێنە وایە، هەتا ڕوون و سپی و سافە ئەوەی بە ڕوونیی خوای بەرزو بێهاوتای تێدا درەو شاوەتەوەو تینوێتی و تاسەو عەودالّیی بۆ خوا تێدا یە، بەڵام هەرکات چڵك و غەورو ژەنگ و ژاری لێ نیشت، ئەوکاتە وەزعی لێ تێکدەچێت و دەگۆڕێ.

**ئەو شتانەی کە فیطرەت و سروشتی ئینسان لادەدەن لە خواناسیی و خواپەرستیی لە پێنج برگەی سەرەکیدا بنەڕەتییەکانیان ڕوون دەکەینەوە:**

**یەکەم: شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووەکان:**

لە شوێنەوار(أثر)یکدا[1] هاتوە کە: هیچ پەرستراوێك لە سەر زەوی نەپەرستراوە لەجیاتی خوا، گەورەتر لە ئارەزوو ((ما عبد على الأرض من دون الله أعظم من الهوى))، بەڵێ هەواو ئارەزوو بەڕاستی

(1) (أثر) لە زاراوەی فەرموودەناسان(المحدثین)دا چەمکێکی گشتی هەیە و هەم فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ و هەم قسەی پێشینەی چاك (السلف الصالح)یش دەگرێتەوە.

گەورەترین بت(صنم)ە کە ئینسان کاتێك ڕێی لـێ هەڵە دە بێ و لـ ێی تێکدەچێ و لە هیدارییەتی خوا لادەدات دەیکاتە پەرستراوێکی ساختەو دەیپەرستێ، خوای زاناو زاڵ لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿أَفَرَأَ يْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَ لَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ (الجاثية-23). واتە: ئایا سەرنجی ئەو کەسەت نەداوە کە ئارەزووی خۆی کردۆ تە پەر ستراو و دەیپەرستێ، وە خوا گومڕای کردوە هەر چەندە زانیاریشی هەبووە، وە مۆری بەسەر گوێ و دڵیەوە ناوەو پەردەی بەسەر چاویەوە هەڵکێشاوە، ئایا دوای خوا کێ هیدایەتی دەدات! بۆچی بیـر ناکەنەوە!!

هەروەها ئەو فەرموودەیەش کە پێشتر باسمان کردو پێغەمبەری خوا ﷺ لە پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ((خلقتُ عبادي حُنفاء فأجتالتهم الشياطين))[1] واتە: بەندەکانی خۆمم پاك خوڵقاندوون، بەڵام شەیطانەکان ڕێگایان لـێ تێکدان.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ((حُبُّك الشَّيء يُعْمي ويُصِمّ))[2] واتە: خۆشەویستیت بۆ شتێك کوێرت دەکات و کەڕت دەکات، واتە کە شتێکت زۆر خۆش ویست لە ئاستی کوێر دەبی و عەیب و کەموکوڕییەکانی نابینی، لە ئاستیدا کەڕ دەبی و عەیبەکانی نابیستی.

---

(1) رواه البخاري ومسلم.

(2) رواه ابوداود وأحمد، (ابن حجر العسقلاني) و (الحافظ العراقي) گوتوویانە فەرموودیەکی باش(حسن)ە.

هەروەها ئیمام شافیعی لە شیعرێکیدا گوتوویەتی:

(وعين الرضا عن كلّ عيب كليلة        وعين السُّخط تُبدي المساويا)

واتە: چاوی ڕەزامەندیی لە ئاست هەر عەیب و نەنگێك نابینا یە، بەڵام چاوی تووڕەیی کەموکووڕییان دەردەخات!

هەیە کەسێکی خۆش دەوێت عەیبەکانی نابینێ، بەڵام هەر کە نێوانی لەگەڵ تێکچوو، چاکەکانیشی لێدەکات بە عەیب! بەڵێ چاری وا یە کە ئینسان سواری ئەسپی عاطیفەو هەواو ئارەزوو دەبێت توو شی حوکمدانی ئاوا بێ ویژدانانە دەبێت.

دووەم: لەکارخستن و بەکار نەهێنانی عەقڵ و گوێ و چاو بە مەبەستی دۆزینەوەی حەق و ڕاستی.

ئەو کۆئەندام (جهاز)انەی کە خوا لە ئینساندا داینـاون، بۆ ئەوەیە کە ئینسان حەقیان پێ بدۆزێتەوەو خوایان پێ بنا سێ، جا هەر کات ێك ئینسان بۆ ئەو مەبەستە بەکاری نەهێنان، ئەوەش د ی سان فی طرەت و سروشتی تێك دەدات و دەیشێوێنێ.

وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ (الاعراف- □□□) واتە: بێگو مان زۆر ێك لە مرۆ ڤ و جنۆ کەمان بۆ دۆزەخ ئامادەکردوە، (چونکە) دڵیان هەیە پێی نافامن، چاویان هەن پێ یان

نابینن، گوێیان هەن پێیان نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن بەڵكو گومراتریش، ئەوانەن بێئاگایان.

سێیەم : پەرچی سێیەم بریتیە لە: دڵ نەخۆش بوون بەهۆی شوبهە و شەهوەتەوە.

بەڵێ بەڕێزان!

هەركەسێك گومان(شبهە)ێك یاخود ئارەزوو( شهوە)[1] یەك دڵی نەخۆش كرد، كە بە هۆی ئەم دووانە شەوە دڵ نەخۆش دەبێت، ئەوە بێگومان دەگونجێ كە خوای لەبیر بچێتەوەو لە خوا دوور بكەوێتەوە.

خوای بەخشندە فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ في قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ﴾ (آل عمران-6)، واتە: خوا ئەو زاتەیە كە كتێبی بۆت ناردۆتە خوار چەند ئایەتێكی مانا ڕۆشن (محكم)ی تێدان، ئەوانە ئەسڵ و بناغەی كتێبی خوان، وە هەندێك ئایەتی دیكەشی تێدان ماناى لەیەكچوویان هەن، جا ئەوانەی كە دڵیان لادان و نەخۆشیی تێدایە بەدوای ئەو ئایەتانە دەكەون كە مانای لەیەكچوویان هەیە، بە مەبەستی ئاژاوە نانەوەو بە مەبەستی مانا لێدانەوە یان (لە حاڵێكدا كە توانای مانا لێدانەوەیانیان نیە).

---

(1) د یارە مەبەست ئارەزوو یەكی بەدەر لە سنووری شەریعەتە، ئەگەرنا تێركردنی غەریزەو ئارەزووەكان بە شێوازێكی شەرعی دڵ نەخۆش ناكات.

خوای بەدیهێنەر (عزّوجلّ) کاربەجێیەو ئەو ئایەتانەش کە چەند مانایەك هەڵدەگرن و (متشابە)ن بۆ ئەوەیە کە شەریعەت فراوانتر بێت، وە لەبەر ئەوەیە کە هەندێك لەو ئایەتانە چەند مەسەلەیەك باس دەکەن کە لە سەرووی عەقڵی ئینسانەوەیە، هەروەها ئەوە جۆرێکیشە لە تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی، وە گەلێك حیکمەتی دیکەش، جا ئەگەر ئینسان دڵێکی ساغ و سەلیمی هەبێت بەدوای ئایەتە مانا ڕۆشن (محکم)ەکان دەکەوێت و ئایەتە خاوەن مانا لێچکوو(متشابە)ەکانیش لەبەر تیشکی ئایەتە (محکم)ەکان تەفسیر دەکات، بەڵام ئەگەر دڵەکەی نەخۆش و ناتەواو بێت، بەدوای ئایەتە (متشابە)ەکان دەکەوێت و سەر لەخۆی تێك دەدات و ئایەتە (محکم)ەکان فەرامۆش دەکات.

## چوارەم : ژەنگ هەڵێنانی دڵ و مۆرکرانی بە هۆی گوناح و لادان و خەسڵەتە پیسەکانەوە:

بەڵێ بەڕێزان!

ئینسان بە هۆی گوناح و تاوانەوە دڵی تووشی لادان دەبێت، بە هۆی خەسڵەت و سیفەتە پیسەکان(الرذائل)ەوە دڵی ژەنگ دێنێت و لادەدات و ڕوو لە خوای بەبەزەیی و بەخشەر وەردەچەرخێنێ.

بەڵگەشمان سەرەڕای واقیع و ئەزموون، کۆمەڵێك ئایەتن، یەکێك لەوانە دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ، وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ، إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ، كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ، كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ

لَمَحْجُوبُونَ، ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ، ثُمَّ يُقَالُ هَذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ (المطففين 10–16).

واتە: سزای سەخت بۆ ئەوانەی کە (پێغەمبەران و دینی خوا) بەدرۆ دەزانن، ئەوانەی کە بڕوایان بە دوارۆژ نیە، هیچ کەسیش دوارۆژ بەدرۆ نازانێ مەگەر کەسانێك کە زۆر لەڕێ دەرچوون و زۆر گوناحبارن، کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێنرێتەوە، دەڵێ: ئەفسانەی پێشینانە! نەخێر، بەڵکو ئەوانە دڵیان بەهۆی گوناحەکانیانەوە ژەنگی هێناوە. نەخێر (با وازبێنن) ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا لە بینینی پەروەردگاری خۆیان پەردەپۆش دەکرێن، (وەك چۆن لە دنیادا بەهۆی چڵکی گوناح و تاوانەوە ئاوێنەی دڵیان داپۆشراوەو خوای پەروەردگار نابینن، لە دوارۆژیشدا پەردەپۆش دەکرێن و دەخرێنە دۆزەخەوەو لە بینینی خوا بێبەش دەکرێن). پاشان لە کڵپە دۆزەخ دەبرژێنرێن. دوایی پێیان دەگوترێ: ئەمە ئەوەیە کە کاتی خۆی بەدرۆتان دەزانی.

هەروەها هەر لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ (المائدة–67). واتە بێگومان خوا کۆمەڵی کافران ڕێنمایی ناکات. کەواتە بەهۆی (کفر)ەکەیانەوە بێبەش (محروم) دەبن لە هیدایەتی خوا (جلّ شأنه)، وە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظالمين﴾(قصص–□□)، واتە: بێگومان خوا هیدایەتی کۆمەڵانی ستەمکار نادات.

وە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الفاسقين﴾(المنافقون–6). واتە: بێگومان خوا هیدایەتی کۆمەڵی لەڕێ دەرچوو و گوناحباران نادات.

وە دەفەرموێ: ﴿وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ ﴾ (ابراهيم-□□). واتە: ئەوانەی کە ستەمکارن خوا ڕێگەیان لێ تێك دەدات و سەرگەردانیان دەکات.

وە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ﴾ ( غافر-28). واتە: بێگومان هەر کەسێك زیادەڕۆیی بکات و دینی خوا بەدرۆ بزانێ، خوا هیدایەتی نادات.

وە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾(زمر-13). واتە: بێگومان خوا هیدایەتی کەسێك نادات کە درۆزنە و زۆر نا سوپاس و سپلەیە (بەرانبەر بە خوای بەرزو مەزن).

وە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ (غافر-35). واتە: ئاوا خوا مۆر بەسەر دڵی هەر خۆ بەزلگرێکی خاوەن زوڵم و ستەمەوە دەنێ.

کەواتە بەهۆی ئەو گوناح و تاوان و سیفەتە خراپانەوە ئینسان لە هیدایەتی خوا بێبەش (محروم) دەبێت، دڵەکەی ژەنگ و ژارو کەمرەی تاوان دایدەپۆشێ.

## پێنجەم: حەق نەویستی و ڕق لێبوونەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی و شەریعەتەکەی:

خەڵکی واهەیە لەبەر گەمژەیی ڕقی لە خوایەو حەق قبووڵ ناکات، دڵەکەی پیسەو خۆی پیس و پۆخڵ کردوە بەهۆی گوناح و تاوانەوە، وەك خوای زاناو زاڵ دەربارەی داروده‌ستە (آل)ی فیرعەون فەرمووبەتی:

﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ (النمل-14). واتە: یەقینیان هەبوو کە موعجیزەکانی مووسا ڕاستن، بەڵام بەهۆی ستەم و خۆ بەزلگرییەوە دانیان پێدا نەهێناو قبووڵیان نەکرد. دیارە هەر بۆیەش خوای خاوەن بەزەیی و بەخششی بێسنوور سەرفرازیی و بەختەوەریی ئینسانی بەوە بەستۆتەوە کە دڵ و دەروونی خۆی پاك بکاتەوە، لە سیفەتە نزم و خراپەکان و بیڕازێنێتەوە بە سیفەتە بەرزو باشەکان وەك فەرموویەتی: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (7) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (8) قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا (9) وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا(10)﴾ (الشمس). واتە: سوێند بە نەفس و بەوەی کە ڕێکی خستوە، ئنجا چاکەو خراپەی فێر کردوە، بێگومان سەرفرازە ئەو کەسەی کە پاکی دەکاتەوە لە سیفەتە خراپەکان و دەیڕازێنێتەوە بە سیفەتە باشەکان، وە بەدبەختە کەسێك کە لەژێر چڵك و چەپەری گوناحدا دەیشارێتەوە.

کەواتە بەڵێ فیطرەت و سروشتی ئینسان خواناسە، بەڵام دەگونجێ کۆمەڵێك پەرچ(مانع)ی بێنە ڕێ و کۆمەڵێك دەردو نەخۆشی ڕووی تێبکەن کە وای لێبکەن دڵەکەی ئەو شەوق و شەیدایی و ڕۆشناییەی تێدا نەمێنێ و تێیدا خەفە بکرێ و داپۆشرێ.

## خاڵی پێنجەم:
## هۆکارەکان و چۆنیەتی لابردنی پەرچەکانی ڕێی خواناسیی و پاککردنەوەو بێدارکردنەوەی دڵ و دەروون:

بەڕێزان!

وەك چۆن ئاسن ژەنگ دەگرێ، بەڵام دەگونجێ لەو ژەنگ و پیسییەی کە کەوتۆتە سەری پاك بکرێتەوە، دەروون و فیطرەتی ئینسانیش بە هەمان شێوە ژەنگ دەگرێت و تۆزو خۆڵ لەسەری دەنیشێت و -وەك پێشتر باسمان کرد- کەمرەی گوناح و تاوان و خەسڵەتە پیسەکان دایدەپۆشێ، بەڵام دەگونجێ ئەو ژەنگ و ژارەی لێ بوەرێنرێ و پاك و سپی و ساف بکرێتەوە.

جا ئەو ژەنگ وەراندنە لە دەروونی ئینسان و ئەو ژەنگ لابردنە لە سروشت و فیطرەتی ئینسان و ئەو مشتوماڵکردنەی ئاوێنەی دڵ و دەروونی ئینسان، دەگونجێ بە شێوەیەکی کاتی بێت و دەشگونجێ بەشێوەیەکی یەکجاری بێت.

ئنجا شێوە کاتییەکەش دەگونجێ کە ئینسان بە هەڵبژاردن (اختیار)ی خۆی بێت، یان بە ناچاری بە ملیدا بێت، وەك ئەوە کە ئینسان جاری وا هەیە دەکەوێتە تەنگانەیەکەوە، بە تایبەت کەسی زۆر بێدین و خوانەناسی وا هەبووە کە کەوتۆتە بەڵاو گرفتارییەکەوە کە پێشتر دانی بە بوونی خوادا هەر نەهێناوەو ملی بەندایەتی بۆ کەچ نەکردوە، بەڵام

لە کاتی بەلاو لێ قەومان و گرفتاری دا، وەك چەندین ساڵ بێت بەندایەتی بۆ خوا کردبێت، یەکسەر دەستی بەرزکردۆتەوەو هاواری لە خوا بەستوە!

ڕووداوی لەم بابەتە زۆر بوون، هەبووە کە لە کاتی زیندانی کردنی زۆردا، یان تووش هاتنی نەخۆشییەکی کوشندەدا کە هیچ چارەی نەبووە، یان تووش هاتنی مەترسییەکی وا کە لە لێواری مەرگ گەڕاوەتەوە یەکسەر هانای بۆ خوا بردوەو هاواری تێبەستوە بێئەوەی پێشتر سەری بۆ نەوی کردبێ!

جا ئەو جۆرە حاڵەتە کتوپڕو ڕاچڵەکێنەرانەی کە بەسەر ئینساندا دێن، وەك ئەوە وایە کە ئاسنێك یەك تەختە ژەنگ داپپۆشیبێت، تۆش چەکوشێکی زۆر بەهێزی لێبدەی و پێیدا بماڵی، دیارە یەکسەر ئەو ژەنگە هەڵدەوەرێ! دڵ و دەروونی ئینسانیش زۆرجار ئاوا پەردەیەك لە بێئاگایی(غفلة)، یان گوناح و تاوان و چڵك و چەپەرەکەیان دایدەپۆشێ و تروسکایی و ڕۆشنایی ئیمان و خواناسیی لێ قەدەغە دەکات، وەك چۆن ئاوێنە تۆزو گەردی دەکەوێتە سەرو ناهێڵێ هیچی تێدا دەربکەوێ!

بەڵام کاتێك بەسەر بەلاو گرفتاریی و ناڕەحەتییەکدا دەکەوێت و تووشی حاڵەتێك دێت کە دەستی لە هەموو پێچکان دەبڕێت، لە ئەنجامدا کە تا ئێستا بە هۆی دونیاو تەماع و ئارەزووەکانەوە خۆی لێ بایی ببوو و لە خوا دوور کەوتبۆوە، ئێستا کە ئەوانە هیچیان نامێنن، ئەوجار فیطرەت و دڵ و دەروونی ڕاستەوڕاست لەگەڵ خوای بەبەزەییدا

ڕووبەڕوو دەبێتەوەو ئەو ژەنگ و ژارە لەسەر دڵی لادەچێت، وەك كە چۆن ئاوێنەكە كە تۆزو گەردەكەی لەسەر لابچێت لە بەرانبەر هەر شتێكی ڕابگری ئەو شتەی بە جوانی تێدا دەردەكەوێت!

بەڵێ بەڕێزان!

دڵی ئینسانیش گەلێك جار ئەو ژەنگ و ژاری بێئاگایی و ئـــارەزوو پەرستییە، ئەو لاسایی كردنەوە (تقلید) یە، ئەو لەخۆبایی بوون (غرور)ە، دایدەپۆشێت و وای لـێدەكات كە خوای بەرزو بێهاو تا (عزّوجلّ) نەبینێ و هەستی پێ نەكات، بەڵام كە ئەو پەردەو ژەنگ و ژارە لاچوو، یەكسەر خوای پەروەردگار لە دڵو دەوونیدا دەدرەوشێتەوە.

خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ حَتَّى إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِمْ بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنْجَيْتَنَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ (یونس-22).

خوای شارەزا (عزّوجلّ) لەم ئایەتەدا دیمەنی كەسانێك نیشان دەدات كە لە ئەسڵدا خوانەناس و هاوبەش دانەرن، بەڵام لە كاتێكدا بە سواری كەشتی بە دەریادا دەڕۆن، شنەبایەكی هێمن هەڵ دەكات و ئەوانیش زۆر دڵخۆشن كە كەشتییەكەیان بەو بایە بە شێنەیی بەسەر ئاودا دەڕوات، بەڵام دوایی بایەكی بە گەردەلوول و بەهێز هەڵدەكات و لە هەموو لاوە شەپۆل بۆیان دێت، دڵنیا دەبن، یاخود گومانیان زیاتر وادەبێ كە تازە

ئەوە ئاخیــر جارەو لە تێداچوون دان، لەو حاڵەتەدا زۆر بە دڵسۆزیی لە خوا دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ئەگەر دەربازمان بکەی لەم کارەساتە بە تەئکید لە سوپاسگوزاران دەبین!

دیارە هۆکاری ئەو هەڵوێستەی بابای کافریش ئەوەیە کە هیچ چارەو پەنای دیکەی نیەو کەس نیە فر یای ب کەوێ و پێ شتر ڕەن گە پ ێی وابووبێت کە ماڵ و سامان، یان هێزو دەستەڵات، یان فێڵ و تەڵە کەو سیاسەت لە فریای دێت و ڕزگاری دەکات، بەڵام ئێ ستا دە ستی لە هەموو شتێك بەربووەو جگە لە خوای بەدیهێ نەر پەناو چارەیەکی دیکەی نەماوە! وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ دَعَوُاْ اللّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾ (یونس-□□) لەو کاتەدا لە خوا دەپاڕێنەوەو ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوە، واتە دەبنە بەندەیەکی ساغ و بێ خلتە بۆ خوا، وە دوو بارە دەشلێن ﴿ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴾ (یونس-□□) ئەی خوایە ئەگەر لەم بەڵاو گرفتاری و تەنگانەیە ڕزگارمان بکەی، دەبی نە بەندەیەکی سوپاس گوزار بۆ تۆ!

بەڵام زۆرجار ئەو ڕاچڵەکاندن و ڕاتەکاندنە، ئە گەر ئی مانی لە گەڵ پەیدا نەبێت، بەڵکو هەروا ناچاری و لێقەومانێك ب ێت، دوا یی ئەو کەسە دەچێتەوە سەر باری پێشوو، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا أَنجَاهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْ حَقِّ﴾ (یونس-23)، وا تە: جا کات ێك دەربازیکردن یەکسەر دەستیان کردەوە بە ستەمو خراپەکاریی بێ بیانوو و پاساو لە زەویدا.

هەڵبەتە ئەو حاڵەتی لێقەومان و دەست لە هەموو پێچکان براننە تایبەت نیە بە کەشتی و دەریاوە، بەڵکو لەسەر زەوی و لە هەوا شدا هەروایە، جاری وا هەیە کە فڕۆکە لە هەوادا تا سە دە کات، یان گەردەلوولی هەوایی لێی دەدات و ڕای دەژەنێت، خەڵکە کە پێ شتر لە قسەکردن و پێکەنین دان، بەڵام لەو حاڵەتەدا گورج دەکەونە پاڕانەوەو خوێندنی زیکرو ویرد!

بەڵام بەندەکان ناسوپاسن و سپڵەن و دوای ڕزگاربوون دە چنەوە سەر هەمان باری پێشوویان.

ئەوە حاڵەتی بێداربوونەوەی فیطرەت بە شێوەی کتوپڕ کە ئینسان ئیرادەو هەڵبژاردنی تێیدا لە ئارادا نیە.

حاڵەتی دووەمی بێداربوونەوەی فیطرەت و دڵ و دەروون، کە ئەمەیان زیاتر ئیحتیمالی ئەوەی لێدەکرێت ئینسان لەسەری بەردەوام بێت، بریتیە لەوەی کە ئینسان بە ئیرادەو هەڵبژاردن (اختیار)ی خۆی دەست بکات بە پالاوتن و لە بێژنگ دان و پاککردنەوەی دڵ و دەروونی و بێداربوونەوەو هۆشیار بوونەوەی فیطرەتی و هاتنەدەرو دەربازبوونی لە چەنگاڵی شەیطان.

وەك خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (يونس-57). واتە: ئەی خەڵکینە! بێگومان ئامۆژگاریەکتان لە

پەروەردگارتانەوە بۆ هاتوە، وە شیفا بۆ ئەوەی لەنێو سینەکانتاندا هەیە، وە رێنمایی و بەزەیی بۆ بڕواداران.

بەڵێ بەڕێزان!

ئەگەر (عەقڵ) بە حیکمەت ئیقناع دەبێ، (دڵ)یش بە ئامۆژگاری (موعظة) ڕادەچڵەکێ و بێدار دەبێتەوە، هەر بۆیەش سەیر دەکەین کە ئەهلی دڵ و دەروون، ئەهلی عیرفان و تەزکیە زۆر سەرکەوتووتر بوون لە ئەهلی عەقڵ و فەلسەفە، لەوەدا کە خەڵك هۆشیارو بێدار بکەنەوەو خەڵك لەسەر دەستیان بۆ لای خوا بگەڕێتەوەو هیدایەت بدرێ.

بۆ وێنە (عبدالقادری گەیلانی) ڕەحمەتی خوای لە سەر بێ، لە ژیانەکەیدا هاتوە کە زیاتر لە (1000) هەزار کەس لە ئەهلی کیتاب (جولەکەو نەصرانی) لەسەر دەستی مسوڵمان بووە لە شاری بەغداو دەوروبەری دا، وە 100.000 سەد هەزار کەسی گوناحبارو داوێن پیس و ڕێگرو دزو پیاوکوژو ...هتد، لەسەر دەستی ئەو (توبة)یان کردوەو بوونە ئینسانی چاك و دۆستی خوا (تبارك وتعالى).

چونکە ئەوانە[1] سەروکاریان زیاتر لەگەڵ دڵ و فیطرەتی ئینسانە، بەڵام فەیلەسووفەکان و بیریاران و ئەهلی عەقڵ، زیاتر سەروکاریان لەگەڵ عەقڵە، جا زۆرجار ئینسان بە عەقڵ شتێك دەزانێ، بەڵام کە ئەو

(1) واتە: ئەهلی تەزکیەو عیرفان، نەك بەناو ئەهلی تەصەووف و لە واقیعیش هەر سەرگەرمی گەدەو گیرفان.

زانینە نەچێتە نێو دڵ و فیطرەتییەوە نایجووڵێنێ، چونکە دڵ مەکینەی جوڵێنەری ئینسانە، عەقڵیش هۆکارو ئامرازی دەرك كردن و زانینی شتانە.

بۆیەش خوای پەروەردگار، مەگەر چۆن دەنا هەر جارێك باسی ئیمانی کردبێت باسی دڵ (قلب)یشی کردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ ﴾ (الحجرات-14)، یان ﴿كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ ﴾ (المجادلة-22)، یان ﴿ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ ﴾ (الحجرات-7)، چونکە ئەو ئیمانە[1] ئینسان دەجووڵێنێ و بەرەو خوای دەبات و وای لێدەکات کە فەرمانبەریی خوا بکات کە چووبێتە نێو قووڵایی دڵ و دەروونەوە، بەڵام ئەگەر هەر دانپێداهێنانێکی عەقڵی ڕووت بێ و دەربڕینێکی زمان بێت ئینسان ناجووڵێنێت، بۆیە خوای پەروەردگار لەو ئایەتەی پێشدا فەرموو: ئەی خەڵکینە ئێوە لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگاریتان بۆ هاتوە، شیفاو هەتووانی نەخۆشیی و زام و برینەکانی دڵ و دەروونتان بۆ هاتوە، ڕێنمایی و بەزەیی بۆ بڕواداران، کە مەبەست پێی قورئانە، چونکە بناغەو هۆکاری هاتنەدی هەموویانە!

دیسان بۆیەش خوای کاربەجێ فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتووانی دەکات کە بانگەوازی خەڵك بۆ لای خوا بکەن بە سێ شێوە، دەفەرموێ: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ

(1) لە ڕاستیدا هەر ئەوەش لە تەرازووی ئیسلام دا بە ئیمان دادەنرێ وەك لە بەرگی یەکەم دا بە درێژی باسمان کردوەو خستومانەتە ڕوو.

﴿وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (النحل-125)، بانگەواز بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە حیکمەت و بە ئامۆژگاریی باش (الموعظة الحسنة)، وە بە باشترین شێوە گفتوگۆ (مجادلە)یان لەگەڵدا بکە، ئەوە یانی چی؟!

حیکمەت بۆ عەقڵەو، ئامۆژگاری باش بۆ دڵەو، وتوویژ بە باشترین شێوەش بۆ کەسانێکە کە نە ملکەچی حوکمی عەقڵن، نە خاوەنی دڵیشن، بەڵکو کەسانی سەرەخەریکەرو نەسەلمێن و کەللەڕەقن، بۆیە چار هەر ئەوەیە کە بە باشترین شێوە بیاندوێنی و بە بەهێزترین بەڵگە بێ قسەیان بکەی و بە بەرزترین شێواز هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەی.

واتە: ئینسان لە بواری بانگەوازکردنیدا بۆ لای خوا لەگەڵ سێ جۆرە خەڵکدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، هەندێکی زیاتر بەلای عەقڵ دا شکاوەتەوەو گوێ بۆ بەڵگەی عەقڵیی و زانیاری دەگرن، بۆیە دەبێ بە لێزانیی و حیکمەت بیاندوێنی، چونکە ئەو کەسەی کە بە بەڵگەی عەقڵ و زانست نەبێ قەناعەت نەکا تۆ نابێ ئامۆژگاری بکەی. بەڵکو مادام ئەو کەسە ئیعتمادی زیاتر لەسەر عەقڵ و عیلمەو لەسەر بەڵگەیە، تۆ دەبێ لەڕێی حیکمەت و جوولاندنی عەقڵی و بەو شتانەی کە عەقڵ قەناعەتیان پێ دەکات بیدوێنی.

هەندێکیش هەن کە زیاتر بەلای دڵ و عاتیفەدا شکاونەوەو سۆزیان لە هزریان بەهێزترە، ئەوانەش وا پێویست دەکات کە بە ئامۆژگاری لەگەڵیان دا بدوێی، (موعظة)یش بریتیە لە جوولاندنی دڵو دەروون، دڵو دەروونیش بە دوو شێوە دەجوولێ، یان بە (ترغیب)یان بە (ترهیب)،

(ترغیب) واتە تەماع وەبەرنان و خستنە بەرچاوی نیعمەت و پادا شتی خوا، بەوە کە باسی نیعمەتەکانی خوای بۆ بکەی و هانی بدەی لە سەر خواپەرستیی و لەسەر پاداشتی خوا بە لێیخۆشبوون و بەهە شت، (ترهیب)یش واتە ترساندن بە دەستەڵات و توانای خواو بە تۆڵەو سزای دۆزەخ لە بەرانبەر تاوان و سەرپێچیدا، ئەوانەی کە زیاتر خاوەنی سۆز (عاطفة)ن پێویستە ئاوا بدوێنرێن، بەڵام دەبێ ئامۆژگاری یە کە باش (الموعظة الحسنة) بێت، چونکە ئەگەر خراپ بێ و بە شێوازی خۆی نەبێت، بەرهەمی نابێت و بگرە جاری وایە زیانیشی دەبێت.

کەسانی سێیەمیش ئەوانەن کە نە ئەهلی عەقڵ و نە ئەهلی دڵن، نە گوێ بۆ بەڵگەی عەقڵی دەگرێ، نە دڵ و دەروونێکیشی هە یە کە بتوانرێ بێدار بکرێتەوە، بەڵکو وەك گو تمان کەلـلەڕەق و نە سەلمێن و سەرکەشە، جا ئەوەیان دەبێ بە باشترین شێوە بدوێنرێ و ئە گەر هەر ملەجیڕەی کرد بە باشترین بەڵگە دەمکوت بکرێت، وەك چۆن ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، نەمروودی دەمکوت کرد، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ﴾ (البقرة-258)، چونکە نەمروود لە بەرانبەر بەڵگەی بەهێزی (ئیبراهیم)دا هیچی پێ نەماو شکستی خوارد، چونکە حاڵ و مەقامەکە پێویستی دە کرد کە ئەو خۆ بە پەروەردگار زانە بە بەڵگەی ڕۆشن و بێ پێچ و پەناو پتەو دەمکوت بکرێت و قسەی بۆ نەمێنێتەوە.

ئنجا ئایا فیطرەت بە چی بێدار دەبێتەوە؟! دڵ بە چی هۆشیار دەبێتەوە؟! ئاوێنەی دڵ بەچی مشتومالْ دەبێتەوە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: بێگومان بە دژو پێچەوانەی ئەو شتانە کە کەمرەو ژەنگیان پێ دەگرێ و پێیان لێڵ و تەڵخ دەبێت، فیطرەت بێدار دەبێتەوەو دڵ و دەروون ڕۆشن دەبێتەوە، ئنجا دڵ و فیطرەتیش بەمانە ژەنگ دەیگرت و لێڵ و تلْخ دەبوو:-

(1) شوێنکەوتنی ئارەزوو (اتباع الهوی)، کەواتە بە پابەندیی بە شەرعەوەو مل کەچ نەبوون بۆ ئارەزووەکان دڵ بێدارو ڕۆشن دەبێت.

(2) دڵ و دەروون و فیطرەت بە لەکارخستن و بەکارنەهێنانی عەقڵ و هەستەکان تاریك و لێڵ دەبوو، کەواتە بە بەکارهێنانیان بۆ دۆزینەوەی حەق، بێگومان ڕۆشن دەبێتەوە.

(3) دڵ و فیطرەت بە نەخۆش بوون تاریك دەبێ و تارمایی بە سەردا دێت، بەڵام بەهۆی ساغ و سەلامەتییەوە بێدارو ڕۆشن دەبێتەوە.

(4) دڵ و فیطرەت بە گومان(شبهة)و ئارەزوو (شهوة) نەخۆش دەبێ و بە لاچوون و نەمانی ئەوانە ساغ و پاك و چاك دەبێت.

(5) دیسان بەهۆی گوناح و تاوانەوە دڵ و فیطرەت ژەنگ دایدەپۆشێ و بە هۆی سیفەتە خراپەکانەوە پەردەی بەسەردا دێت، بەڵام بە هۆی فەرمانبەریی خواو چاکەکاریی و سیفەتە چاك و باشەکانەوە دڵ و فیطرەت سپی و ساف دەبێ و مشتومالْ دەبێت.

(6) بەهۆی حەق نەویستی و ڕق لێبوونەوەی حەقەوە دڵ تاریك دەبێ و بەهۆی حەق ویستن و مل بۆکەچکردنی و خۆشویستنییەوە دڵ هۆشیارو بێدارو ڕۆشن دەبێ.

فەرموودەیەك لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەگێڕدرێتەوە کە فەرموویەتی: ((ان هذه القلوب تصدأ كما يصدأ الحديد اذا أصابه الماء، قيل وما جلائها؟ قال كثرة ذكر الموت وتلاوة القرآن))[1] واتە: ئەم دڵانە ژەنگ هەڵدێنن و ژەنگ دەگرن، وەك چۆن ئاسن کە ئاوی بەردەکەوێ ژەنگ دەیگرێ، گوترا: ئایا سپی کردنەوەو سافکردنەوەکەیان بە چییە؟! فەرمووی: بەهۆی زۆر یادی مردن کردن و قورئان خوێندنەوە.

کەواتە بەم هۆیانەوە کە باسمان کردن و دژو پێچەوانەی هۆکارەکانی تێکدانی فیطرەت و لێڵ بوونی دڵن، ژەنگ و ژاری سەر دڵ لادەچێ و تارمایی لەسەر نامێنێ، وە مشتومالْ دەبێ و سپی و ساف دەبێ.

## خاڵی شەشەم :

## چەند قسەیەکی نەستەقی زانایانی هۆشیارو بێدار

(عطاء الله السكندري) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ، کە یەکێکە لە پسپۆڕەکانی بواری تەزکیەی نەفس، چەند حیکمەت و قسەیەکی نەستەقی لە بواری عیرفان و تەزکیەی نەفس و لە بواری خوانا سین

(1) رواه البيهقي وفي سنده ضعف .

(معرفة الله )دا، لـێ گێردراونەوە، کە بە ڕاستی جێی خۆیەتی بە ئاوی زێڕ بنووسرێنەوە، بۆ نموونە گوتوویەتی: ﴿كيفَ يشْرق قلبٌ صور الاكوان منطبعة في مِرآته، أمْ كيف يرحل الى الله وهو مكبل بشهواته، أم كيف يطمع أن يدخل حضرة الله وهو لم يتطهر من جنابة غفلاته، أم كيف يرجو أن يفهم دقائق الاسرار وهو لم يتب من هفواته﴾ [1] واتە: چۆن دڵێك ڕۆشن دەبێتەوە (بە نووری خواو فیطرەت چۆن نووری ئیمان تیایدا دادەگیرسێ) لە کاتێکدا کە وێنەی درووستکراوەکان لە ئاوێنەی ئەو دڵەدا تۆمارکراون؟! (واتە دڵ و دەروونێك کە پڕ بووە لە خۆشەویستی دونیاو ئارەزووەکانی دونیا، جێگەی ئیمان و خواناسی تێدا نەماوەتەوە، ئەو دڵە چۆن ڕۆشن بێتەوە !) یان چۆن دڵێك بەرەو خوا بڕوا لە کاتێکدا کە بە هۆی زنجیری ئارەزووەکانییەوە زنجیر پێچ کراوە؟ یان چۆن دەتوانی نزیك بێتەوە لە بارەگاو دیداری خوا ( سبحانەو تعالی) (ببێتە بەندەیەکی تایبەتی بۆ خواو گفتوگۆ لەگەڵ خوادا بکات) لە کاتێکدا کە لە لەش پیسیی بێئاگاییەکان خۆی نەشۆردوەو پاك نەبۆتەوە؟! (مەبەستی ئەوەیە دڵ و دەروون ئەگەر لە بێئاگایی (غفلة)دا بێت رووحەکەی لە لەش پیسی (جنابە)دایە، کە ئاواش بوو وەك چۆن ئینسانی لەش پیس بۆی نیە بچێتە نێو مزگەوت و نوێژ بکات و قورئان بخوێنێ، بە هەمان شێوە رووحیش ئەگەر هاتوو پیس بوو بە هۆی بێئاگایی و ئارەزووەکانەوە مەجالـی نیە لەگەڵ خوادا گفتوگۆ بکات !

---

(1) (إيقاظ الهِمَم في شرح الحِكَم ) لابن عجيبة / بەرگی -٢- لاپەڕە .

ئەوە شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە ئینسان لەو حاڵەتانەدا کە گوناحێك دەکات، هەر چەند دەکات سەلیقەی نا چێتە سەر قورئان خوێندن و شەفافیەتی ڕووحیی بۆ بەندایەتی نامێنیی‌و تام لە نوێژ ناکات، لە ڕەمەزاناندا بۆیە خەڵك لەزەت و تام لە خواپەرستی و نوێژو قورئان و زیکر دەکات، چونکە لە سۆنگەی طاعەت و زیکرو فیکرەوە دەروونیان پاك و ڕووناکە). دوایی دەڵێ: چۆن ئومێدی ئەوەی هەیە لە نوکتە وردەکانی خواناسیی و قورئان تێبگات و لە نهێنییەکانی حاڵی بێت کە جارێ لە وردە گوناحەکان تۆبەی نەکردوە؟! (واتە ئەگەر لە وردە گوناحان تۆبە نەکەی، لە وردە نهێنییەکانیش تێناگەی!).

(مەولەوی تاوگۆزی) شاعیری ناوداری بواری (تزکیة) و(تصوف)یش خوا لێی خۆشبێ دەڵێ:

مِمَّنْ بِهِ لِمَنْ عَليهِ يُسْتَدلْ
مسافة لا تستظل لاتُستَزل
عليك بالحركة السريعة
منْ ذي لِذِي المرتبة الرفيعة

وأخْتَرْ مِن الصفين أيّ صفٍّ
شئتَ ففيهِ فَكِّراً أو صفٍّ
فأحفظ تَفَهَّم ثم أنظر صَدِّقْ
علِما فَعيْناً ثمَ حقاً حَقِّقْ [1]

(1) (الوسيلة في شرح الفضيلة )-لاپەڕە ٧٢.

مەولەوی پێی وایە کە بۆ ناسینی خوای پەروەردگار دوو ڕێگا مان هەن: ڕێگایەکی بەڵگەیی کە عەقڵ بەڵگە لەسەر بوونی خوا دێنێتەوە، وە ڕێگایەکی دەروونیی کە بریتیە لەوەی دڵ و فیطرەت بۆ خۆی خوای بێوێنە دەبینێ، جا دەڵێ: ڕێگایەك کە خوا بکەی بە بەڵگە لە سەر دروستکراوەکانی، لەچاو ڕێگایەك کە دروستکراوەکانی بکەی بە بەڵگە لەسەر خوا، بەین و ماوەیەکی زۆر هەیەو ئەو دوو ڕێگایە زۆر لە یەك دوورن، کە تۆ بڵێی من بەڵگەم ئەوەیە کە ئەم بوونەوەرە هەیە، چونکە خوا هەیە، وە بە هۆی ئەوەوە کە خوا هەیە دەزانم بوو نەوەریش هە یەو خەون و خەیاڵ نیە، ئەمە شێوازی بەڵگە هێنانەوەی ئەهلی دڵە لەسەر بوونی خوا، دەڵێن: ئێمە ناڵێین لەبەر ئەوەی بوو نەوەر ئاواو ئاوا یە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا هەیە، بەڵکو دەڵێین: لەبەرئەوەی بە دڵ و فیطرەت خوا دەبینین، دەزانین کە ئەم بوونەوەرەش هەیە، جا (مەولەوی) دەڵێ: ئەوە کە تۆ خوا بکەیە بەڵگە لەسەر بوونی درو ستکراوەکانی، ماوەیەکی یەکجار دوور هەیە لەگەڵ ئەوەی کە تۆ درو ستکراوەکان بکەیە بەڵگە لەسەر بوونی خوا، بۆیە دەڵێ: لە ژێر هیچ سێبەرێك دامەنیشەو ئیسراحەت مەکەو خێرا بڕۆو یەکسەر خۆت بگەیەنە بە ڕێی یەکەمیان و ڕێی دووەم مەگرەو لە خۆت وریابە با هەڵنەخلیسکێنرێی .

---

تێبینی: (الفضیلة) کتێبەکەی (مولوی) یەو مامۆستا مەلا عبدالکریم ( مدرس)یش شەرحێکی لەسەر کردوە بە ناوی (الوسیلة).

پاشان دەڵـێ: زۆر بەخێرایی بڕۆو ڕێگا ببڕە، لەوەی کە دروستکراوەکان بکەیە بەڵگە لەسەر خوا، بۆ ئەو پلەی بەرزتر کە خوای بەرزو بێوێنە بکەیە بەڵگە لەسەر دروستکراوەکانی .

دوایی دەڵـێ: بۆشت هەیە لەو دوو ڕێزانە یەکێکیان هەڵبژێری، واتە: ئەو دوو کاروانەی خواناسان کە هەردووکیان بەرەو خوا حەرەکەتیان کردوە، یەکێکیان بە بەڵگەی عەقڵیی و ئەوی دیکەیان بە بەڵگەی دەروونیی، یەکیان دروستکراوەکانی کردۆتە بەڵگە لەسەر خوا، ئەوی دیکەشەیان خوای کردۆتە بەڵگە لەسەر درووستکراوەکان، بۆیە هەر کامێکیان هەڵدەبژێری هەڵبژێرە، یان بیربکەوە لە بوونەوەر لە ڕێی عەقڵەوەو بوونی خوای پەروەردگار ببینە، جا یان دڵ و دەروونت ساغ و صاف بکەوە، زانیارییەکان لەبەر بکەو لێیان ورد بەرەوە تێیان بگە، پاشان سەرنج بدەو ئەوجار بڕوا بێنە، واتە: سەرەتا (علم الیقین) پەیدا بکەو لە دواییدا (عین الیقین)و پاشانیش (حق الیقین)، چۆنیەتی جیاوازی نێوان ئەم سێ جۆرە زانیاری(علم)یەش بە هێنانەوەی وێنەیەك ڕوون دەکەینەوە: کاتێك دەبیستین کە باغێك لە فلانە شوێن هەیەو دڵنیا دەبین لە ڕاستی ئەو هەواڵەو زانیارییەکی پتەوو دڵ لە سەر دامەزراومان لە بارەیەوە پەیدا دەبێ ئەوە (علم الیقین)ە و زانیاری (عین الیقین)یش ئەوەیە کە بۆ خۆت بچی و بە چاو سەیری باغەکە بکەیو زانیاری (حق الیقین)یش ئەوەیە کە بچیتە نێوی‌و دەست لە دارو درەخت و میوەکەی بدەی و لێی تام بکەی . دیسان (عطاء الله الاسکندري) لە

پاڕانەوەو ڕازو نیازێكدا لەگەڵ خوای بەخشندە دە ڵێ: ﴿إلهي كيف يُسْتَدل عليك بما هو في وجوده مُفْتَقِرٌ اليك! أيكون لغيرك من الظهور ما ليس لك حتى يكون هو المُظْهِرَ لك؟! متى غِبتَ حتى تحتاج الى دليل عليك؟ ومتى بعدت حتى تكون الآثار هي التي توصل اليك؟! عَمِيَتْ عينٌ لا تراك عليها رقيباً وخسرت صفقة عبد لم يَجعل لَه من حُبِّكَ نَصيباً﴾ (1) واتە: ئەی پەرستراوم ! چۆن بەڵگە لە سەر بوونی تۆ دەهێنرێتەوە بە شتێك كە بۆ بوونی پێویستی بە تۆیە؟! (واتە: بوونەوەر چۆن دەبێ بكرێتە بەڵگە لەسەر ئەوە كە تۆ هەی! لە كاتێكدا كە تۆ نەبووای بوونەوەر نەدەبوو، وە ئەگەر تۆش نەتەوێ بوونەوەر بمێنێ نامێنێ!) ئایە دەبێ غەیری تۆ بوونەكەی لە تۆ ئاشكراتر بێت تاكو بە هۆی بوونی غەیری تۆوە بوونی تۆمان بۆ دەردەكەوێت؟!، جا تۆ كەی ون بووی و پەنهان و شێردراوە بووی هەتا پێویستیمان بە ڕێ پیشاندەر (دلیل)ێك بێت تۆمان پێشان بدات؟! وە تۆ كەی دوور بووی تاكو شوێنەوارەكانت ئێمە بگەیەننە لای تۆ؟! (هەمیشە تۆ نزیكی) ئەو چاوە كوێر بێت كە هەمیشە تۆ بە سەرخۆیەوە بە چاودێر نابینێ،وە سەوداو مامەڵەی بەندەیەك زەرەرمەندو پڕ لە زیانە كە بەشی لە خۆشەویستی تۆدا نیە .

بەڵێ بەڕێزان: ئەهلی تەزكیەو عیرفان و پسپۆڕانی مەیدانی دڵ، ئاوا باسی خوا دەكەن و بێگومان لە بازاڕی فیطرەت و لە بازاڕی

(1) (إيقاظ الهمم في شرح الحكم ) بەرگی -٢- لاپەڕە ٤٧٠-٤٧١.

تەزكیەو پالاوتنی دەروون و نەفسدا ئەم قسانە هەموویان لە جێ گەی خۆیاندان بەلام بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە عەقلّ واز لــێ بێنین و زانیاری و پێنج هەستەكان پشت گوێ بخەین، چونكە هەموو كەس ناگاتە ئەو مەقامە كە هەمیشە خوای پەروەردگار بە چاوی دلّ ببینــێو هەمیشە هەست بە نزیكی بكات و خوای چاودێرو پەنهانبین بەسەر خۆیەوە بە چاودێر ببینــێ، بەلّكو ئینسان بە گشتی بۆ خواناسین لە پێنج هەستەكانەوە دەست پێ دە كات، دوا یی دەگا تە عەقلّ و پاشانیش دەگاتە دلّ، وە لە ڕاستیدا وەختێك كە دەگاتە حالّەتی ناوبراو، ئەوە دەگاتە ئەو مەقامەی كە پێی دەگووترێ: (ئیـ مانی شهوودی)كە بریتیە لەوەی ئینسان هەمیشە بە دلّ خوای بێهاوتا ببینــێ، وە ئەوەش مەقام و پلەی (إحسان)ە، كە پێغەمبەر (علیه الصلاة وال سلام) لە پێناسەیدا فەرموویەتی: ﴿الإحسان أن تعبد الله كأنك تراه فأن لم ت كن تراه فأنه یراك﴾ [1] واتە : (إحسان) ئەوەیە كە بە جۆرێك خوا بپەرستی كە دەیبینی، یان ئەگەر واش نەبێ كە پێت وابێ دەیبینی، پێت وابێ ئەو دەتبینێ. جا براو خوشكانی سەنگینم !، لێرەدا هاتیـ نە كۆ تایی ئەم باسەو ڕوونمان كردەوە كە چۆن هەركام لە: عەقلّ و زانیاری و فیـ طرەت شایەدو بەلّگەی بەدیهێنەرایەتی وپەروەردگاریەتی خوای بەرزو مەزنن و خستمانەڕوو كە چۆن چۆنی لە ڕ ێی پ ێنج هە ستەكان و عەقلّ و فیطرەتەوە خوای بەرزو بەبەزەیی دەناسین!

---

(1) رواه مسلم عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه.

# بەندی چوارەم

# قورئان بەرزترین شێوازی سەلماندنی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوای تێدایە

## دەرسەکانی : دوازدە و سێزدە و چواردە

بەڕێزان :

ئەم سێ دەرسەی(12 و 13 و 14) کە بەندی چوارەمی ئەم کتێبەیان لێ پێکدێ ، تەرخان کراون بۆ توێژینەوەی شێوازو چۆنیەتی قورئان بۆ سەلماندنی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوا (عزّوجل)وە ئەم سێ دەرسە سەرجەم لە شەش خالآن پێکهاتوون کە ئەمانەن:

1- پێناسەو حیکمەت و پاساوی وەحی .

2- قورئان لە ڕێی هەرکام لە: پێنج هەستەکان و عەقلّ و فیطرەتەوە ئینسان بەرەو خواناسیی دەجوولێنێ، وێڕای زانیاری تایبەتی خۆی دەربارەی خوا (عزّوجل) .

3- هەمیشە قورئان پەروەردگارێتی خوا، دەکاتە بەلّگەی تەنیا پەرستراوێتی خوا.

4- قورئان دەستی مرۆڤ دەگرێ و لەگەلّ دیاردەو دیمەنە واقیعییەکاندا ڕووبەڕووی دەکاتەوە.

5- قورئان دلی ئینسان رادەچلەکێنێ وفیطرەتی خەوتووی بەخەبەر دێنێ

6- قورئان بەرپەرچی شوبهەکان دەداتەوەو گومانەکان لە بەر یەك هەلّدەوەشێنێ.

شایانی باسیشە کە بە پێویستمان نەزانی دەرسەکان لە یەك جیابکەینەوەو ناوونیشانەکانیان سەربەخۆ بنووسین، چونکە باس و بابەتەکانیان پێکەوە پەیوەست و تێ هەلّکێشن .

الحمد لله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم وبارك على خاتم النبيين وسيد المرسلين محمد وآله أجمعين من الصحب والازواج والقرابة والذرية والتابعين لهم باحسان الى يوم الدين .

## خاڵی یەکەم :

## پێناسەو حیکمەت و پاساوی وەحی

### مانای وشەی (وحي):

خاوەنی فەرهەنگی (لسان العرب)(ابن المنظور) دەڵێ: (الوحي، الأشارة، والكتابة، والرسالة، والألهام، والكلام الخفي، وكل ما ألقيت الى غيرك)(1) واتە: (وحي) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا یانی: ئاماژە بۆ کردن، نووسین، پەیام، خورپە (إلهام) قسەی پەنهان، هەر شتێك کە بە غەیری خۆتی بگەیەنی . هەروەها (ابن المنظور) دەڵێ: (أصل الوحي في اللغة كلها اعلام في خفاء، ولذلك صار الألهام يسمى وحيا)(2) واتە: (الوحي) لە ئەسڵی زماندا ئاگادارکردنەوەیەکی بە پەنهانییە، بۆیەش (إلهام) پێی دەگووترێ (وحي). بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە یەکێك لە ماناکانی وشەی (وحي) فێرکردنی پەنهان و ئیلهامە ئەوەیە کە خوای

(1) لسان العرب /لابن المنظور / بەرگی -١٥-لاپەڕە-٢٣٩ .

(2) هەمان سەرچاوە / بەرگی -١٥-لاپەڕە-٢٤١.

بێهاوەڵ فەرموویەتی: (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ) [1] واتە: پەروەردگارت (وحي) بۆ مێش هەنگوینە(هەنگ) نارد، کە بە واتای فێرکردنی پەنهان و ئیلهامە. وە بەڵگەش لەسەر ئەوە کە یەکی دیکە لە ماناکانی ئاماژە (إشارة)یە ئەم ئایەتەیە: ﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيّاً﴾ (مريم- 11) چونکە (أَوْحَى إِلَيْهِمْ) واتە ئاماژە بۆکردن. (الأزهري) کە یەکێکە لە زانایانی زمان دەڵێ: (وكذلك، الأشارة والإيماء يسمى وحياً) واتە: ئاماژەکردن و هێما بۆکردن بە دەست، ئەوەش پێی دەگوتری (وحي)، وە زمانزانان گوتوویانە: دەنگی زێڕو زیوو خشڵیش پێی دەگوترێ (وحي) چونکە دەنگێکی کپ و پەنهانە. ئەوە وەك ئەسڵی مانای (وحي) لە زماندا، بەڵام لە زاراوی شەرعدا وەك زاراوەیەکی شەرعی: ئەوە بە سەرنج دانی چەند دەقێکی قورئان وسوننەت بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە (وحي) بریتییە لەو پەیام و ئاگادارکردنەوەی کە خوای بەرزو بێوێنە ئاڕاستەی پێغەمبەرانی خۆی کردوە (عليهم الصلاة والسلام)، بە شێوەیەك لە شێوەکانی ئاڕاستەکردن .

وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوّاً لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدىً وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (البقرة -97) [2] واتە: بڵێ هەر کەسێك کە دوژمنی (جبريل)ە، ئەوە ئەو

(1) ( النحل ) -٦٨.
(2) البقرة -٩٧.

قورئانی ناردۆتە سەر دڵی تۆ بە فەرمانی خوا کە ئەوەی پێش خۆی هەموو بە ڕاست دەزانێ، وە ڕێنمایی و موژدەو دڵخۆشییە بۆ بڕواداران. کەواتە (وحي)، (جبريل) لە لایەن خواوە دەیهێنێ د یارە لە گەڵ فریشتەکانی دیکەدا چونکە مەرج نیە هەر بە تەنیا بیهێنێ-.

ئینجا خوای بەخشەر لەم ئایەتەدا جۆرەکانی (وحي)و شێوازەکانی هاتنی ڕوون دەکاتەوە،کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلا وَحْياً أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾[1] واتە: هیچ ئینسانێك شایستەی ئەوە نیەو بۆی نیە کە خوا گفتوگۆی لەگەڵدا بکات، مەگەر (وحي) بۆ بنێرێ، یان لە پشت پەردەوە، یان فریشتەیەکی بۆ ڕەوانە بکات و ئەوەی کە خوا بیەوێ بە فەرمانی وی پێی ڕابگەیەنێ، بێگومان ئەو بەرزی کاربەجێیە. (واتە: وەحی ناردنی خوا بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) سێ جۆرە: یان ڕاستەوخۆ دەیخاتە نێو دڵی، یان لە پشت پەردەوە دەنگ دەبیستێ و هیچ نابینێ، یان فریشتەیەك دەنێرێ بۆ لای. جا چ لە شێوەی فریشتەکە خۆیدا، یان لە شێوەی ئینسانێکدا) ئنجا دەفەرموێ: جا بە فەرمانی خوا ئەوەی کە خوا بیەوێت پێی ڕابگەیەنێ بۆ ئەو پێغەمبەرەی دەنێرێ، بێگومان خوا بەرزی کاربەجێیە. پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)یش لە وەڵامی (الحارث بن هشام)دا کە لێی پرسیوە: يا رسول الله (كيف يأتيك الوحي؟) ئەی پێغەمبەری خوا (وحي) یت چۆن بۆ دێت؟!

(1) ( الشورى ٥١ ).

فەرموویەتی: (أحياناً في مثل صلصلة الجرس فَيُفْصَمُ عنّي وقد فهمت ووعيت ما قال، وأحياناً في مثل صورة الرجل فيكلمني فأعي ما يقول)[1]، واتە: جاری وا هەیە وەك دەنگی جەرەس(زەنگۆڵە) وایە، جا كاتێك تەواودەبێ ئەو دەنگە نامێنێ، دەبینم هەموو شتێك حاڵی بووم و چاك دەزانم كە ئەوەی گوتوویەتی چی بوو، وە جاری واش هەیە( جبريل) لە شێوەی پیاوێكدا دێت بۆ لام، قسەم لەگەڵدا دەكات و هەمووی بە تەواوی وەردەگرم كە دەیڵێت .

دیارە خەون (رؤيا)ش بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) جۆرێكە لە جۆرەكانی (وحي)[2]، وە خورپە (الهام)یش هەروەها شێوەیەكە لە شێوەكانی.

كەواتە بە شێوەیەكی گشتی (وحي) چوار جۆری هەیە:[3]

1)كە (جبريل) (عليه السلام) لە شێوەی ئینسانێكدا دێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، یان هەر لە شێوەی ڕاستەقینەی خۆیدا، كە وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە (محمد) دووجاران، جارێك لەسەر زەوی و یەكیان لە ئاسمان و لە شەوی میعراجدا (جبريل)ی لەسەر شێوەی خۆی بینیوە .

---

(1) البخاري و مسلم / كتاب الشريعة / للأجري/ بەرگی .3 لاپەڕە 1466 .

(2) بە بەڵگەی بەسەرهاتی (ابراهيم و اسماعيل)ی كوڕی عليهما السلام: (... قال يابني إني أرني في المنام أني أذبحك ..) (الصافات –١٠٢) . (٢) (الذاريات –٥٦).

(3) (البخاري ومسلم) / كتاب الشريعة / للأجري/ بەرگی –3 – لاپەڕە 1466 .

2) کە دەنگی (جبریل) وەك دەنگی زەنگوڵە (جرس) ببیستێ. مەرجیش نیە ئەوانەی لە دەوری بوونە بیستبیان .
جاری واش بووە وەك دەنگی هەنگ بیستوویانە .

3) جۆری سێیەمیش ئەوە بووە کە لە خەوندا پ ـێی بـ ـگوترێ، چونکە خەونی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) جۆرێکە لە وەحی وەك پێشتریش باسمان کردوە کە (ابن عباس) گوتوویەتی: (رؤیا الأنب ـیاء وحي) وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتوە .

4) جۆری چوارەمیش خورپەوخرانە نێو دڵ (الهام) بووە ئەویش ئەوە ـیە کە بە بێ ناردنی فریشتە، یان بیستنی دەنگ وەك دەنگی زەنگۆ ـڵە بووبێ.

پاساو (مبـرِّر)و حیکمەتی نێررانی وەحییش، کە ئایا بۆچی ـخوای پەروەردگار لە رِێی (جبـریل) و فریشتەکانەوە (وحي) بە پێغەم ـبەران (علیهم الصلاة والسلام)، بۆ ئینسانەکان دەنێرێ؟

بۆ رِوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەو وەڵامی ئەم پرسیارە ـبە ـکورتی دەڵێیـــن:

پەیام و وەحی ناردنی خوا (عزّوجل) بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام): حیکمەتەکەی ئەوەیە کە خوای کار ـبەجێ، ئین ـسان و ج ـند (جن)ی بۆ بەندایەتی کردن دروستکردوون، وەك فەرموو ـیەتی: ﴿وَ مَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾[1] واتە: جنۆکەو ئین ـسانم ـبەس ـبۆ

---

(1) ( الذاريات –56 ) .

بەندایەتی کردنم دروستکردوون، بەندایەتی کردنیش بۆ خوا پێویستی بە وەحی هەیە، چونکە، هەرچەندە عەقڵ و فیطرەت دەزانن خوا هەیە، بەڵام ئایا چۆن بیپەرستین و بەندایەتی بۆ بکەین، وە ئایا ئەو خوایە پێی خۆشە ئینسان چی بکات و چی پێ خۆشە ئینسان نەیکات و خۆی لێ بپارێزێ ؟! وە ئایا بە چی ئینسان لە خوا نزیك دەبێتەوەو چۆن لێی دوور دەکەوێتەوە؟! ئینجا ڕوونکردنەوەی حەڵاڵ و حەرام، ئەمرو نەهی، چاکەوخراپە، دۆست و دوژمن ..... هتد ، پاشان ئەو خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارە ناوو سیفەتەکانی چین؟! وە ئایا ئەم ژیانی دونیایە چی لە دوا دێت؟! چۆن چۆنی چاکەکاران پاداشت و خراپەکاران سزا وەردەگرنەوە؟! ..... هتد. بێگومان ئەم مەسەلانەو هاووێنەکانیان عەقڵ بە تەنها سەرەدەریان لێ ناکات، بۆیە پێویستە بۆ دەرککردنیان و لێتێگەیشتنیان ڕووبکاتە ئاسمان و خوای بە بەزەیی و بەدەنگەوە هاتوو لە ڕێی وەحی و پەیامی خۆیەوە لەو بارەوە بەر چاوی ڕوون بکاتەوە وە شارەزای بکات .

بەڵێ بەڕێزان !

ئینسان بەبێ وەحی و پەیام و ڕێنمایی خوا ناتوانێ ئەو ئەرکەی لەم ژیانە دنیاییەدا بۆی دیاریکراوەو ئەو حیکمەتەی بۆی وەدیهێنراوە بیهێنێتە دی، کەچی بێبڕوایانیش گەورەترین ڕەخنەیان لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوە بووە کە مرۆڤن و مرۆڤیش شایستەی ئەوە نیە خوا بیکاتە پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خۆی: ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَنْ

يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَى إِلَّا أَنْ قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَراً رَسُولاً ﴾ (الاسراء -94)
دیارە ڕیشەی فیکریی ئەم هەڵوێستەی بێبڕوایانیش ئەوەیە کە بە چاوی سووك و بەبێ ڕێزیی تەماشای ئینسان دەکەن و پێیان لەوە کەم تـرو بچووکترە کە خوا (عزّوجل) بیدوێنێ و فریشتەی بنێرێتە لا!

بەڵێ بەڕاستی ڕێزو حورمەت و قەدری مرۆڤ هەر لە بەرنامەی خوا دایە، ئاخر ئەوە لە کوێ کە بڵـێی خوا منی کردوە بە جێنشینی خۆی و لەسەر زەوی تاقیم دەکاتەوە، وە خوا چاودێری لەسەر داناوم و پێغەمبەرو بەرنامەی تایبەتی بۆم ناردوە؟! لەگەڵ ئەوە کە تۆ بڵێی: خوا نیەو ئەو دروستی نەکردووم!، یان بڵێی: خوا حەقی منی نیەو حەواڵەی عەقڵی خۆمی کردووم!، یان بڵێی: بەڵـێ خوا هەیە، بەڵام بە ڕەگەزو ڕە چەڵەك دەچمەوە سەر مەیموون و بەرازو چەقەڵ! ئەو جۆرە تێڕوانینەی پێشـێ لە کوێ و ئەمەیان لە کوێ!!

شایانی باسیشە کە هۆی ئەو بە هەڵە دا چوونەی بێبڕوا یان لە بەسووك سەیرکردنی ئینساندا لە سۆنگەی ئەوەوە بووە کە وێرای خوانەناسی خۆشیان نەناسیوەو زیاتر لە ڕووی جە ستەیی و لە ڕووی ڕواڵەتەوە تەماشای ئینـ ـسانیان کردوە، نەك لە ڕووی ماهیـ ـیەت و سروشت و فیطرەت و ڕووحەوە! ئینجا دیارە کە ڕێزو حورمەتی ئینسان و پلەو پایەیشی لە ڕووحەکەیدا شێردراوەتەوە، نەك لە جەستەی دا، خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ

سَاجِدِينَ﴾[1] واتە: جا کاتێك جەستەی ئادەمم لە گڵ ڕێکخست، وە لە ڕووحی خۆم فووم بە بەردا کرد، کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ بەرن! بە لێی (ئادەم) (علیه السلام) بابی مرۆڤان دوای ئەوەی خوا فووی بە بەردا دەکات و دروستکراوێکی تایبەتی خۆی کە ڕووحە دەخاتە نێو جەستەیەوە ئەوجار شایستەی ئەوە دەبێ کە فریشتەکان کڕنووشی بۆ بەرن و ڕێزی لێبگرن. کەواتە: گەورەیی و ڕێزو نرخ و بەهای ئینسان لە ڕووحەکەی دایە، دیارە بێبڕوا ماددییەکانیش دان بەوەدا ناهێنن کە ئینسان درووستکراوێکی دانستەی خوایەو خوا لە ڕووحی تایبەتی خۆی فووی بە بەردا کردوە، بۆیە ئاوا بە چاوێکی بێڕێزەوە سەیری دەکەن و گۆزەش چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ! پاشان لە ڕاستیدا ئەوەش ڕاست نیە کە ئینسان لە ڕووی جەستەو قەبارەوە یەکجار نابووت بێت، بە تایبەت دوای ئەوەی زانیاری زۆر بەرەو پێشەوە چووەو گەردیلە دۆزرازوتەوە، یەکێك لە زانا ئەورووپاییەکان دەڵێ[2]: جەستەی ئینسان لە سەرجەم

(10.000.000.000.000.000.000.000.000.000)

گەردیلە، ئەستێرەیەکی مام نێوەندیش دیسان قەبارەکەی بریتیە لەوە کە ژمارە (١) دابنرێت و (٢٧) سفری لە پێشەوە بێت ئەوەندە ژمارەیە

(1) ( ص -٧٢ )، ( الحجر 29) .

(2) بڕوانە (الأنسان في العالم الحديث) لاپەڕە-١٦٤- كە تەرجەمەی عەرەبی ئەو كتێبە یەو خاوەنی كتێبی:(الطاقة الأنسانية ) - أحمد حسين- لێی وەرگرتوە ، لاپەڕە -٢٠٩-.

جە ستەی ئینـ سان کۆبکرێ تەوە، هێ ندەی ئە ستێرەیەك دەبـ یێت، هەندێکیشیان دەڵێن:
ژمارە (١) یەك (28) بیست و هەشت سفری لە پێشەوە بێت .

کەواتە ئینسان ئەگەر لە خوار خۆیەوە تەماشا بـ کات تا دەگا تە گەردیلە، وە لە سەرووی خۆیەوە تەماشا بکات تا دەگاتە ئەستێرە بۆی دەردەکەوێ دروستکراوێکی مام نێوەندییە، نە زۆر بـ چووك و نە زۆر گەورەیە.

وە وەکو باسیشمان کرد گەورەیی و ڕێزو نرخی ئینسان لە ڕووحەکەی دایە وە بە هۆی ڕووکەشییەوە ئینسان ئینسانە، ئە گەرنا ئە گەر هەر جەستەکەی بوایە، هەر ئاژەڵێك دەبوو، یان ماددەیەك دەبوو وەك باقی ئەو دیاردەو ڕواڵەتە ماددییانەی دیکە کە دەبینرێن ! .

**خـاڵی دووەم :**

**((قورئان لە ڕێی هەر کام لە پێنج هەستەکان و عەقڵ و فیطرەتەوە، ئینسان بەرەو خوانا سیی دەجووڵێنێ، و ڕێی زانیاری تایبەتی خۆی دەربارەی خوا (عزّ و جل) )).**

پێشـتر باسمان کرد کە چۆن ئینسان لە ڕێی پێنج هە ستەکانەوە، وە لە ڕێی عەقڵ و بیـرو هۆشەوە، بە هاوکاری کەرەسەو زانیارییەك کە پێنج هەستەکان بۆ عەقڵی دابین دەکەن، وە بە هۆی ئەو یا سا بەڵ گە

نەویست و خوارِسكانەی كە لە عەقڵدا دانراون، وە لە رِێی فیـ طرِەت و دڵ و دەروونەوە، ئینسان چۆن خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاری دەناسێ.

ئەمجار دێینە سەر باسی ئەوە كە قورئان  تاكە وەحی و پەیامی لە هەڵەو دەستكاریی پارێزراوی خوا  چۆن رِێبازی خواناسییمان پێ شان دەدات؟!

واتە: دەرس و باسەكانی رِابردوو هەموویان باسی ئەوە بوون كە ئینسان بۆ خۆی بەو وزەو توانا تایبەتییانەی كە خوا پ ێی داون چۆن خوای خۆی (تبارك و تعالی) دەناسێ !

ئێستاش باسی ئەوە دەكەین كە خوای بێوێنەو هاوەڵ بۆ خۆی چۆن خۆی بە بەندەكانی دەناسێنێ؟!

جا سەرەتا بە كورتی دەڵێین: خوای كاربەجێ و زانا (عزّو جل) بە شێوەیەك خۆی بە بەندەكانی دەناسێنێ، كە هەم پ ێنج هە ستەكان دەجووڵێنێ و هەم عەقڵ هان دەدات و هەم فیطرەت و سرو شت ب ێدار دەكاتەوەو هەم زانیاری خۆیشی (واتە: زانیارییەك كە نە لە رِێی پ ێنج هەستەكانەوە دەزانرێ و نە لە رِێی عەقڵەوەو نە لە رِ ێی دڵ و دەروون و فیطرەتەوە، بەڵكو خوای بەخشەر بە هۆی (و حي) یەوە كە زان یاری تایبەتی خۆیەتی) دەخاتە بەردەستمان بۆ ئەوەی كە ئەو لایەنا نەی نەزانراو (مجهول)ن، دەربارەی ناسینی خواو سیفەت و ناوە هەرە چاك و هەرە بەرزەكانی، وە باقی بوارەكانی دیكەی ئیمان وعەقیدەی ئیسلامی، تیشكی (وحي)یان بخاتە سەر، تاكو مرۆڤ لە بواری خواناسییدا تەواو

بەرچاوی ڕۆشن بێتەوەو چەند ڕووناکیی (نور)ێکی بە دەستەوە بن، کە لە: عەقڵ و زانیاری وفیطرەت و(وحي)یەوە سەرچاوە دەگرن.

جا ئێستا چەند ئایەتێك لە قورئان بە نموونە دێنینەوە کە چۆن خوای زاناو توانا ئەو وزەو توانا ئاشکراو پەنهانانەی ئینسان دەخاتە گەڕو هەموویان دەجوولێنێ و هیچیان لێ‌نابوێرێ و فەرامۆش ناکات و ئەگەر وەك باسمان کرد لە ڕابردوودا هەستگەرایەکان (الحسیون) و ئەزموون گەرایەکان (التجربیون) تەنیا پشتیان بەو زانیاری یانە دەبەست کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە بە دەست دەهاتن و، عەقڵ گەراو فەیلەسووفەکان تەنیا پشتیان بە حوکمەکانی عەقلّی ڕووت دەبەست و، زۆرێك لە ئەهلی عیرفان و دڵ و دەروون بە زۆری پشتیان بە هەست و نەستی دەروونی و ئەو داخوازییە خوارِسك و سروشتییانەی کە لە دەروونی ئینساندا شێردراونەتەوە، دەبەست.

ئەوە (وحي) و پەیامی خوا ئەوانە هەرسێکیان (زانیاری و عەقڵ و فیطرەت) بە یەکەوەو لە سەرووی ئەوانیشەوە زانیاری یەکی تایبەت کە لە ڕێی (وحي)یەوە نەبێ دەستگیر نابێ، دەربارەی بوونی خوای بێ‌هاوەڵ ناوو سیفەتەکانی و چۆنیەتی پەیوەندی خوای تاك و پاك لە گەڵ دروستکراوەکانیدا دەخاتە ڕوو:

(١) بۆ وێنە خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ۞ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ

الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ فَلا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَاداً وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾[1]

ماناكەی بە كورتی ئاوایە: ئەی خەڵكینە ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن كە ئێوەی دروستكردووەو ئەوانی پێش ئێوە شی دروست كردوە، بۆ ئەوەی پارێزی لێبكەن، ئەو كە سەی كە زەوی بۆتان كردوە بە ڕایەخ و بۆی ڕاخستوون وە ئاسمانی بۆتان كردوە بە سەربان، وە لە سەرووی خۆتانەوە (لە هەوران) ئاوی ناردۆتە خوارێ، وە لە هەموو جۆرە میوەكانی بە هۆی ئەو (ئاو)ەوە لە زەوی دەرهێناوە بۆ ئەوەی بۆتان ببێتە بژیو، (مادام وایە) هاوتایان بۆ خوا دامەنێن، لە كاتێكدا ئێوە دەزانن (كە هیچ شتێك و هیچ كەسێك هاوتاو وێنەی خوای بێ هاوەڵ نیە). لەم دوو ئایەتەدا خوای بەدیهێنەر بانگی هەموو مرۆڤەكان دەكات كە بەندایەتی بۆ خوا یەك ب كەن كە دروستی كردوون، جا ئەم ئایەتە وەك چۆن قسە لە گەڵ عەقڵدا دەكات، قسە لەگەڵ ویژدان و فیطرەتی ئینسانیشدا دەكات، چونكە: دواندن (خطاب)ەكە وادە ست پێدەكات كە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوا (عزّو جل) بۆ ئێمەو ئەوانی پێش ئێمەش، شتێكی خوارسك و بەڵگەنەویستە، بۆیە خوای زاناو زاڵ لەسەر ئەوە بەڵگە ناهێنێتەوە، بەڵكو یەكسەر دەفەرموێ: ئەی خەڵكینە ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن كە دروستی كردوون، وە ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست كردوە، بۆچی بیپەرستن؟! تاكو لە ئەنجامی پەرستن و

---

(1) ( البقرة ٢١-٢٢ ).

بەندایەتی کردندا بۆ خوا بتوانن پارێز لە تۆڵەو هەڕەشەو سزای خوا بکەن لە دوارۆژدا، یاخود بۆ ئەوەی پارێزکاریی (تقوى) یان پەیدا بێ، واتە: بەهۆی بەندایەتییەوە خەسڵەتی پارێزکاریی پەیدا دەبێت وە ئینسان لە تووڕەیی و سزاو جەزرەبەی خوا پارێزراو دەبێ، ئینجا خوای بەرزو مەزن بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە بەدیهێنەرو پەروەردگارەو دەفەرموێ: ﴿ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشاً ﴾ بە لێی کە سەرنجی زەوی بدەین هەست دەکەین کە ڕاخراوە، وەك چۆن فەرشێك، ڕایەخێك ڕادەخرێ و ئینسان لەسەری دادەنیشێ، جا خوا دەفەرموێ: زەویتان بۆ ڕاخراوە، بەڵام بە تەنیاش هەر ڕاخستن نییە، بەڵکو پڕیش کراوە لە بژێو و پێداویستییەکانی ئینسان، وەك لە شوێنێکی دیدا دەفەرموێ: ﴿وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا﴾[1] واتە هەموو بژیوەکانی لە زەوی دا داناوەو ئەندازەگیریی کردوە، کەواتە: زەوی هەر فەرش و ڕاخراوێك نیە کە لەسەری دابنیشی و بەس!، بەڵکو و یڕای ئەوە دەشتژێنێ، وەك لە باسی زەویدا لە رابردوودا باسمان کرد، کە ئەو چینە گڵەی کە لەسەر توێخی سەرەوەی زەوییە، چینێکی زۆر تەنکە لە چاو ئەو چینە بەردو ئاسنەی کە زۆربەی زەوی پێك دێنێت و هەمووی بەردو کانزای کوڵیوو تواوەو قاڵبوەوەیە! بەڵێ تەنیا تەنکە گڵێك لە سەر زەوییە، وەك هەندێك لە زانایانی زەوی ناس دەڵێن: گڵ (تربة) لەچاو هەموو گۆی زەویدا، وەك توێکڵە تەنکەکەی هەرە

---

(1) ( فصلت -10 ) .

سەرێی پیواز وایە لەچاو هەموو پیوازەکە!، بەڵام لە گەڵ ئەوە شدا ئەو توێکڵە تەنکە هەرچی ئینسان پێویستی پێی هە یەو هەر چی گیاندارو زیندەوەران و ڕووەك پێویستیان پێی هەیە هەمووی تێدا دابین کراوە!! کە بێگومان ئەوە زۆر جێگەی سەرسوڕمان و سەرنج و لێوردبوونەوەیە. دوای ئەوە دەفەرموێ ﴿وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾ (البقرة -22) واتە: وە ئاسمانی بۆتان کردوە بە سەربان، بەڵام وەنەبێ هەر سەربان بێت و هیچی دی! بەڵکو ئەو سەربانەش دیسان سەر چاوەی بژیوو ڕزق و ڕۆزییە، هەورەکان لە ئاسماندا دێن و دەچن، باران دێتە خوارێ کە سەرچاوەی ئاوی شیرین و زوڵاڵ تەنیا بارانە، بەڵێ ئەو ئاسما نە ئاوی لێ دێتە خوارێ، هەروەها تیشك و گەرمی لێوە دێت، دیارە ئەمانەش سەرچاوەی هەمووی ڕزق و ڕۆزی و بژیوێکن، ئنجا (وحي) خوای بەخشندەو بەخشەریشی لێوە دێت، کە ئەویش ڕزق و بژێوی ڕووحەکانە، کەواتە: هەم ڕۆزی ماددی جەستەکان لە ئاسمانەوە دێت، وە هەم ڕۆزی مەعنەویی ڕووحەکانیش! کەواتە: ئاسمان سەربانە بەڵام سەربانێکی ئاسایی نییە، کە هیچی لێ هەڵنەوەرێت! ئنجا سەرباری هەمووی: ئاسمان پارێزراویشە کە هیچ شتێك کاری تێ ناکات ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفاً مَحْفُوظاً﴾[1] جا ئێمە لە باسەکانی ڕابردوودا ڕوونمان کردۆتەوە چۆن چۆنی و لە چی خوای بالادەست ئاسمانی پاراستوە بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوە. پاشان فەرموویەتی:

---

(1) (الانبياء 32).

﴿وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ فَلا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَاداً وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾(1) واتە: وە لەو سەربانە ئاو دێنێتە خوارێ و دەبارێت و لەو زەوییەدا کە وەك فەرش بۆتان ڕاخراوە هەموو دانەوێڵەو میوەو بەروبوومێك دەڕوێنێ و دەردەهێنێ‌و دەبێتە ڕۆزی و بژیوتان، کەوایە ﴿فَلا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَاداً وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾(2) هاوتا بۆ خوا دامەنێن کە دەزانن خوا هاوتای نیە، ئاخر کێی دی شتی ئاوای لە دەست دێت و لە توانای دایە؟!، کاتێك کە خوای کاربەجێ بارانی خۆی دەگرێتەوە تێکڕای خەڵك وە زاڵە دەکەوێت و دەستەوسان دەبن و جگە لە پاڕانەوە دەسەلاتێکی دیکەیان نامێنێ، ئەوەی خوا لە دەستی دێت کێ لە دەستی دێ؟! ئەوەی خوا بۆتانی کردوە، کێ توانیویەتی و دەتوانێ بۆتان بکات؟!

(2) نموونەیەکی دیکەی سەرنج ڕاکێش لە ئایەتەکانی قورئان لەو بارەوە ئەم چەند ئایەتەن کە لە بارەی ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام)و هەڵوێستی لە بواری خواناسیدا دەدوێن: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَاماً آلِهَةً إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلالٍ مُبِينٍ ۞ وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ ۞ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَباً قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لا أُحِبُّ الْآفِلِينَ ۞ فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغاً قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِنْ لَمْ

(1) (البقرة :22) .
(2) (البقرة :22).

يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ ۞ فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَذَا رَبِّي هَذَا أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ ۞ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفاً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾ (1).

واتە: وەكاتێك ئیبراهیم بە (ئازەر)ی بابی خۆی گوت: ئایا چەند بت (صنم)ێك دەكەی بە پەرستراو و دەیان پەرستی؟ بەراستی من خۆشت و گەلەكەشت لە گومراییەكی ئاشكراو و رون و بێ پێچ و پەنادا دەبینم، ئاوا بەم شێوە مولكی زۆرو زەوەندەی ئاسمانەكان و زەوی نیشانی ئیبراهیم دەدەین، بۆ ئەوەی كە لەو كەسانە بێت كە ئیمانێكی دامەزراوو نەجوولاّو (یقین)ی هەبێت، جا كاتێك شەوی بەسەرداهات، خڕۆكە (یان ئەستێرە)یەكی بینی، گوتی: ئەوە پەروەردگارمە، بەلاّم كاتێك ئاوا بوو و ون بوو، گووتی: من ئاوابووانم خۆش ناوێن! ئنجا كاتێك مانگی بینی كە تازە(2) سەری دەردەهێناو دەردەكەوت، گوتی: ئەوە پەروەردگارمە، كاتێك ئەویش ئاوا بوو، ئەمجارەیان گوتی: ئەگەر پەروەردگارم ڕێگام نیشان نەدات من لە كۆمەڵی ڕێ لێ ون بووان دەبم و وەكو ئەوانم لێ دێت، ئنجا كاتێك خۆر (ڕۆژ)ی بینی كە ئەویش تازە سەری لە كەل دەردەهێناو بە

(1) ( الأنعام : 74-79 ).

(2) چونكە ( بزوغ ) بە سەرەتای سەر دەرهێنان و دەركەوتنی مانگ و ڕۆژ و ...هتد دەگوترێ .

تیشکی خۆی دونیای ڕۆشن دەکردەوە، گوتی: ئەوە پەروەردگار مە ئەمە لە هەموویان گەورەترە، بەڵام کاتێك ئەویش ئاوا بوو، گوتی: ئەی گەلەکەم من بەریم و دوورم لەوەی ئێوە دەیکەن بە هاو بەش و هاوتا بۆ خوا، من ڕووی خۆم کردە ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناون، وە ڕووی خۆمی بۆ ڕا ست دە کەم و واز لە هەموو شتێکی تر دێنم، وە من لە هاوبەش پەیداکەران نیم.

ئێستا با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

توێژەرەوانی قورئان سەبارەت بەم ئایەتا نەو ئەم بە سەرهاتەی ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) دوو ڕایان هەن:

(الطبري) کە بە پێشەوای تو ێژەرەوانی قور ئان (ا مام المف سرین) دادەنرێت و خاوەنی یەکەمین تەفسیری قورئانە، دەڵێ: ئیبراهیم (عل یه السلام) لەم حاڵەتەدا لە حاڵەتی تێفکرین (نظر)دا بووەو ئەم وتوویژەی ئیبراهیم (علیه السلام) وتوو یژێکی خودیی ( حوار ذا تي) بووەو لەوکاتەدا لە سەرنجدان و هەوڵدان دابووە بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار بدۆزێتەوە! .

بەڵام (ابن کثیـــر) و ژمارەیەکی دیش لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لەم ئایەتانەو لەم بەسەرهاتەدا ئیبراهیم (علیه السلام) لە حا ڵەت و مەقامی موناقەشەو شەڕە قسە (م ناظرة)دا بووە، وا تە: وتوو یژو گفتوگۆ، لەگەڵ غەیردا نەك لە حاڵەت و مەقامی (تەما شاکردن و سەرنجدان)دا .

جا توێژەرەوانی قورئان هەرکام لەم دوو ڕاو بۆ چوونانەیان زۆر هەڵسەنگاندوەو قسەو باس و توێژینەوەی زۆریان لەسەر ئەنجام داون و ئایەتەکانیش هەردوو تەفسیرەکە هەڵدەگرن ومنیش وای بۆ دەچم کە ڕای دووەم[1] ڕاست تربێت، ئەوەی کە (ابن کثیر)و زۆرێکی تر لە توێژەرەوان پەسندیان کردوە، کە ئیبراهیم (علیه السلام) لێرەدا لە حاڵەتی وتووێژو مشتومڕ (مناظرة)دا بووە، لەگەڵ بت (صنم) پەرستان و ئە ستێرەو خرۆکە پەرستان و بە بەڵگەی ئەوە کە ئایەتی یەکەم دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَاماً آلِهَةً إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلالٍ مُبِينٍ﴾[2] واتە: کاتێك ئیبراهیم بە ئازەری بابی گوت: ئایا تۆ چەند بتێك دەکەی بە پەرستراو؟! بێگومان من خۆت و گەلەکەت لە گومڕایی یەکی ئاشکرادا دەبینم.

کەواتە: دیارە ئیبراهیم (علیه السلام) زانیویەتی کە پەرستنی غەیری خوا گومڕاییە.

پاشان خوا (عزّو جل) چۆنیەتی گەیشتنە یەقینی ئیبراهیم (علیه السلام) دەخاتە ڕوو ﴿وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ﴾ واتە: ئاوا بەجۆرە موڵکی بەرفراوانی ئاسمانەکان و زەوی پیشانی ئیبراهیم دەدەین ، بۆ ئەوەی کە لە ڕێی زانیاری و بەڵگەو

(1) لە کتێبی (الإسلام يتجلى في كتاب الله)دا کە لە زیندانی ئەمریکادا نووسیومە ڕای یەکەمم هەڵبژاردوەو پەسندم کردوەو دیارە هەردووکیشیان ڕێیان تێ دەچێ.

(2) ( الأنعام 74 ) .

لەگەڵ غەیری خوا پەرستاندا ڕوو بەڕوو بێتەوەو بە بەڵگە پێیان بسەلمێنێ کە ئەو شتانە بە کەڵکی پەرستن نایەن .

واتە: ئیبراهیم (علیه السلام) لە دڵ و دەروون و فیطرەتی دڵنیا بووەو زانیویەتی کە هەر یەك خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار هەیەو هەر دە بێ ئەویش بپەرستـرێ، بەڵام لە واقیع و بارودۆخ و دەوروبەرێکدا ژیاوە کە بت و ئەستێرەو مانگ و خۆری تێدا پەرستراون و چەندین شتی دی کەی تێدا پەرستراوە، جا ئیبراهیم (علیه السلام) بە بت شکێن ناسراوەو لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە غەیری خوایان پەرستوە، ڕووبەڕوو بۆتەوەو کەوتۆتە کێشەوە: لەگەڵ (نەمروود)دا کە داوای خوایەتی کردوەو لەگەڵ بت پەرستەکاندا کە ئیبراهیم (علیه السلام) لە دەرفەتێکدا هەموو بتەکانیان لـێ وردو خاش دەکات، وەك لە سوورەتی (الأنبیاء)دا خوای زاناو شارەزا باس دەکات[3]، وە لە گەڵ ئەستێرەپەرستان و مانگ و خۆرپەرستاندا، وە لەگەڵ پەرستاران (عبدة)ی هەموو ئەو شتانەدا کە لە سەردەمی خۆیدا جگە لە خوا پەرستراون، لەگەڵ هەموویاندا دەستەو یەخە بووەو ڕووبەڕوو بۆتەوەو پێیانی سەلماندوە کە تەنیا خوا شایستەی پەرستنە.

لێرەدا تەماشای دەکەین کاتێك کە شەوی لـێدادێت و خڕۆکە یان ئەستێرەیەك دەبینـێ، دەڵـێ: ئەوە پەروەردگارمە ( هذا ربي) دیارە مەبەستی ئەوە نەبووە کە ئەمە خواو پەروەردگاری منە! بەڵکو مانای

(3) بڕوانە: (الأنبیاء 51 تا 70) .

قسەکەی ئەوەیە کە: بە پێی بۆچوونی هەندێك لەو خەڵکە بێ دە بێ ئەمە پەروەردگارم بێ!! وەك ئەوەی کە تۆ وتوو یژ لە گەڵ کە سێکدا دەکەی، تۆش قسەی ئەو وەك خۆی دەگێڕیەوە، دیارە بەو مانایە نیە کە تۆ بە قسەکەی ئەو ڕازی، بەڵام بە ئەمانەتەوە ق سەکەی ئەو دێ خی، چونکە دەبێ تۆ قسەی پووچ و ناڕەوای بەرامبەرت وەك خۆی و بێ دەستکاری بێنی، ئەمجار هەڵی بوشێنیەوەو پووچی بکەیەوە، جا ل یرەدا ئیبراهیم (علیه السلام) لەبەرئەوەی کە لە مەقامی وتوو یژدا بووە، گوتوویەتی: سەرەتا با من تەماشا بکەم کە ئەو بیرو ڕایانەی ئ یوە کە ئەستێرەو مانگ و خۆر دەپەرستن با تەماشایان بکەم کە چین و چۆنن؟! جا کاتێك، خرۆکە یان ئەستێرەی لێ دەرکەوتوە، گوتوو یەتی: بە حیسابی ئێوە ب یت ئە مە پەروەردگار مە، دوا یی کە ئاوابووە، گوتوویەتی: ئەمە بە کەڵکی پەرستن نایەت چونکە خوای بەدیهێ نەر (عزّو جل) دەبێ ئاگای لە دروستکراوەکانی خۆی ب یت و پەروەردگار دەبێ سەرپەرشتی هەموو پەروەردەکراوەکانی خۆی بکات، بەڵام ئەمەیان دیارە ئاوا بوو و بزر بوو کەواتە پەروەردگار نیەو بە کەڵکی پەر ستن نایەت. دوایی لە بەرانبەر مانگ پەرستەکاندا ڕاوە ستاوە تا مانگ دەرکەوتوە، کە دەرکەوتوە دیسان گوتوویەتی: ئەگەر بە حی سابی ئ یوە بێت ئەمەیان پەروەردگارمە! بەڵام کە ئەویش ئاوا بووە، سەیر بکەن چی گوتوە: ﴿لَئِنْ لَمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ﴾[1] ئە گەر

---

(1) ( الأنعام :77 ).

پەروەردگارم هیدایەتم نەدات لە گومڕایان دەبم، کەواتە ئیبراهیم (علیه السلام) پەروەردگاری خۆی زۆر باش ناسیوە، وەنەبێ نەیناسیبێت.

ئنجا دوایی کە خۆریش دەبینێ و بەهۆی ئاوابوونییەوە بە خۆرپەرستەکانیش دەسەلمێنێ کە ئەویش ناگونجێ پەروەردگار بێ، هەرچەندە لەوانی دیکەش گەورەترە، پاش ئەوە کە بە هەموویان دەسەلمێنێ کە ئەو پەرستراوانە هیچیان پەروەردگار نین و شایستەی پەرستن نین، ئەوجار بەرائەتی خۆی لە هەموویان ڕادەگەیەنێ و دەڵێ: ﴿ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ﴾ (1) واتە: ئەی قەومەکەم من حاشا لەو شتانە دەکەم کە دەیانکەنە هاوبەشی خوا لە بەندایەتی و پەرستندا چونکە ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان بەدەستەوە نیە، بۆیە هەقی گلەیی شتان نیە کە لە عەقیدەو بیروباوەڕو لە ڕێچکەو بیردۆزەکانی ئێوە لام داوە !، بەڵێ بەڕێزان! دوای ئەوەی بە بەڵگە پێی سەلماندوون ئەوجار بەرائەتەکەی خۆی لێیان ئاشکرا کردوە، بۆ ئەوەی کە مەجالی گلەیی و لۆمەو سەرکۆنەیان نەبێت، پاشان گوتوویەتی: ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾(الأنعام- 79) من ڕووی خۆم کردە ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی پەیدا کردوون، چونکە هەر ئەو شایستەی ئەوەیە بپەرستێ و بەندایەتی بکرێ، وە هاوبەشی بۆ دانانرێ، بۆیە من لە خوا بەیەکگران (موحدّین)م نەك لە هاوبەش دانەران (مشركين). شایانی باسیشە کە دەگونجێ هەر سێك

(1) ( الأنعام :78 ).

قسەکەی ئیبراهیم (علیه السلام): (هذا ربي) بە شێوەیەکی پر سیاری نکووڵی لێکردن (الأستفهام الأنكاري) بخوێندرێتەوە: (هذا ربي؟!)، کە ئەوکاتە مانای ئەو قسەیەی ئیبراهیم کە سێ جار دووبارە بۆتەوە ئاوای لـێ دێ:

ئایا  ئەی خرۆکەو ئەستێرەو مانگ و خۆرپەر ستەکان:- ئە مە پەروەردگارمە بە خەیاڵی ئێوە ؟! ئاشکراشە کە صیغەی (الأ ستفهام الأنكاري) وەلامەکەی هەر لە نێو خۆی دایەو پێویستی بە گوتن نیە.

(3) ئنجا با سەرنجی نموونەیەکی دیکەی ئەو جۆرە ئایەتانە بدەین تاکو بزانین چۆن کتێبـی خوای کاربەجێ هەم پـ ێنج هە ستەکان و هەم عەقلێ و هەم فیطرەت و هەم ویژدانیش دەجووڵێنـێ بەرەو خواناسیی، وە زیادەی زانیاری (وحي)یش دەخاتە پاڵ ئەو زانیارییانە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْ عَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ۞ وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَاراً وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ۞ وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ [1] واتە: ئەو خوایەی کە ئاسمانی بە بێکۆڵەکان بەرزکردۆتەوە کە دەبـ ینین

(1) (الرعد :2-4).

(یاخود خوایەك كە ئاسمانی بە چەند كۆڵەكەیەك كە ئێوە نایانبینن بەرزكردۆتەوە) پاشان بەرزبۆتەوە بۆ سەر تەخت ( عرش) وە خۆرو مانگی ملكەچ كردوون، هەر كامێك یان بۆ شوێن و كاتێكی دیاریكراو لە جمۆجۆڵ و ڕۆیشتن دایە، سەرپەرشتی كاروبارەكان (ی بوون) دەكات ئایەتەكانی خۆی شی دەكاتەوە، بۆ ئەوەی بڕوای پتەوتان بە دیداری پەروەردگارتان هەبێ، وە ئەوە زاتێكە كە زەوی ڕاخستوە، وە چیا بەرز و چەسپاوەكانی تێدا داناون، وە رووبارەكانی تێدا جاری كردوە، وە لە هەموو میوەیەك جووتێكی تێدا دروستكردوە، شەوگار بە سەر ڕۆژگاردا دێنێت و دایدەپۆشێ، بێگومان لەوانەدا زۆر نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك كە بیربكەنەوە. وە لە زەویدا چەند پارچە زەویەكی لە تەنیشت یەكەوە هەن، وە چەند باخێك لە ترێ، وە كشتوكاڵ و دارخورما، كە هی وا هەیە كۆمەڵە درەختێك یەك بنكیان هەبێت، وە هەیە كە هەر درەختێك بنكێكی تایبەتی خۆی هەیە، هەمووی بە یەك ئاو ئاو دەدرێت، بەڵام هەندێكی بەسەر هەندێكیدا هەڵدەبژێرین لە (تام و بۆن و ڕەنگی) میوەكەیدا. بێگومان لەوانەدا زۆر نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك كە عەقڵیان هەبێت و تێبگەن .

جا ئێستا با سەرنج بدەین! خوای بێوێنەو هاوتا بە جۆرێك خۆی بە ئێمە دەناسێنێ، كە هەم بەشی پێنج هەستەكانی تێدایەو هەم بە شی عەقڵی تێدایەو هەم بەشی دڵ ودەروون و فیطرەتی تێدایە، وە هەم جۆرە

زانیارییەکی تێدایەکە لەو سێ ڕێیانەوە ئێمە دەستمان ناکەوێ وەك ئەوە کە خوا چۆتە سەر (عرش)، وە کە کاتێك دێت ئێمە بە دیداری خوا شاد دەبین و بە خزمەتی دەگەین، ئەم شتانەو هاووێنەکانیان لە ڕێی (وحي)یەوە نەبێ نازانرێن. شایانی باسیشە ڕستەی: ﴿رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾[1] دەگونجێ بە دوو جۆر مانا بکرێت:

یەکەم: ئەگەر وشەی (ترونها) پەیوەندی بە (السموات)ەوە هەبێ، واتە: خوا ئاسمانەکانی بە بێ کۆڵەگەو پایە بەرزکردۆتەوەو ئێوە ئاسمانەکان دەبینن کە پایەو کۆڵەگەیان نیە. دووەم: بەڵام ئەگەر وشەی (ترونها) پەیوەندی بە (عمد)ەوە هەبێ، واتە: خوا ئاسمانەکانی بە چەند پایەو کۆڵەگەیەك بەرزکردۆتەوە کە ئێوە نایانبینن، واتە: بە کۆڵەگانێکی نەبینراو (عمد غير مرئية).

دیارە مانای دووەمیان تەفسیرێکی زۆر وردەو جێی سەرنجەو ئاماژەیە بۆ هێزی کێشندە (القوة الجاذبية) کە بە کردوە ئاسمانەکان و بەڵکو ئەو بوونەوەرە ماددییەی کە ئێمە دەیبینین بە پێی ئەوە کە زانایان پەییان پێ بردوە، هەمووی بە هۆی ئەو هێزەوە ڕاوەستاوە کە بۆ یەکەمین جار (إسحاق نیوتن) پەی پێ برد، کە پێی دەگوترێ هێزی کێشندە (قوة الجاذبية) کە لە ڕاستیدا بۆ ڕاوەستانی ئاسمانەکان وەك پایەو کۆڵەگەی نەبینراو وایە.

---

(1) (الرعد : 2).

ئەنجار دەفەرموێ : (ثم استوی علی العرش) دواییی خوای بێوێنە بەرزبۆتەوە بۆ سەر(عرش)، (عرش)یش لە زمانی عەرەبیدا یانی (سرير الحكم) تەخت و بارەگاو شوێنی حوکمڕانی، (عرش)ی خوای بە دیهێنەریش بێگومان دروستکراو (مخلوق)ێکی خوایەو ئێستاش هەندێك لە فریشتەکان هەڵیان گرتوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ ...﴾[1] وە لە دوارۆژیش فریشتەکان هەڵی دە گرن: ﴿وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ ﴾[2] واتە: وە لە ڕۆژی دواییدا عەرشی پەروەردگاری تۆ هەشت هەڵی دەگرن.

شایانی باسیشە هەندێك لە زانایان ڕستەی (ثم استوی علی العرش)یان تەئویل کردووەو گوتوویانە: مەبەست لە چوونە سەر (عرش) ئەوەیە کە خوا بوون (وجود)ی خستۆتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوەو وشەی (إستوی) یان بە (إستولـی) تەفسیر کردوە! بەڵام بێگومان ئەو جۆرە مانا لێدانەوەیە ڕاست نیە. چونکە (استوی) ئەگەر بە (علی)(تعدي) بکات دوو مانای هەن: بەرزبۆوە (إرتفع) وە سەقامگیر بوو (إستقر)، بەڵام (إستولی) مانای (إستوی) نیە ، دیارە خوای باڵادەستیش پێش (عرش) دروستکردن و چوونە سەر (عرش)یش هەر باڵادەست (مستولی) بووەو، سەربارەش بە ڕوونی لە ئایەتەکان وەردەگیرێ کە (عرش)ی خوا، جیسمێکەو لە ڕۆژی دواییدا هەشت فریشتە، یان

---

(1) ( غـافـر : 7 ).

(2) ( الحاقة : 17) .

هەشت دروستکراوی دیکەی خوا هەڵی دەگرن! بەڵام لە پێرەدا نابێ بە هەڵەدا بچین و پێمان وابێ کە چوونە سەر عەرش بۆ خوای پەروەرگار (عزّو جل) وەك لەسەر تەخت وکورسی دانیشتنی پاشاو حوکمڕانەکانە، چونکە خوا: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ﴾[1]، واتە هیچ شتێك وەك وی نییەو خوا وەك هیچ شتێك نیە، نە زاتی خوا وەك زاتی شتەکانە نە سیفەتی خوا وەك سیفەتی شتەکانە، نە ناوی خوا وەك ناوی شتەکانە، هیچ شتێکی خوا وەك هیچ شتێکی دروستکراوەکانی نیە، بە هەمان شێوە (عرش)ی خواش وەك (عرش)و بارەگاو تەخت و کورسی دەسەڵاتداران نیە، وە چوونە سەر (عرش)ی خواش وەك چوونە سەر (عرش)ی دروستکراوەکان نیە، چوونی خوا پێویستی بە هیچ شتێك نیە کە هەڵی بگرێ، بەڵکو(عرش)یش بەهێزو توانای خوا ڕاوەستاوە، بەڵام ئینسانێك کە لەسەر کورسی و تەختێك دادەنیشێ دیارە پێویستی بەو کورسی و تەختە هەیەو ئەگەر کورسی و تەختەکەی لەژێر لابەری دەکەوێتە خوارێ! بەڵام (عرش)و هەموو ئاسمانەکان و زەوی و تێکڕای دروستکراوەکان خوا خۆی ڕایگرتوون، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولا وَلَئِنْ زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾[2] واتە: بێگومان خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگرتوون کە لانەچن و تێك نەچن، وە ئەگەر لابچن و برووخێن بێجگە لەوی هیچ

---

(1) (الشورى: 11).

(2) ( فاطـر : 41 ).

کەس ناتوانێ بیانگرێ و ڕایان بگرێ، جا لەبەر ئەوەی ئێمە خوا یار بێ لە بەرگی سێیەم دا ((کە بۆ توێژینەوەی ناوو سیفەتەکانی خوا تەرخان کراوە)) بە درێژی باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین، بۆیە لێرە بەم پرسیارو وەڵامە ناودارەی (ئیمام مالك) کۆتایی پێ دێنین:

پرسیار لە (ئیمام مالك) کراوە لە بارەی (ثم استوى على العرش)ەوە ئەویش وەڵامێکی زۆر جوانی داوەتەوە گوتوویەتی: (الأ ستواء مع لموم، والکیفیة مجهولة، والإیمان به واجب، والسؤال عنه بدعة) واتە: (استواء) ماناکەی دیارە کە (إرتفاع و إستقرار) (بەرزبوو نەوەو سەقامگرتن)ە، بەڵام چۆنیەتییەکەی نەزانراو(مجهول)ە بۆ ئێمە، وە ئیمانیش بەو چوونە سەر (عرش)ە فەرزەو، پرسیار لێکردنیشی بیدعەتە (وا تە: زانا یانی پێشین لە شتی وایان نەپرسیوەو نەکۆڵیوەتەوە، چونکە زانیویا نە کە سیفەتی خوا وەك خوا وایەو لە عەقڵی ئینساندا جێی نابێ تەوە، بۆ یە نەیان پرسیوە).

دوای ئەوە خوای زانا دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ واتە: وە خۆرو مانگی دەستەمۆو ڕام کردوون و لە سیستەم لانادەن، ڕۆژێك ن یە خۆر چرکەیەك پێش بکەوێ یان دوا بکەوێ، هەرگیز نەبووە کە شەوێك مانگ لە یەك شەوەوە یەکسەر بچێتە سێ‌شەوە دوا یی لە سێ شەوە یەکسەر باز بدات بۆ پازدەشەوە!! ﴿كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُسَمًّى﴾ (الر عد-[illegible]) واتە: مانگ و خۆرو سەرجەم ئە ستێرەو خرۆ کەکان لە جوو ڵەو

هاتوچۆدان بۆ کات و شوێنێکی دیاریکراو (یدبر الأمر) واتە: ( خوا ) سەرپەرشتی کاروبارەکانی بوونەوەر دەکات.

ئینسان کاتێك چۆنیەتی بەڕێوەبردن و سەرپەر شتیکردنی ماڵ ێك دەبینێ کە سەرۆکی خێزانە کە هە یەو ئەو ما ڵە سەرەو بەرەو مەرکەزیەتی تێدایەو داهات و سەرفیاتیان هەیەو کاروبارە کان لەنێو ئەندامانی خێزاندا دابەش کراون و هەریەکەیان ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ، یەکسەر دڵنیا دەبێ کە ئەو ماڵ و خێزانە بەڕێوەبەرێکی هەیەو لەلایەن سەرپەرشتیارێکەوە هەڵدەسووڕێنرێ، یان شارێك کە بە ڕێ کی بەڕێوە دەچێ ئینسان دەزانێ کە ئەو شارە گەورەیەك و دە ستەڵاتدارێکی هەیەو کاروبارەکانی دابەش کردوون و سەرپەرشتی شارەکە دە کات و هەڵی دەسووڕێنی، هەروەها وڵات و مەملەکەتێك بە هەمان شێوە.

بە ڕاستی ئەهلی کوفر، بێبڕوا یان یەکجار کەودەن و نەزان و نەفامن، کە ب ڵێن: ماڵ ێك و شارێك و وڵات ێك پێوی ستی بە سەرپەرشتیکەرێك هەیە، ئەگەرنا بەڕێوە ناچێ، بەڵام ئەم بوو نەوەرە فراوان و پڕ لە ڕێکی و پێکی یە، پێویستی بە کەس ن یە بەڕێوەی بەرێ!! لە حاڵێکدا لە بەڕێوەبردنی ماڵێك و شارێکدا، کە بە عەقڵیش بەڕێوە دەچێت دەیان و سەدان خەلەل و نارێکی هە یەو کەموکووڕی و گرفت هەیە، بەڵام لە بەڕێوەبردنی ئەم بوونەوەرەدا بە ئەندازەی نووکی دەرزی نارێکی نیەو بێ سەرو بەرەییەك نابینرێ، وەك خوا دە فەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ

﴿فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ﴾(1) واتە: لە دروستکراوی خوای خاوەن بەزەییدا نارێکی نابینی، جار لەدوای جار چاو بگێرە بزانە کەموکووری و نارێکـــی دەبینی؟!

خوای پەروەردگار ئینسانەکان بێمنەت دەکات کە سەرنج بدەن و چاو بگێڕن بە دروستکراوەکانی خوادا، کە ئایا ناتەواوی دەبینن؟!

پاشان دەفەرموێ: ﴿ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴾(2)واتە (خوا) ئایەتەکان (ی خۆی) ڕوون دەکاتەوە تاکو دڵنیا بن کە بە دیداری پەروەردگارتان دەگەن. لێرەدا باسکردنی خوای زاناو شارەزا بۆ خۆی، باسکردنی (وحي) بۆ خوا (تبارك و تعالى) لە گەڵ باسکردنی فەیلەسووفان و خەڵکی دیکەدا لە یەك جیادەبنەوە خوا باسی خۆی دەکات بۆ ئەوەی خەڵك بیناسن و ئیمانی پێ بێنن، وە ئیمان بە دیداری خۆی و ڕۆژی دوایی بێنن، واتە باسی خۆی دەکات تاکو ئینسانەکانی پێ پەروەردە بکات و بێنە سەر ڕێگایەکی ڕاست، بەڵام باسی خوا کردنی فەلسەفە باسێکی وشك و برینگ و ڕووتە، سەرەرای هەڵەو پەڵەو نەزانینی زۆر .

ئەمجار باسی زەوی دەکات: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا﴾(3)واتە: وە ئەو (خوایە) ئەو کەسەیە کە: زەوی ڕخستوە، وە چیا داکوتکراوەکان و

(1) ( الملك : 3 ) .
(2) ( الرعد : 2 ).
(3) ( الرعد 3 ) .

ڕووبارەكانی تێدا داناون. پێویستە بزانرێ كە شاخە بەرزو سەركەشەكان وەك زرێ و قەڵغانێكی مەحكەم وان بۆ زەوی. چونكە زەوی نا سەكان دەڵێن: هەر چیایەك چەندەی بەدەرەوەیە چەند ئەوەندەی بە ناخی زەو یدا ڕۆیشتۆتە خوارێ و لە ژێرەوەو قوڵایی زەویدا بنكی چیاكان هەموویان یەكدیان بەستۆتەوەو پێكەوە یەك قەڵغان و زرێ یان بە دەوری زەویدا دروست كردوە، بۆ ئەوەی بور كان و بومە لەرزەكان لەبەر یەكی هەڵ نەتەكێنن و هێزی كێشندەی مانگ كە هەڵك شان و داك شان لە دەریاكاندا درو ست دە كات، لە بەر یەكی هەڵنە تەكێنێ بپا شان فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾[1] واتە: لە هەر میوەیەكدا دووجوتی داناون: بۆ ئاگاداریتان لە سەدەی هەژدەیەمدا زانایەكی ئەورووپایی ئەوەی دۆزیەوە، كە هیچ میوەو ڕووەكێك نیە كە نێرو مێی نەبێت، دیارە پێشتـر ئەوە دەزانرا كە خورما هە یەتی بەڵام دوایی ڕوون بۆوە كە ئەوانەی نێرو مێیەكەشیان لەیەك جیانیە وەك دار خورما لەنێو خۆیاندا نێرو مێیان هەیە، بەڵكو لەوە ز یاتریش خوای پەروەردگـــار دەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[2] واتە: وە لە هەموو شتێكدا جووت (نێرو مێ)مان داناوە تاكو پەند وەربگرن و تێبگەن!، ئێستا زانا یان دە ڵێن: ماددەی بێگیانیش جووتێتی (زوجية)ی تێدایە ئەلیكتـرۆن و پرۆتۆن، ئەوانیش ساردو گەرمن، واتە: دوو شتی پێكەوە جیاو پێچەوانەی یە كدی لە

---

(1) ( الـرعـد – 3 ) .
(2) ( الذاريـات : 49 ) .

هەندێك ڕووەوە، وەك لە شوێنی خۆیدا بە درێژی باسمان کردوە. دوا یی فەرموویەتی: ﴿یغشي اللیل النهار﴾ واتە: شەوگار بە سەر ڕۆژ گاردا دێنێت و دای دەپۆشێت، کە ئەمە هەر بە ئاشکرا خڕێ تی (کرو یة)ی زەوی تێدا دەردەکەوێت: چونکە دەبێ زەوی خڕ ب ێت ئەوجار دەگو نجێ شەوگار بەسەر (شوێنی) ڕۆژگاردا بهێنرێ و تێیەوە بپێ چرێ هەروەها ڕۆژگاریش بپێچرێتە شەوگارەوە، وەك خوای زاناو شارەزا لە شوێنێکی دیکە فەرموویەتی: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾[1] واتە: شەوگار لە ڕۆژگارەوە دەپێچێ، وە ڕۆژگار لە شەوگارەوە دەپێچێ، وە کاتێك دەگونجێ شەو و ڕۆژ بە دەوری یەکتــرو بە شوێنی یەکتــردا بێن کە زەوی خڕ بێ، ئەگەرنا ئەو (تعبیر)ە ڕاست دەرناچێ!

ئەمجار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە: لەوانە نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە، سەرەتا خوای زانا باسی (بوون)ی کرد بە گشتی، دوایی هاتە سەر باسی زەوی، ئەمجار دێتە سەر باسی شتی بچووکتر، ئەوەی ئینـ سان ڕۆژا نە هەڵ سوکەوتی لەگە ڵدا دەکات، ئەو زەوی و زارەی کە دەیکاتە کشتوکاڵ و باخ و بێستان و... هتد، دەفەرموێ: ﴿وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾[2] واتە: وە لە زەویدا چەند پارچەیەکی بچووك بە تەنیشت یەکەوە هەن، وە چەند باخێك لە ترێ، وە کشتوکاڵ،

---

(1) ( الزمر : 5 ) .

(2) (الرعد : 4 ).

وە باخی خورمای یەك بنكی قەد جیاجیا و یەك بنكی یەك قەد كە هەموویان بە یەك ئاو ئاودەدرێن، بەڵام هەندێكی بە سەر هەندێكی دیكەدا پەسەند دەدەین (واتە: تام و بۆن و ڕەنگی جۆراو جۆریان هەیە).

جا بەڕاستی بەڕێزان مەسەلەی جۆراوجۆری و جیاجیایی میوەجات شتێكی جێی سەرنجە!

ئینسان گوڵێكی نایلۆن، یان هێشوە ترێیەكی نایلۆن و دەستكردی ئینسان دەبینێ پێی سەرسام دەبێ كە نە تام و بۆنی هەیەو نە دەخورێو ... هتد، ئەدی بۆچی گوڵی ڕاستەقینەو هێشوە ترێی ڕاستی و دەستكردی خوای بەخشەر، جێگەی سەرنج و سەرسامی نەبێت؟! ئنجا ئەم هەموو درەخت و ڕووەك و میوەجاتە جۆراوجۆرە و لە هەر جۆرە شی چەندان جۆری لە یەك جیاواز!

جا بەڕێزان! ئاوا قورئان سەرنجی ئینسان ڕادەكێشێ و فیطرەت و دەروونی ئینسان بێدار دەكاتەوە، بۆ ئەوەی شتە ئاساییەكانی  بەهۆی عادەتەوە  لە لا ببنەوە نائاسایی بە هۆی تێفكرینەوەو هەروا بە سادەو ئاسایی نەڕوانێتە دروستكراوەكانی خوا، بەڵكو جێگەی لێوردبوونەوەو سەرنج و سەرسوڕمان بن! ئایا كێ ئەو هەموو كارخانەو ئامێرانەی لەنێو درەختی میوە داری: ترێ و خورماو سێو و مۆزو خۆخ و هەڵووژەو قەیسی و هەنجیرو هەنارو .... هتد، داناوە كە ئەو هەموو جۆرە ڕەنگ و تام و چێژو بۆنە جۆراوجۆرانە بەرهەم بێنێ؟! كە ئەگەر بێتو سەرجەم تواناكان و هەموو عەقڵی ئینسانەكان كۆبێتەوە ناتوانن بنكە سێوێك

دروست بکەن، نەك هەر ئەوە بەڵکو خودی سێوەکەش، بۆیە خوای زانا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: بێگومان لەو شتانەدا نیشانەی زۆر هەن بۆ کۆمەڵێك کە عەقڵی خۆیان بخەنە کار، هەر تۆزێك عەقڵی خۆیان بخەنە گەڕ نیشانەکانی بوونی خواو پەروەردگاریێتی خوا لە سەرجەم دروستکراوەکانیدا دەبینن.

## حاڵی سێیەم:

## هەمیشە قورئان پەروەردگاریێتی خوا دەکاتە بەڵگەی تەنیا پەرستراویێتی خوا (عزّوجلّ)

بەڕێزان !

پەروەردگاریێتی و بەدیهێنەرایەتی خوا لە قورئاندا کە باس دەکرێ بە پلەی یەکەم بۆ ئەوەیە کە خەڵك بگاتە ئەو ئەنجامە کە هەر خوا بپەرستێت، بەڵێ تیشك دەخستنە سەر پەروەردگاریێتی و ناوو سیفەتەکانی خواو بەدیهێنەرایەتی و خاوەنایەتی خوا، بۆ ئەوەیە کە عەقڵ و فیطرەتی ئینسان بێدار بێتەوە کە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، چونکە بەس ئەو شایستەی پەرستن و بەندایەتی و ملکەچ کردنە.

(1) خوای پەروەردگار لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا

تَتَّقُونَ ، فَذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلالُ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ﴾[1] ، واتە: لێیان بپرسە کێ لە ئاسمان و زەوییەوە ڕزق و بژیوی ئێوە دەدات؟! (ئەو بژیوەی لە ئاسمان دێتە خوارێ وەك تیشکی خۆر، باران، هەوا، وە ئەوەی لە زەوی دێتە دەرێ، کێ بۆتان دەڕەخسێنێ؟!) یاخود کێ خاوەنی بیستنەکان و دیتنەکانە؟! (کێ خاوەن و دروستکەری کۆئەندامی ئاڵۆزی گوێ و کۆئەندامی پڕ لە وردەکاریی چاوە؟!) وە کێ زیندوو لە مردوو پەیدا دەکات و مردوو لە زیندوو پەیدا دەکات؟! (خواردنێکی مردوو دەخورێت دەبێتە خانەیەکی زیندوو هەروەها شتی زیندوو دەخۆی و دوایی دەبێتەوە مردوو، یان خانە زیندووەکانی جەستەی ئینسان دوایی دەمرن، لە خولەکێکدا ملیۆنەها خانەی زیندوو لە جەستەی ئینساندا دەمرن، وە ماددەی مردوو لە جەستەی ئینساندا دەبێتە خانەی زیندوو).

ئەمجار دەفەرموێ: لێیان بپرسە کە کێ سەرپەرشتی کاروباری بوونەوەر دەکات؟! (فسیقولون الله) دەڵێن خوا (الله)، (ئەم وەڵامە یان لەسەر زمانی زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی سەر زەوی یە، کە دەزانن خوایەك سەرپەرشتی بوونەوەر دەکات، یاخود لە سەر زمان و لە جیاتی فیطرەت و عەقڵی ئینسان، خوای بەرزو مەزن وەڵام دەداتەوە، چونکە لە فیطرەت و دەروونی هەموو ئینسانێکدا ئەم وەڵامە هەیە)

---

(1) ( یونس : 31-32 ).

(**فقل أفلا تتقون!**) پێیان بڵێ: ئەدی بۆچی لە یێی ناتر سن و پارێزی لــێناکەن و (هاوبەشی بۆ دادەنێن ؟!)، (**فذلكم الله ربكم الحق**) ئا ئەو خوایەتان پەروەردگاری حەق و ڕاستەو هەر ئەویش پەرستراوی ڕاستەقینەیە (**فماذا بعد الحق الا الضلال**) جا ئایا لە دوای حەق (کە خوایە) جگە لە گومڕایی چی دی هەیە؟! واتە: خوای حەق هەر ئەو شایستەی پەرستنەو جگە لە پەرستنی وی هەمووی گومڕاییە (**فأنى تصرفون؟!**) بۆ کوێ لادەدرێن؟! وەك بڵێی ئیختیار تان بە دە ست خۆتان نەماوەو ڕووتان پێ وەردە چەرخێنن. جا بە ڕا ستی ئەوە تەعبیرێکی زۆر وردەو جێگەی سەرنجە!

وە لە شوێنی دیکەدا گوتراوە: ﴿**فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ!**﴾[1] بۆ کوێ لادەدرێن، وەك ئەوەی کە ئیرادەو عەقڵتان نەمابێ و ڕێشمەی کار تان بە دە ست خۆتان نەمابێ! واتە: ئەی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەران! ئێوە بۆچی و چۆن ڕیشی خۆتان و عەقڵی خۆتان لە مە ست هەواو ئارەزووە کانی بابایەکی نەفام و نەزان ناوە، کە خۆی بە ڕێگا نازانێ، ؟! بۆچی قە بووڵ دەکەن کە بەم لاولادا لاتان بدەن، خۆ ئێوە ئینسانن بۆچی بە عەقڵی خۆتان بە ڕێگادا ناڕۆن و پەروەردگارو بەدیهێنەری خۆتانناپەرستن؟!.

(2) ئەمجار با سەرنجی ئەم چەند ئایە تەش بدەین، کە دی سان بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خوا دەکە نە بەڵ گەو بنا غەو

(1) (الفاطر: 3).

پاساوی پەرستراویێتی (ألوهیة)ی خوا: ﴿قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلامٌ عَلَى عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَى آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ۞ أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنْبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُنْبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ۞ أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَاراً وَجَعَلَ خِلالَهَا أَنْهَاراً وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ ۞ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ ۞ أَمَّنْ يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَنْ يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۞ أَمَّنْ يَبْدأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾[1] لە ئایەتی یەکەمدا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: تۆ بڵێ: ستایش بۆ خواو سەلام لەسەر ئەو بەندانەی کە هەڵی بژاردوون (( کە مەبەست لە پێغەمبەرانە (علیهم السلام) لە پێش هەموو کەسدا)) ئایا خوا باشترە یان ئەوانەی کە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا؟! . جا دوای ئەوە خوای بێخەوش و پاك هەندێك لە ناوونیشان و شوێنەوارەکانی خۆی دەخاتە پێش چاو، کە بێگومان ئەو شوێنەوارە خێرو چاکەو نیعمەتانە بێجگە لە خوا سەرچاوەیەکی دیکەیان نیە، دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ واتە: ئایا

(1) ( النمل 59-64 ).

پەرستراوەکانی ئێوە باشترن، یان ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی لە نەبوونەوە هێناونە بوون؟! (بەڵێ ئەم بوونەوەرە کاتێك بووە کە نەبووە، وەك هەر کام لە ئینسانەکان دڵنیان لەوەی کە کاتێك بووە نەبووە، بە هەمان شێوەش زنجیرەی دروستکراو (مخلوق)ەکان کاتێك کە بەرەو قوڵایی ڕابردوو دەچیەوە دەبینی کە سەری بە بنبەست دەگات و ئەو زنجیـرەیە کۆتایی پێدێت و پەکی دەکەوێ، کەواتە: ئەم بوونەوەرە پەیداکراوەو بەدیهاتوە، لە لایەن پەیدا کەرو بەدیهێنەرو پەروەردگارێکەوە).

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنْبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُنْبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾[1] واتە: وە لە سەرووتانەوە (لە هەورەکان) ئاوی بۆتان ناردۆتە خوارێ و بەو ئاوە ڕواندومانە چەندان باخ و بێستانی ڕەونەق دارو سەرنج ڕاکێش و شادمان کەر. ﴿مَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُنْبِتُوا شَجَرَهَا﴾[2] کە لە تواناتاندا نیەو بۆتان ناکرێ کە درەختەکانی بڕوێنن، (ئەو نەمامە کە دەنێژرێ دەبێتە دوو بەش، بەشێکی بە ناخی زەویدا دەچێتە خوارێ و بەشەکەی دیکەشی لە زەوی دێتە دەرو بەرز دەبێتەوە، دیارە هەر دەنکە تۆوی دانەوێڵەیەکیش هەر وایە، جا ئەو بەشەی نێو زەوی بۆ ئەوەی خۆراك لە زەوی وەربگرێ بە شێوەی ڕەگ و ڕیشە بڵاودەبێتەوە بە ناخی زەویدا وە

(1) (النمـل 60).
(2) (النمـل 60).

بەشەکەی دیکەشی بەرز دەبێتەوە، بۆ ئەوەی ئەویش دیسان خۆراکی ئاسمان وەربگرێت، تیشکی خۆر وەربگرێت بە هۆی تیشکە پێکهاتن (التمثیل الضوئي)ەوە ئیدی هەردووك بەشەکە خۆراك کۆ دەکەنەوە تاکو شتێك بۆ ئێمە بەرهەم بهێنن، جا میوە بێت، یان دانەوێڵە، واتا: ڕووەك بە فەرمانی خوای بەخشەر خۆراکی ئاسمان و زەوی وەردەگرێ تا میوەی لێ دروست بکات و دانەوێڵەی لێ دروست بکات و سەرەنجام مەداری ئێمەی مرۆڤ ساز بکات! بۆیە خوا دەفەرموێ: ئێوە ناتوانن بیڕوێنن، کێ تواناو دەسەڵاتی هەیە دەنکە تۆوێك بڕوێنێ؟!) ئنجا دە فەرموێ: ﴿أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ﴾ ئایا لەگەڵ خوا (الله)دا پەرستراوی دی هەیە ؟! یاخود ئایا لەگەڵ خوادا بەدیهێنەرو پەروەردگاری دی هەیە، چونکە (إله) بە مانای بەدیهێنەرو پەروەردگار دێت و بە مانای پەرستراویش دێت، بەڵام زیاتر بە مانای پەرستراو دێت وەك چۆن (رب) زیاتر مانای پەروەردگارو بەدیهێنەر دەگەیەنێ، بەڵام مانای پەرستراویش دەگەیەنێ.

ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دی هەیە؟! ئنجا لە وەڵامدا دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە کۆمەڵێکن لا دەدەن (لە حەق و عەقڵ و فیطرەت) وشەی (يَعْدِلُونَ) یان لە ( عدول)ەوە هاتوە، واتە: لادان، یاخود لە (عدل)ەوە هاتوە، واتە (مثل) وێنە، واتە: ئەوانە وێنە بۆ خوا دادەنێن، یەکێك لە دروستکراوەکانی خوا دەکەنە وێنەو هاوتا بۆی، ئەوەندە نەفامن .

ئنجا خوای (عزّو جل) دیمەنێکی دی نیـ شان دەدات و دە فـەرموێ: ﴿أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَاراً وَجَعَلَ خِلالَهَا أَنْهَاراً وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾(1) واتە: یان ئایا ئەو پەرستراوانەتان کە لە جیاتی خوا دەیان پەرستن باشترن، یان ئەو خوا (زاناو کاربەجێ)یەی کە زەوی بۆتان سەقامگیرو ئارام کردوە، (وە کردوویەتی یە مایەی ئارام لەسەر گرتن و لەسەر نیشتەجێبوون)؟! جا ئینسان کاتێك بیردەکاتەوە لە سووڕانەوەکانی زەوی بە دەوری خۆی و بە دەوری خۆرداو لەگەڵ ئەوەشدا دەبینێ سەقامگیرو دامەزراوە! دەزانێ کە ئا ئەوە بێجگە لە خوای بالأدەست بە هیچ کە سێکی تر ناکرێت، پاشان دەفەرموێ: وە لە میانەی زەویدا چەندان ڕووباری داناون کە دێن و دەڕۆن، وە لە نێوان دوو دەریاکاندا پەردەو نێوان و سنووری داناوە، ( کە مەبەست پێی ئاوی سوێرو ئاوی شیرینە، ئاوی سوێر بریتیە لە ئاوی هەموو ئۆقیانووس و دەریا گەورەکان و ئاوی شیرینیش ئەو ئاوەیە کە لە ئەنجامی باران بارین و تەرزەو بەفرەوە لە ژێر زەویدا کۆدەبێتەوە، پاشان لە شێوەی کانی و سەرچاوەو بیرو جۆگەو جۆبارو ڕووباردا پەیدا دەبێت، جا خوای کارساز وای کردوە ئەو دوو ئاوە تێکەڵ نەبن و لەو شوێنانەش کە رووبارە گەورەکان تێکەڵ بە ئۆقیانووسەکان دەبن لەوێش زانایان دەڵێن: لەبەرئەوەی ئەصلی پێکهاتەی ئاوی شیرین و ئاوی سوێر

(1) ( النمـل : 61 ) .

لە رووی کیمیاییەوە جیایە، لەویش تێکەڵ بەیەك نابن، تا ماوەیەکی زۆر ئاوی ئەو رووبارە گەورانە لە کەناری ئۆقیانووسەکان دەمێننێتەوە تاکو خەڵك کەڵکیان لــێ وەربگرێت.

هەندێکیش لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: هەمیشە ئاستی ئاوی شیرین بەرزترە لە ئاستی ئاوی سوێر، پەردە (حاجز) مەبەست ئەوەیە کە ئاوە سوێرەکان ئاستەکەیان نزمەو ئاوی شیرین لەسەر ترەوە دێت، بۆیە ئاوە سوێرەکان مەجالیان نیە کە لەگەڵ ئاوە شیرینەکان تێکەڵ ببن، بۆ ئەوەی خەڵك پێداویستییەکانی خۆیان بە تەواوی بە ئاوی شیرین جێبەجێ بکەن، ئەمجار دوایی ئەوەی کە لــێی دەمێنێتەوە دێتەوە نێو ئاوە سوێرەکەو تێکەڵ دەبێتەوە، بەڵام ئاوی سوێر مەجالی نیە بە حوکمی هەڵکەوتی جوگرافی ئەگەرنا ئاوی سوێر ئەگەر دەرفەتی بووایەو گەیشتبایە ئاوە شیرینەکە هەمووی تێك دەداو ئینسان ژیان و گوزەرانی نەدەما).

بۆیە خوای پەنهانکار دەفەرموێ: (**أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ ؟!**) ئایا لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوی دی هەیە؟ کەسی دی هەیە ئەو شتانەی لەدەست بێ؟! (**بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ**) بەڵکو زۆربەیان نازانن و زانیاریان نیە. (بۆیە شتی ئاوا دەڵێن، چونکە کەسێك زانیاری هەبێت بزانێ ئەم بوونەوەرە چۆن بەرێوە دەچێت، هەرگیز شتی ئاوا ناڵێت و پێی وانیە شتێکی دی جگە لە خوا شایستەی پەرستن بێ). ئەمجار دیمەنێکی دی پیشان دەدات،

کە شتێکی شەخصی و دەروونیەو دەفەرموێ: ﴿ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ ﴾(1) واتە: ئایا ئەو بت و طاغووت و پەرستراوانە باشترن، یان ئەو کەسەی کە وەڵامی ئینسانی بێپەناو بێ چارە دەداتەوە، کاتێك کە لێی دەپاڕێتەوە، وە ئەو زەرەرو زیان و مەترسی و ناخۆشییەی کە تووشی بووە لێی لادەبات و دەتان کات بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، یا خود جێنشینی خەڵکانی دیکەی لەسەر زەوی (أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ) ئایا لە گەڵ (الله)دا پەرستراوی دیکە هەیە؟! (قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ )کەم بیردەکەنەوەو پەند وەردە گرن!. ئنجا دوای ئەوە دیمەنێکی دی پێ شان دەدات و دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَنْ يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾(2) واتە: یان ئایا ئەو پەرستراوانەتان باشترن، یاخود ئەو کەسەی کە لە تاریکاییەکانی وشکانی و دەریادا ڕێگاتان نیشان دەدات (دیارە لە بیابانەکاندا سەرە دەری دەرکردن زۆر بە زەحمەت و پڕ کوێرەوەرییە، بە تایبەت ئە گەر گەردەلوول و گێژەڵووکەو بای دێت و دەبێتە تۆزو خۆڵ و دونیا تاریك دادێت، وە ئەگەر بە هۆی ئەو نیشانانەوە نەبێت کە خوای بە بەزەیی دایناون ئینسان سەری لێ دەشێوێت، وە لە دەریاکانیشدا بە هەمان شێوە تاریکایی زۆری هەیە بە هۆی تەمومژو هەڵمەوە، کەوا تە: بە

---

(1) ( النمـل : 62 ) .
(2) ( النمـل : 63 ) .

ڕاستی هەر خوای خاوەن هێزو بەزەیی ڕزگار تان دە کات و بە هۆی نیشانەکانییەوە ڕێگاتان نیشان دەدات، بە هۆی ئەستێرەکان و مانگ و خۆرو نیشانەکانی دیکەوە).

وە دەفەرموێ : ئایا کێیە کە (با)یەکان دەنێرێ کە موژدەدەرن لە پێش ڕەحمەت و بەزەییەکەی خۆیەوە (کە مەبەستی پێ بارانە چونکە بە زۆری پێش باران بای دێت) ﴿أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ﴾ ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دی هەیە؟! (بێگومان نەخێر) ﴿تعالى الله عما يشركون﴾ بەرزی بۆ خوا لەوەی کە ئێوە دەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا.

ئەمجار لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾[1] واتە: ئایا کێیە دروستکراوەکان دروست دە کات و دوای مراندنیان زیندوویان دەکاتەوە وە کێیە کە ڕۆزیتان دەدات لە ئاسمان و زەویدا؟ ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوی دی کە هە یە؟! پێیان بڵێ بەڵگەکەتان بهێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن؟ (واتە: کوا بەڵگەتان چییە لەسەر هەبوونی پەرستراوی دیکە؟!).

(1) ( النمل : 64 ) .

## خاڵی چوارەم :

## قورئان دەستی ئینسان دەگرێ و لەگەڵ دیاردە و دیمەنە واقعییەکاندا ڕووبەڕووی دەکاتەوە

(1) بۆ نموونە سەرەتا با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین لە سوورەتی (الروم): ﴿ فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ۞ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ۞ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ ۞ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ۞ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ۞ وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ ۞ وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ۞ وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ۞ وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ۞ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ ۞ وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ وَلَهُ

**الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾**[1] لە ئایەتی یەکەمدا دەفەرمویّ: (**فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ**) واتە: پاکی بۆ خودا کاتیّك کە ئیّوارە دەکەنەوە وە کاتیّك کە بەیانی دەکەنەوە **﴿وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾** واتە: وە ستایش هەر بۆ ئەوە لە ئاسمانەکان و زەویدا ئیّواران وکاتیّك کە نیوەڕۆ دەکەنەوە، هەندیّك لە تویّژەرەوانی قورئان دەڵیّن: ئەوە ئاماژەیە بە کاتی پیّنج نویّژە فەرزەکان، (**حِينَ تُمْسُونَ**) ئاماژەیە بۆ نویّژی شیّوان (المغرب)و خەوتنان (العشاء)، (**وَحِينَ تُصْبِحُونَ**) ئاماژەیە بۆ نویّژی بەیانی، (**وَعَشِيًّا**) ئاماژەیە بۆ نویّژی ئیّوارە، (عصر) چونکە (عشي) واتە: ئیّوارە، (**وَحِينَ تُظْهِرُونَ**) ئاماژەیە بۆ نویّژی نیوەڕۆ، پاکی و ستایش بۆ خوا لە هەموو ئەو کاتانەدا، واتە: بەردەوام و هەمیشە خوا بە پاك گیراوەو ستایشی بۆ کراوە، ئنجا دەفەرمویّ: **﴿ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾** واتە: (خوا) زیندوو لە مردوو پەیدا دەکات، مردووش لە زیندوو پەیدا دەکات **﴿وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ﴾** واتە: زەویش دوای ئەوەی کە مردووەو ژیانی تیّدا نەماوە، زیندووی دەکاتەوە، لە بەهاراندا دەبینین هەموو جۆرە گیاو گوڵ و سەوزاییەك سەری لە زەوی دەرهیّناوەو دونیا یەك پارچە سەوزە، پاش ماوەیەك

---

(1) ( الروم 17-27 ) .

وشك هەڵدەگەڕێ و دەبێت بە پووش، پاشان دووبارە باران دە ـبارێ و دەڕوێتەوەو سەوز دەبێتەوە. (وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ) ئ ـێوەش بەو شێوەیە دەردەهێنرێنەوە، ئەو خوایەی کە ئەو زەویە مردووە زیندوو دەکاتەوە، کە وشك هەڵگەڕاوە, ژیانی تێدا نەماوە، دوایی دوبارە ژیانی ت ـێدا پەیدا دەبێتەوە، بەهەمان شێوە، ئ ـێوەش ـئاوا پە ـیدا دەکرێ ـنەوەو زیندوو دەبنەوە. ئنجا ئەم دیمەنانە دەخاتە پێش چاو و دە ـفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾ واتە: لە نیشانەکانی پەروەردگاریتی خوا ئەوەیە کە ئێوەی لە ـگڵ درو ست کردوە، پاشان ئێوە یەکســـــــەر دەبنە ئینسان و بە سەر زەو ـیدا بڵاودەبنەوە، لێرەدا ـیان مەبە ست درو ستکرانی ئادە ـمە (عل ـیە السلام) لە گڵ، یان دروستکرانی خۆمانە، وەك ئینسان بەگ شتی، کە لە تۆویلکە (نطفة)ی باب ودایک ـمان درو ست ـبووین، د ـیارە (نطفة)ەکەش لە ـخوێن درو ستبووە، خوێنە ـکەش ـلە ـخواردنی هەزمکراو، خواردنی هەزمکراویش لەو شـــــتانەیە ـکە ـلە زەوی پەیدابوون کە یان سەر چاوەیەکی رووەکی ـیە، ـیان سەر چاوەیەکی گیانداری و ئاژەڵی هەیە کەواتە: ئێمە وەك ئادەمی بابمان هەر ـلەو گڵە دروستبووین کە ئەوی لـێ دروستبووە، جا کە سەیر دە ـکەین جیاوازیەکی یەکجار زۆر لە نێوان گڵ و ئینساندا هە ـیە ـبەڵام ـبە فەرمانی خوای باڵادە ست ـئەو گ ـڵە، ـئا ـئەو ئین سانەی ـلـێ

پەیدادەبێت، دوای ئەوەی کە خوا ڕوو حی بە بەردا دە کات. ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1] واتە: وە لە نیشانەکانی پەروەردگاریێتی خوا (عزّو جل) ئەوەیە کە لە نەفسی خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون (واتە ئەوانیش وەك ئێوە ئینسانن و لە هەمان جۆرە نەفس دروست کراون). ئنجا ڕوونی دەکاتەوە کە حیکمەتی لە یەك جۆرە نەفس بوونی پیاو و ئافرەت چیە؟ دەفەرموێ: تاوەکو بەهۆی هاو سەرەکانتانەوە ئارامییتان بۆ بێت (دیارە ئینسان چ پیاو چ ئافرەت بەهۆی هاوسەرەوە دڵی ئارام دە گرێ و ئۆخژنی بۆ دێت و هەست بە ئاسوودەیی دەروون دەکات). پاشان دەفەرموێ: وە لە نێوانتاندا خۆشەویستی (مودة)و بەزەیی (رحمة)م داناوە هەم یەکدیتان خۆش دەوێت و هەم بەزەییتان بەیەکدا دێتەوە (لە کاتی ساغی و سەلامەتیدا یەکدیتان خۆش دەوێت و، وە لەکاتی نەخۆشی و زیان و زەرەردا بەزەییتان بە یەکدا دێتەوە، لە کاتی جوانیی و گەنجێتییدا زیاتر بەهۆی خۆشەویستییەوە دڵتان بەیەکەوە بەندەو، لە کاتی پیریی و بەساڵداچوونیشدا بەزەییتان بەیەکدیدا دێتەوەو پەرۆشی یەکدیتانە، وە لەگەڵ یەکدیدا خۆشەویستیتان هەیەو لە گەڵ

(1) ( الـروم 21 ) .

منداڵەکانتـــــان بەزەییتان هەیە) دوایی دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە: بێگومان لەو مە سەلەیەدا نیـ شانەو بەڵگەی زۆر (لەسەر پەروەردگاریتـــــی خواو ناو و ســـیفەتە بەرزو چاکەکانی) هەن، بۆ کەسانێك کە بیـر بکەنەوە. بە ڵـێ ئیند سان ئەگەر بیــربکاتەوە لەو پەیوەندییەی نێوان ژن و مێرد دایك و باب و ڕۆڵەو دروستبوونی خێزان، نیـ شانەو بەڵ گەی زۆر هەن لە سەر پەروەردگاریتـــــی خوا (عزّو جل) کە د یارە ئەوەش شتێکە دەتوانین ڕۆژا نە سەرنجی بدەین. وەك دەبـ ینین کتێـ بی خوا بۆ ئاشـــــناکردنمان بە خوای بەرزو مەزن ڕاستەوخۆ لە گەڵ دیمە نە زیندوو و واقیعییەکاندا ڕووبەڕوو دەکاتەوەو بێنیازمان دە کات لە بیــرکردنەوەی عەقڵیا نەو فەلـ سەفییانەی و شك و ڕەق و تەق و ڕاستەوخۆ لەگەڵ نیشانەو بەڵگەکانی خوا (سبحانە و تعالى)و ئەو تابلۆو دیمەنانەدا کە زادەو بەرهەمی ناوو سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی ڕووبەڕوومان دەکاتەوە ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ﴾ وا تە: وە لە نیشانەکانی خوای بەرز درو ستکردنی ئاسما نەکان و زەوی، وە جیاوازی زمان و ڕەنگەکانتە، بێگومان لەوەشدا نیشانەی زۆر هەن بۆ زانایان. بۆچی فەرموویەتی زانایان؟! چونکە کێ دەتوا نێ وەك پێویســت لە درو ستکرانی ئاسما نەکان و زەوی یەوە ڕابمێ نێ و

وردبێتەوەو ئەنجامگیرییان لێ بکات؟ بێگومان کە سانێك کە زانیارییان هەبێت، بەڵام ئینسان هەر هەندێك (فیکر)ی هەبێت دەتوانێ لە مەسەلەی ژن و مێردایەتی و پەیوەندی نێوان ئافرەت و پیاو تێبگات و شت هەڵبێنجێ، بەڵام بۆ تێگەیشتن لە نهێنییەکانی ئاسمانەکان و زەوی و بوونەوەر پێویستی بە زانیاری هەیە، هەروەها بۆ سەرنجدان لە جیاوازی زمانەکان، بە هەمان شێوە پێویست بە زانیاری دەکات، زانایانی زمان دەڵێن ئێستاکە زیاتر لە (4000) چوار هەزار زمانی سەربەخۆ هەیە، کە زمانی (کوردی) بە لەهجەکانی بادینی و سۆرانی و زازایی ولەك و لوڕو هەورامییەوە هەمووی بە یەك زمان دادەنرێت!

وە جیاوازی ڕەنگەکانیشتان بە هەمان شێوە، هەم ڕەنگی ڕەگەزو نەتەوەکان بە جیا، وە هەم ڕەنگی تاکە تاکەشتان بە جیا، کە هەموویان لە یەك جیاوازن و هیچ کامێك کتومت لەوی دی ناچێ!

ڕۆژێکیان کابرایەك بە (عومەری کوڕی خەطاب)ی -خوا لێی ڕازی بێ- گوت: شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر هەیە کە بەڕاستی جێگای سەرنجە، (ئیمام عومەر) گوتی: چیە؟! گوتی" یاری شەترەنج هەیە، ئەگەر هەزاران جاریش بیکەی، هیچ جار وەك هی پێش نابێتەوە، (ئیمام عومەر) گوتی: شتی زۆر لەوە سەیرو سەرسوڕهێنەرتر هەیە، کابرا گوتی چیە؟ گوتی: دەموچاوی ئینسان کە بستێك پانەو بستێك

دریژه، لەوەتەی خوا ئینسانی دروست کردوون، تا کۆتایی بە ئینسانەکانیش دێت هیچ ئینسانێك لەگەڵ یەکێکی دی وەك یەك ناچن!

کابرا گوتی: بەڕاستی وایە، من تا ئێستا بیرم لەوە نەکردۆتەوە.

بەڵێ بۆ زانایان نیشانەو بەڵگەی ناسینی خوا زۆرن لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی جیاوازی زمانەکان و ڕەنگ و دیمەنەکانی خەڵکی!

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ واتە: هەروەها لە نیشانەکانی پەروەردگاریتی خوا ئەوەیە کە بە شەوو ڕۆژ دەخەون، وە هەروەها بژێو لە بەخششی خوا داوا دەکەن، واتە: بە شەو دەخەون و بە ڕۆژ ڕزق و ڕۆزی خوا داوا دەکەن (یاخود بۆیە فەرموویەتی: هەر کام خەوتنتان و پەیداکردنی بژێویتان بە شەو و رۆژە، تاکو هەر کامیان هەم شەوو هەم ڕۆژیش بگرێتەوە. چونکە هەندێك کەس کارو کاسبییەکەی هەر بە شەو ئەنجام دەدات، بە تایبەت لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا، جار وایە بە شەو کاردەکەن و بە ڕۆژ دەخەون، بەڵام بە هەرحاڵ زیاتر هەر وایە کە شەو بۆ ئارام گرتن و پشوودان و خەوتنەو ڕۆژیش بۆ ئیش و کارە).

بەڵێ جا دەفەرموێ: لە نیشانەکانی پەروەردگاریتی خوا ئەوەیە کە بەشەو دەخەون و داواکردن و بەدوادا گەڕانی بژێویشتان کە بەخششی خوایە لە ڕۆژ دایە، یاخود لە هەردووکیان دا دەشخەون و بژێوو ڕۆژیش داوا دەکەن، بەڕاستی لەوەدا نیشانەی زۆر هەن بۆ کۆمەڵێك کە ببیستن،

واتە: کەسانێك هەر ئامادەی بیستن بن نیشانەکانی گەورەیی و بەزەیی و دەستەڵاتی خوایان لە دیاردەی شەوو رۆژان دا بۆ دەردەکەون.

دوایی دەفەرمویٚ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاء مَاء فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: وە لە نیشانەکانی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوا ئەوەیە کە بروسکە (برق)تان نیشان دەدات کە هەم ترس و هەم ئومێدو هیواشتان هەیە(لە تیشکەکەی دەترسێن کە تووشی زیان بن، وە تەماع و ئومێدیشتان هەیە کە بارانی ڕەحمەتی خوای بەدوادا بێت) وە لە ئاسمانیٚ (لە هەوران)وە ئاوتان بۆ دەنێرێتە خواریٚ، ( ئەم ئایەتە ئیعجازێکی عیلمی تێدایە چونکە زانایان بۆیان دەر کەوتوە کە هەر هەورێك بروسکەو هەورە تریشقەی لەگەڵدا نەبێت، ئەو هەورە متووربە (تلقیح) نەبووە، کە متووربەش نەبیٚ بارانی پیٚوەنیە و نەزۆکە، بۆیە دەفەرمویٚ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ ئنجا دەفەرمویٚ: ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاء مَاءً﴾واتە: یەک سەردوای ئەو باران دەنێرێتە خواریٚ). ﴿فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ واتە: بە هۆی ئەو ئاو ( باران و بەفرو تەرزە )ەوە زەوی دوای ئەوەی کە مردووەو وشك هەڵگەڕاوە پێی زیندوو دەکاتەوە، ( إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ) واتە: بێگومان لەوەشدا نیشانە زۆرن بۆ کۆمەڵێك کە عەقڵیان هەبێت و بفامن.

کۆتایی پیٚهێنان (تعقیب)ی ئەم چەند ئایەتانە جێگای سەرنجە! بۆ ئایەتی یەکەم فەرمووی (لقوم یتفکرون) دواتر فەرمووی (للعالمین)

دواتریش فەرمووی (لقوم یسمعون) لە کۆتاییدا فەرمووی (لقوم یعقلون)، چونکە سەرەتا دەبێ ئینسان بیر بکاتەوە، کە بیری کردەوە، زانیاری وەدەست دێنێ، کە زانیاری وەدەست هێنا، ئامادەیی ئەوەی تێدا دەبێت کە حەق ببیستێ، کە حەقی بیست، ئەوجار دەفامێ و عەقڵی پەیدا دەبێ و لە شت تێدەگات!!

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاء وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ﴾ واتە: وە لە نیشانەکانی پەروەردگاریتی و بەدیهێنەرایەتی خوا ئەوەیە کە ئاسمان و زەوی (واتە بوون و جود-هەمووی) بە فەرمانی خوا ڕاوەستاوە، ئنجا دوای ئەوەش کە دەتانمرێنێ و دەتانخاتەوە ژێر زەوی، لە کوێوە هاتوون بۆ ئەویێتان دەنێرێتەوە جەستەکەتان لە کوێوە هاتووە لە چی پێک هاتوە، دەینێرێتەوە بۆ ئەوێ، ڕووحەکەشتان لە کوێرا هاتوە دەینێرێتەوە بۆ ئەوێ، یاخود دەینێرێ بۆ ئەو شوێنەی کە خوا بۆخۆی دەزانێ کوێیە؟! وە هەرکاتێك بانگی کردن لە زەوییەوە، هەرکەسە لەو شوێنەی کە لێی نێژراوە سەر دەردێنێتە وە لە زەوی وەك چۆن گیای بەهاران کە بارانی لێ دەبارێ هەر چڵە گیایەو هەر دەنکە تۆوە لە شوێنی خۆی سەر دەردێنێتەوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ﴾ واتە: وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەموو هی ئەوە، وە هەمووشیان بۆی گەردن کەچن، (ڕەنگە یەکێك بڵێ: چا کوا کافر ملکەچە بۆ خوا؟! دەڵێین، لە ڕاستیدا چەمکی ملکەچیی زۆر فراوانترە لەوەی کە ئینسان تەنیا بە ویست و ئیرادەی خۆی بێت، خەڵکی کافریش

ناتوانیّ لە پاساو سوننەتەکانی خوا لابدات، ناتوانن هەنا سە نەدەن، ناتوانن بەچاو نەبینن. ناتوانن وابکەن دلّەکەیان لێینەدات، ناتوانن بیانەویّ بژین و نەخۆن و نەخەون، ناتوانن لەسەر زەوی ژیان نەبەنەسەر!! واتە: خوا چۆنی خولّقاندوون و چۆن فەرمانی لەسەرە کە بژین، دە بیّ هەر بەو شێوەیە بژین، مرۆڤ تەنیا لەو بەشەی کە تێیدا ئازاد کراوە دەتوانیّ تێیدا ملکەچی خوا نەبێت، بەلاّم لە بەشەکانی دی کەدا هەر ملکەچی خوایەو ناتوانیّ لە سوننەت و قانوونەکانی خوا لابدات.

ئەمجار لە کۆتایی ئەم چەند ئایەتەدا دەفەرمویّ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ واتە: وە خوا ئەو کەسەیە کە درو ستکراوەکان دروست دەکات و دەست پیّدە کات، پا شان دوای مردن یان، دوو بارە دەیانگێڕێتەوەو زیندوویان دەکاتەوە، وە ئەو دووبارە زیندووکردنەوە یەی پیّ ئاسانترە، (هەمیشە دووبارەکردنەوەو گێڕا نەوەی شت لە دە ست پێکردنی ئاسانترە، بۆ هەموو خاوەن پیشەیەك هەر وایە، ئەوەش کە خوا باسی دەفەرمویّ بۆ تێگەیشتن و عەقڵی ئێمەیە، ئەگەرنا بە نـ سبەت خوای پەروەردگارەوە قورس و ئاسانی نیە و ئاسان و ئاسانترە نیە، بۆیەش فەرموویەتی: ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ وا تە: وە سیفەتی هەرەبەرز لە بوون دا بۆ خوایە، واتە: خوای بیّهاوتا وەك خۆتان قیاس مەکەن، خوا هیچی لا زەحمەت نیە، بەلاّم بۆ ئێوە هەمیشە دەست پێکردنی شت زەحمەتتر و قورسترە لەوەی کە دوا یی دو بارەی بکا تەوە، سیفەت و وێنەی هەرەبەرز هەر بۆ خوایە، ﴿فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لە

ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ وە خوای بێوێنەو تاك هەر بۆخۆی بالادەست و کاربەجێیە.

2) ئێستاش با نموونەیەکی دیکەی ئەو جۆرە ئایەتانە لە سوورەتی (الواقعة)دا بخەینەڕوو خوای تاك و پاك لە ئایەتەکانی (57 تا 74)دا چەند دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش دەخاتە پێش چاومان و ڕوو بەڕوومان دەکاتەوە لەگەڵ پەرێزو شوێنەوارەکانی خۆیدا دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلاَ تُصَدِّقُونَ﴾ واتە: ئێمە ئێوەمان دروست کردوە ئەدی بۆچی بڕوا ناهێنن، (و بۆچی زیندووکردنەوەتان بە ڕاست نازانن)؟! ئنجا وەك بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوە کە تەنیا خوا مرۆڤەکانی دروست کردوونن دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ ۞ أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ﴾ واتە: ئایا ئەو تۆوە دەبینن کە لە ڕێی جووت بوونتان لەگەڵ هاوسەرانتان دەیڕێژن (و دەچێتە نێو منداڵدانەوە) ئایا، ئێوە دروستی دەکەن؟ یان ئێمە دروستکەرین؟ ئایا هیچ کەس دەتوانێ بڵێ، من (مەنی) دروست دەکەم؟! خوای پەروەردگار جیهازی زۆر ئاڵۆز(مُعَقَّد)ی لە نێو ئێسقانەکانی پشتی پیاو و ئێسقانەکانی سینگی ئافرەتدا داناوە، کە لەوێدا مەنی دروست دەبێت، پاشان دێتە نێو کۆئەندامی زاووزێ، بۆیە لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾[1] واتە: ئەو ئاوە کە ئینسانی لێ دروست دەبێت لە نێوان

(1) ( الطارق 7 ) .

ئێسقانەکانی پشتی پیاوو سینگی ئافرەت دێتە دەرێ، وە سەرەنجام زیندوەرەیێکی ب چووکی تۆو ( منى)ى پیاو کە ( حَیْمَن)[1]ى پێدەگوترێ لەگەڵ هیلکۆکە(بوَیضَة)ى نێو ئاوى ئافرەت یەکدەگرن و تۆویلکە (نطفة)یەك پێك دێنن و لە منداڵدان (رحم)ى ئافرەتدا نیشتەجێ دەبێ و دەبێتە کۆرپە (جنین)!

پێشم وایە هەرکەسێك باش سەرنج بداتە مەسەلەی دروستبوونی خۆی، کە چۆن لە (نطفة)یەکی بچووکی نەبینراوەوە قۆناغ بە قۆناغ دێ تا دەبێتە مرۆڤێکی تێرو تەواو، دەگاتە ئیمانێکی دامەزراو!

پاشان دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمْ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ، عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنْشِئَكُمْ فِي مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئێمە مردنمان لە نێوان ئێوەدا بڕیارداوە (کە دەبێ بمرن)و هیچ کەسیش پێشمان لـێ ناگرێتەوەو ناتوانێ دەستەوستانمان بکات، لەسەرئەوەی کە ئێوە ب گۆڕین و ئێوە لابەرین و وێنەی ئێوە بێنین، وە ئێوەش( لە قۆناغی بەرزەخ و لە قۆناغی قیامەتدا ) بە شێوەیەك دروست بکەینەوە کە بۆخۆتان نایزانن. (واتە: هەر لەو قۆناغەدا بە شێوەیەك دروستتان دەکەینەوە).

بەڵێ بێگومان ئەو جەستەو شێوە پێکهاتنەی کە ئێمە لە جیهانی بەرزەخ و گۆڕدا هەمانە، جیایە لە هی دونیا، وە ئەوەی کە لە جیهانی قیامەتدا پێی دەچینە بەهەشت، یان خوانەخواستە خەڵك پێی دەچێتە دۆزەخ، جیایە لەوەی ئێستا، ئەوەی ئێستا لە دەیان ساڵێك تێنا پەڕێ

---

(1) کورت کراوەی : (الحیوان المنوی) یە .

دوایی نەخۆش و پیــرو پەککەوتە دەبـێت، بەڵام بەهەشتییەکان بۆ هەمیشە لە بەهەشتدا دەمێننەوەو پیــرو نەخۆش نابن، هەروەها دۆزەخییەکانیش بۆ هەمیشە لە دۆزەخدا دەمێننەوە، دیارە حەتمەن، ئەو شێوە پێکهاتنەی دوارۆژ و بەرزەخ جیایە لە هی ئێرە، بۆیە دە فەرموێ: ﴿وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ بە جۆرو شێوەیەك دروستتان دەکەینەوە و پێکتان دێنینەوە کە بۆخۆتان نازانن چۆنە، ئنجا دە فەرموێ: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمْ النَّشْأَةَ الأُولَى فَلَوْلاَ تَذكَّرُونَ﴾ واتە: بە تەئکید ئێوە دەزانن کە یەکەمجار چۆن دروست بوون، بۆیە دەبوایە بیرتان کردبا یەوەو پەندتان وەرگرتبایە (کە ئەوەی توانیویەتی یەکەمجار پێتان بگەیەنێ و دروستتان بکات و لە نەبوون (عدم) پەیداتان بکات. دەشتوانێ دوای ئەوەی کە پەیدابوون و لە نێوچوون دوبارە زیندووتان بکاتەوەو بتانگێڕێتەوە).

ئنجا دوای خۆمان، سەرنجمان بۆ لای کشتوکاڵ رادەکێشێ:

دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ ۞ أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾ واتە: ئایا ئەوە دەبینن کە دەیکێڵن (ئەو زەوییەی کە دەیکێڵن و دوایی دەنکە تۆو، یان شەتڵ و نەمانی تێدا دەچێنن) ئایا ئێوە دەیڕوێنن، یان ئێمە دەیڕوێنین؟! (بەڵێ ئێوە دەیکێڵن و دوایی دەیچێنن یان دەیتێژن بەڵام پاش ئەوە کێ دەیڕوێنێ؟ ئێوە یان ئێمە؟!) ﴿لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾ واتە: ئەگەر ویستبامان دەمانکردە پووش و پەڵاش (ئەو نەمامەی کە تۆ دەینێژی، ئەگەر خوا بیەوێ نەڕوێ، یەکسەر وشك دەبێ و تێك دەشکێ و دەبێت بە پووش و پەڵاش، یان ئەو دەنکە تۆوی

دانەوێڵەیە کە دەیچێنی، ئەگەر خوا بیەوێ لەدوای ئەوەی کە دەشـڕوێ، وشك دەبێت و دەبێت بە پووش و پەلاش) ئەمجار کاتێك کە وای لـێ دێت، ئێوە زۆر سەرسام دەبن، یان قسە دەکەن (تفکّە) بە هەردوو واتا دێت، دەڵێن چی؟! دەڵێن: ﴿إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ۞ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ بەڕاستی لە سەریشی قەرزدار بووینەوە، بەڵکە هەر بێ بەش بووین، (ئەو کات ئاوا پەشیمان دەبنەوە و گلەیی لە بەختی خۆتان دەکەن).

ئنجا سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ لای ئاو و دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ﴾ ئەو ئاوە دەبینن، کە دەیخۆنەوە؟ ﴿أَأَنْتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ﴾ ئێوە لە هەورەکان ناردووتانە خوارێ یان ئێمە نێرەرە خوارەوەی ئەو ئاوەین؟!

ئایا هیچ کەس هەیە بتوانێ بڵێ: من باران دەنێرمە خوارێ؟ ﴿لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلاَ تَشْكُرُونَ﴾ ئەگەر ویستبامان تاڵ و سـوێرمان دەکرد (واتە: نەمان دە پالاوت، بەڵکو هەر بە سوێری لە ئاوی ئۆقیانووسەکانەوە دەمانهێناو دەمانباراند، ئەوکات بۆتان نەدەخورایەوەو بە کەڵکی هیچ نەدەهات)، کەوا تە بۆ چی سوپا سگوزاری خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاری خۆتان ناکەن؟!

دوای ئەوە سەرنجمان بۆ لای ئاگر ڕادەکێشێ و دە فەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ﴾ ئایا ئەو ئاگرەتان بینیوە کە دایدەگیرسێنن؟ ﴿أَأَنْتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنشِئُونَ﴾ ئایا ئێوە درەختەکەتان پێکەیاندوە، یان ئێمە؟! (واتە: ئەو ئاگرەی کە ئێوە دایدەگیرسـێنن، ئەو ماددەی

گەرمییەی کە لەو درەختە دایە، کە لە ئەنجامی تیشکە پێکهاتن (التمثیل الضوئي)ەوە هاتۆتە نێوی و تیشکی خۆری تێدا کۆبۆتەوە، لە ڕاستیدا ئەو گەرمییەی کە لەو درەختە سەوزەدا هەیە، دوای ئەوەی کە وشك دەبێتەوەو پاشان دەسووتێ، هەر ئەو تیشك و وزە خەزنکراوەی خۆرە کە بە فەرمانی خوا لەوێدا کۆبۆتەوە، ئینسانیش دایدەگیرسێنێ و دەئایسێ، هەرچی گەرمی هەیە لەسەر زەوی کاتی خۆی هەمووی لە خۆرەوە هاتوە، ئایا ئێوە درەختەکەتان دروست کردوە بەو شێوەیەی کە وزەو تیشکی خۆر لە خۆیدا خەزن بکات و کۆی بکاتەوە، یان ئێمە؟! بێگومان تەنیا خوای پەروەردگار (تبارك وتعالى).)

ئنجا دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعًا لِلْمُقْوِينَ﴾ واتە: ئێمە ئاگرمان کردوە بە مایەی بیرکردنەوەو خستنەوە بیر بۆ خەڵکی، وە کردووشمانە بە هۆیەك بۆ ئەوەی کە ئینسان سوودو کەڵکی لێ ببینێ، بە تایبەتی بۆ ڕێبواران، بۆیەش لێرەدا بە تایبەت باسی ڕێبوارانی کردوە، چونکە ڕێبوار زیاتر پێویستی بە ئاگر هەیەو زیاتر دەزانێ کە ئاگر چەند گرنگە، بە تایبەت لە کاتی سەرمابووندا بۆ خۆ پێ گەرم کردنەوە، یان کە لە سەفەردا پەکی کەوتوە لەسەر خواردن و ئاگرێکی دەست بکەوێ بۆ خواردن سازکردن، یان ﴿لِلْمُقْوِينَ﴾ بە واتای برسیان(جائعين) دێت، بۆ کەسانی برسی، وە هەروەها بە مانای دیکەش دێت یەکێك لەوانە، واتە: بۆ کەسانێك کە توانایان هەبێت، چونکە ئەوانەی خاوەن توانان زیاتر سوود لە ئاگر دەبینن، بۆ پیشەسازی وە لە

کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاك بگرە، ئەو پەروەردگارە مەزنەی کە خاوەنی ئەو هەموو نیعمەت و بەخششانەیە!

3) ئێستاش با هەر لەو ڕووەوە کە باسمان کرد سەرنجێکی ئەم چەند ئایەتانەش بدەین لە سووڕەتی (عَبَس) ئایەتی (24 تا 32) کە چەند شوێنەوارێکی دیکەی خوای بەدیهێنەرو پەرەردگارمان دەخەنە بەر نیگا:

﴿فَلْيَنْظُرْ الإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ ۞ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا ۞ ثُمَّ شَقَقْنَا الأَرْضَ شَقًّا ۞ فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ۞ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ۞ وَزَيْتُونًا وَنَخْلاً ۞ وَحَدَائِقَ غُلْبًا ۞ وَفَاكِهَةً وَأَبًّا ۞ مَتَاعًا لَكُمْ وَلأَنْعَامِكُمْ﴾ واتە: با ئینسان سەرنجی خواردنەکەی خۆی بدات (وەك لە بابەتەکانی پێشوودا باسمان کردو لەم بارەوە مامۆستا (سەعید نوڕسی) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت، نوکتەیەکی زۆر جوانی هەیە، دەڵێ: (ئینسان کە خواردن دەخوات، ئەگەر ئیماندار بێت، تەنیا بەشی گەدەی لەبەرچاو نیە، بەڵکو بەشی عەقڵ و دڵیشی لەبەر چاوە)، بەڵێ مرۆڤی مسوڵمان بە عەقڵ سەرنجی خۆراکەکەی دەدات و پەندی لێوەردەگرێ، بە دڵیش سوپاسی خوای لەسەر دەکات و ئیمان بە دەسەلات و توانای خواو خۆشەویستی و چاکەکاریی و بەخششی خوای لە دڵدا دەجووڵێ، ئەوجار دوایی دەیخاتە نێو گەدەیەوە، بۆ ئەوەی وێڕای عەقڵ و دڵی جەستەکەیشی سوودو کەڵکی لێوەربگرێت،

بەڵام ئەگەر تەنیا بۆ تێرکردنی گەدە خواردن بخورێت، کە تەنیا جەستەکە کەڵکی لێوەربگرێت، دیارە ئینسان وادەزانێ کە تەنیا لە گەدەو جەستە دروست بووە، بەڵام نەخێر، ئینسان و بێرای جەستە عەقڵیشەو دڵیشەو ئەوانیش پێویستییان بە خۆراك هەیە، خۆراکی عەقڵ و دڵیش تێوەڕامان و سەرنجدانە بۆ عەقڵ، وە پەند وەر گرتن و هەست کردن بە نیعمەتە بۆ دڵ.

بۆیەش خوای پەروەردگار کە باسی کافرەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَهُمْ﴾(1) واتە: ڕادەبوێرن و دەخۆن، وەك چۆن ئاژەڵ و مالاَت دەخوات، جێگاشیان ئاگرە. ( چونکە هەروەك ئاژەڵ و مالاَت ژیاون، نەك وەك ئینسان.

پاشان دەفەرموێ: ﴿أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا﴾ واتە: ئێمە ئاومان ڕژاندۆتە خوارێ بە هەڵڕشتن، ﴿ثُمَّ شَقَقْنَا الأَرْضَ شَقًّا﴾ (ئاسمانمان وا دروست کردوە کە بتوانێ هەورەکان هەڵبگرێ و پاشان ئاوەکەیان بێتە خوارێ، ئنجا زەویشمان وا دروست کردوە کە بتوانێ لەت (شق) بێت (و دەنکە تۆوی زۆر ناسك بتوانێ لێی بێتە دەرێ، دەنکە تۆوی وا هەیە کە دەڕوێ لەوپەڕی ناسکی دایە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرد شەق دەکات و سەر دێنێتە دەرێ! یان لە شاخ و چیاکان دا نەمامی زۆر ناسك تا شەبەرد دەقڵیشێنێ و دێتە دەرێ!)

---

(1) ( محمد ) 12 .

ئنجا دەفەرموێ ﴿فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبّـًا﴾ واتە جا دەن کە تۆو مان لەو زەوییەدا ڕواندوە، چ هی دانەوێڵە بێت، یان هی دارودرەخت بێت ﴿وَعِنَبًا وَقَضْبًا﴾ وە نەمامی ترێمان تێداڕواندوە، وە ﴿قَضْب﴾ ی شمان تێدا ڕواندوە، کە هەر جۆرە میوەو سەوزەیەك دەگرێتەوە کە یەک سەر بە پێدانووسان و قەپاڵتە بخورێت وەك ترۆزی و خەیارو مۆزو ڕێواس. یاخود ئەوەیە کە ئاژەڵ و ماڵات بیخوات وەك وێنجەو گیاو سێوەڕەو ئەو شتانە، ﴿وَزَيْتُونًا وَنَخْلاً﴾ وە درەختی زەیتوون و دارخورما شمان تێدا ڕواندوە ﴿وَحَدَائِقَ غُلْبًا﴾ وە چەندان باخی زۆر چڕوپڕ و لە یەك ئالاو ﴿وَفَاكِهَةً وَأَبًّا﴾ هەروەها جۆرەها میوەو گیاوگۆڵ و لەوەڕ ﴿مَتَاعًا لَكُمْ وَلأَنْعَامِكُمْ﴾ ئەو شتانەش هەموو دابینکردنی پێداویستییە و مەدارساز بوونە، بۆ خۆتان و بۆ ئاژەڵ و ماڵاتەکەتان.

4) کۆتایی ئەم باسەشمان بەم چەند ئایەتە دێنین کە خوای زاناو شارەزا تێیاندا فەرمان دەکات بە سەرنجدان و تێوەڕامانی چوار دیاردەو دیمەنی سەرسوڕهێنەر: ﴿أَفَلا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ۞ وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ۞ وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ۞ وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾[1] واتە: ئایا سەرنجی (حوشتر نادەن کە چۆن دروست بووە؟ وە سەرنجی ئاسمان نادەن کە چۆن بەرزکراوەتەوە، وە سەرنجی چیاکان نادەن کە چۆن چەقێنراوەن، وە سەرنجی زەوی نادەن کە چۆن ڕاخراوە!! دەربارەی حوشتر کە خوای بەرزو مەزن سەرنجمان بۆ لای

ڕادەکێشی، لە ڕاستیدا حوشتر دروستکراوێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە، زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ گیانداران و زانایان پێی دەڵێن: ( سفینة الصحراء) کەشتی بیابان، چونکە،(1) حوشتر دەتوانێ زیاتر لە دوو هەفتە بەبێ ئاو بژیەت، (2)وە تاکە گیان دارێکە کە دەتوانێ هەموو شتێك بخوات، بۆنموونە (حوشترخۆرکە) کە گیایەکی زۆر تاڵ و دڕکاوییە تەنیا حوشتر دەیخوات، (3) وە زۆریش بە قەناعەتەو، ئەگەر بیانەوێ بیبەن بۆ سەفەری دوور تێ نووی دەکەن، دوایی دەیبەنە سەر ئاوو هێندە دەخواتەوە کە بەشی زیاتر لە دوو هەفتەی بکات، کە هەر لەنێو خۆیدا هەڵی دەگرێت، (4) بە هەمان شێوە ئەگەر بیانەوێ سەفەری دووری پێبکەن و لە سەفەرەکەدا لەوەڕی لێ نەبێت، برسی دەکەن و دوایی زۆر ئالفی دەدەنێ پاشان ئەو حوشترە خواردنەکەی کاوێژ دەکاتەوە، دەیهێنێتەوە بۆ نێو دەمی و دووبارە دەیخواتەوەو سوودی لێ دەبینێت بۆ ڕێگاکەی، (5) وە حوشتر تاکە گیاندارێکە کە میزەکەی هەر بەکەڵك دێت، میزەکەی دەرمانە بۆ هەندێك نەخۆشی وەك لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە(١) وە هەم شیاکەکەی بۆ سووتەمەنی بەکاردێ و هەم گۆشتی دەخورێت، وە هەم تووکەکەی کە (وبر)ی پێ دەڵێن، بەکەڵك دێت بۆ شت چنین و بەرگ و پۆشاك چادرو ڕەشماڵ،

(1) لە ( صحيح البخاري )دا هاتوە .

وە  هەم خۆ شی  بۆ  سواری بە  کەڵك د  ێت، (6) وە حو  شتر وەسیلەیەکی گرنگی گواستنەوەیە، چونکە زۆر بەهێزەو باری قورس دەتوانێ (7) وە پێی حوشتر ئیسفەنجی هەڵکەوتوەو کە لەسەر زەوی دادەنێت پان دەبێتەوە، ئەگەر وا نەبووایە نەیدەتوانی  لە ن  ێو ئەو لمەی  بیاباندا بڕوات، بەڵام کە پێیەکانی دادەنێت پان دەب  نەوەو ڕووبەرێکی زیاتر دادەگرن و تێنا چەقن (8) وە حو  شتر م  لی زۆر درێژو بەرزە بۆ ئەوەی لەو بیابانە گەرمەدا گەرمایی زۆری  نەگاتێ (9) وەپێستی زۆر پتەوە (10) هەرچەندە وەك گوتمان زۆر  بەتین و هێزو تاقەتە لەگەڵ ئەوەشدا زۆریش دەستەمۆیە، کە منداڵێك پێی بڵێ: (یەخ)بە، یەکسەر (یەخ) دەبێت و دەنیشێتە سەر  زەوی  بۆ  بارکردن و  سواربوون، پا  شان پ  ێی ب  ڵێ هەڵ  سە: یەک سەر هەڵدەستێ" وە کۆمەڵێك سیفەتی دیکەش هەن، ئنجا ئاسمان  چۆن بەرزکراوەتەوەو چیاکان چۆن  چەقێنراون و زەوی  یان  پێ ڕاگ  یرو مەحکەم کراوەو زەوی چۆن ئاوا ڕا  خراوە؟  خوای پەنهانب  ین  لە قورئاندا ئاوا ئێمە لەگەڵ دیمەن و دیاردە سروشتییەکاندا ڕوو بەڕوو دەکاتەوە، بۆ  ئەوەی  گەورەیی و ه  ێزو توا  ناو دە  ستەڵاتی  خوای پەروەردگاریان تێدا ببینین.

## خاڵی پێنجەم :

## قورئان دڵی ئینسان ڕادەچڵەکێنێ و فیطرەتی خەوتووی وەخەبەر دێنێ

ئەوەش یەکێکی دیکەیە لە تایبەتمەندییەکانی شێوازی قورئان، لە خستنەڕووی بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی خوای بەرزو بێوێنەدا.

1) جا ئێستا وەك نموونەیەك با سەرنجی ئەم ئایەتە بدەین، کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ قُلْ اللّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُوا لِلّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلْ اللّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾(1).

ئەم شێواز (اسلوب)ەی قورئان بریتیە لە ڕاچڵەکاندن وڕاتەکاندن و نقورچکە لێدانی ئینسان، دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ پێیان بڵێ، کێ بەدیهێنەر و پەروەردگار و مشوور خۆری ئاسمانەکان و زەوییە؟!

پاشان خوای بەرز بێئەوەی چاوەڕێی وەڵامی ئەوان بێ یەک سەر بۆخۆی وەڵامی ئەو پرسیارە فێری پێغەمبەر ﷺ دەکات و دەفەرموێ:

(1) (الرعد 16).

﴿قُلْ اللّهُ﴾ بلّێ خوا، چونکە هیچ وەڵامێکی دیکەی ڕاست و ڕەوا بۆ ئەو پرسیارە نیە، یاخود: ئەم وەڵامە بۆ پرسیاری ناوبراو وەڵامێکی ڕوون و بێچەندو چوون و ئاشکرایەو هەرکام لە عەقڵ زانیاری و فیطرەت و وەحی پشتگیری دەکەن.

پاشان دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَفَاتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ﴾ بلّێ: ئایا لە جیاتی خوا یان لەگەڵ خوا پەرستراو و دۆستی دیکەتان هەن؟!

﴿لاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا﴾ کە نەك بۆ ئێوە، بەڵکو بۆخۆشیان توانای سوود گەیاندن و زەرەر گەیاندنیان نیە!! (واتە: ئەوە هیچ کە بە کەڵکی ئێوە نایەن، بەڵکو بە کەڵکی خۆشیان نایەن، وە ئەوە هیچ کە ناتوانن زیان لە ئێوە بدەن، زیانیان پێ لە خۆشیان نادرێت، جا کەسێك نەتوانێ بۆ خۆشی قازانج وەدەست بهێنێ و زیان لە خۆیشی دوور بخاتەوە، مانای وایە بۆ غەیری خۆی حەوت جار حەوت جار ناتوانێ: کەواتە شتی ئاوا شایانی پەرستن و بەندایەتی بۆکردن و بە دۆست و پشتیوان گرتن نیە).

دوایی دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ﴾ پێیان بڵێ: ئایا کوێرو بینا یەکسانن، یاخود تاریکاییەکان و ڕۆشنایی وەکو یەکن؟! (واتە: ئەو بت و پەرستراوانەی ئێوە دەیانپەرستن، چ بت و پەرستراوی داتاشراو بن، چ داروبەردو مانگ و خۆرو ئەستێرە بن، چ طاغووت و حیزب و ڕژێمی نەفامیی بن، چ مۆدێلات و ئارەزوو و بیردۆزەکان بن، وە چ هەر شتێك لەو شتانە بن کە

دەپەرسترێن، ئەوانە کوێرن، جا ئایا کوێر و بینا وەکو یەکن؟ ئەوان بۆ خۆیان بە ڕێگا نازانن، ئایا دەتوانن ڕێگا بە ئێوە نیشان بدەن؟!) ﴿أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ﴾ یان ئەو ڕێبازانەی کە ئێوە گرتووتانە بەر کە بریتیە لە بت پەرستیی و طاغووت پەرستی، کە هەمووی تاریکاییە، لەگەڵ ڕۆشنایی خوا بە یەکگرتن دا وەك یەکن؟! ﴿أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ﴾ یان ئەوەتا چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا داناون کە ئەوانیش وەك خوا شتیان دروست کردوە؟ ﴿فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ﴾.

ئەوانیش دروستکراوەکانی خواو دروستکراوەکان ئەو هاوبەشانەیان لێ تێکەڵ بووە؟ (دیاری ئەمە گاڵتە پێکردنەو خوای بەرزو بێوێنە گاڵتەیان پێدەکات، واتە: ئایا بۆیە غەیری خوا دەپەرستن، غەیری خواش شتیان دروست کردوەو ئەوانیش دروستکراوەکانی خواو دروستکراوەکانی ئەو پەرستراوانەی دیکەیان لێ‌تێکەڵ بووە، بۆیە ئەوانیش دەپەرستن؟!!) ﴿قُلْ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ ئەی موحەممەد هەر بۆخۆت بڵێ: هەر خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو هەر ئەویشە تاکی دەستەڵاتدار، کە هەموو شتێك لەژێر ڕکێفی خۆی دایە.

دیارە ئەم شێوازە هەمووی بریتیە لە نقورچکە لێدان و بێدارکردنەوەی ویژدان و فیطرەت و دەروونی ئینسان.

2) ئێستاش با سەرنجی ئایەتێکی دیکە بدەین لەوبارەوە، کە باسی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) دەکات کە چوون بۆ لای گەل و

نەتەوەکانیان و گفتوگۆیان لەگەڵدا کردوون و بانگیان کردوون بۆ خوا بە یەکگرتن (توحید)و خواپەرستیی و لە درێژەی وتووێژی نێوانیاندا فەرموویەتی: ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾[1] واتە: پێغەمبەرەکانیان (علیهم الصلاە والسلام) پێیان گوتن: ئایا لە خوادا کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، گومان هەیە؟! (ئایا لە پەروەردگاریتی خوادا، لە تاکێتی و یەکتایی خوادا، لە تەنها پەرستراوێتی خوادا، لە خاوەنداریتی خوادا بۆ ئەم بوونەوەرە، گومان هەیە؟) کە بانگتان دەکات بۆ ئەوەی لە گوناحەکانتان ببووریّ، وە دواتان بخات بۆ کاتێکی دیاری کراو (و ئەو کاتە لێتان بپرسێتەوە، کە کاتی دوای مەرگە، یان کاتی قیامەتە)؟!

3) هەروەها لەم سێ ئایەتەشدا دەفەرمویّ: ﴿يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ، الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾[2] ئەی واتە: ئینسان چ شتێك تۆی فریو داوە، بەرانبەر بە پەروەردگاری بەڕێزو بەخشەرت؟! ( چ شتێك وای لە تۆ کردوە کە بە قسەی نەکەی و لە قسەی دەربچی؟! ئەوە ڕا چڵەکاندن و بەخەبەر هێنانە ) ئنجا چ پەروەردگارێك؟! ﴿الَّذِي خَلَقَكَ﴾ ئەو پەروەردگارەی کە تۆی دروست کردوەو بەدیهێناوە، ﴿فَسَوَّاكَ﴾ پا شان ڕێکی

(1) ( إبراهیم 10 )
(2) ( الإنفطار 6-8 )

خستووی ﴿فَعَدَلَكَ﴾ پاشان تۆی هاوسەنگ کردوە، ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ لە هەر دیمەن و شێوەیەك کە بۆ خۆی ویستوویەتی، تۆی پێکهێناوەو تۆی ڕێکخستوە و تۆی بنیات ناوە.

بەڕاستی ئەم ئایەتانە زۆر جێگای سەرنجن، دەبینین کە خوای زانا و شارەزا ئینسان دەدوێنێ وەك ئینسان پێش ئەوەی هیچ بیرو باوەڕێکی وەرگرتبێت و دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ﴾ ئەی ئینسان چ شتێك تۆی فریو داوە؟ لە بەرانبەر پەروەردگاری بەخشەرتدا، چ شتێك وای کردوە کە نەیپەرستی و بەندایەتی بۆ نەکەی و لێی یاخی بی؟!! کەرەم و بەخششی پەروەردگارت کە پێش هەموو شتێك لە هێنانەدی و پەیداکردنت دا دەرەوشاوەتەوە، بۆچی نادیدەت گرتوە؟!

﴿الَّذِي خَلَقَكَ﴾ ئەو کەسەی کە تۆی دروست کردوە، تۆ لە دەریای نەبوون (عدم)دا بووی و ناوت نەبووەو تۆی بەدیهێناوە، بێگومان بوون (وجود) گەورەترین نیعمەت و بەخششە چونکە بناغەی هەمووی نیعمەتەکانی دیکەیە، چونکە نیعمەتی ئیمان و زانیاری و سەرجەم نیعمەتەکانی دیکە لەسەر ئەو بنیات دەنرێت، بۆیە لێرەدا خوای پەروەردگار کە باسی کەرەم و بەخششی خۆی دەکات، یەکەمین نیعمەتێك کە دەیخاتە پێش چاوی ئینسان بریتیە لە نیعمەتی خولقێنران و بوون (وجود) پێبەخشران!

ئنجا دوای بوون (وجود) پێبەخشین و دوای ئەوەی کە لە دەریای نەبوون (عدم) دەری هێناوی: ﴿فَسَوَّاكَ﴾ تەسویەی کردووی و ڕێکی خستووی، ئەسڵی دروستکردن (خلق)، ئەوەیە کە تۆ دروست بکات، ئەگەر کوتە گۆشتێکیش بیت هەر پێت دەگوترێ دروستکراو (مخلوق) ئەگەر هیچ ئەندامێکیشت نەبێت، بەڵام خوای بەخشەر هەر بەوەندە وازی لێت نەهێناوە کە دروستت بکات و هیچی دی، بەڵکو ڕێکی خستوویی و ئەندامە ڕواڵەتی و پەنهانەکانی بۆ دروست کردووی کۆمەڵێك کۆئەندام (جهاز)ی بۆ دروست کردووی، بۆ ئەوەی بتوانی مەداری خۆت و کاروباری خۆتیان پێ هەڵسووڕێنی، وە ئەم ژیانە پێنج و دوو ڕۆژەی دونیایان پێ بگوزەرێنی، وە تاقیکردنەوە (إبتلاء)ی خوای کاربەجێیان پێ بەسەر بەری! ئنجا چی دیکەی بۆ کردووی؟! ﴿فَعَدَلَكَ﴾ تۆی (تعدیل) کردوە، (تسویة) ئەوەیە کە ئەندامەکانت هەبن، بەڵام (تعدیل) ئەوەیە ئەندامەکانت بە ئەندازەی یەك بن، تۆ ئینسانێك دەبینی کە شەلەو قاچێکی لە قاچەکەی دی کورت ترە، یان دەستێکی لە دەستەکەی تری کورت ترە، وە یان چاوێکی لە چاوەکەی دی بچووکترە! دیارە دیمەنێکی نائاسایی هەیە، بەڵێ ئەوە کاری خوایەو تاقیکردنەوەیەو پاداشتی خواشی لەسەر هەیە ئەگەر ئارام بگرێ، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە ئینسان کاتێك لە کەسێکدا ناتەواوییەك دەبینێ، جا ئەوجا زیاتر سەرنجی ڕادەکێشرێ بۆ ئەو بەخششە خواییە!

ئنجا پاش نیعمەتی دروست بوون(خلق) و ڕیكوپێك بوون (تسوية) و هاوسەنگ بوون (تعديل)، كە ئەمانە سێ نیعمەتی گەورەن لە سێ قۆناغاندا، خوای بەخشەر چی دیكەی بۆ كردووی؟! ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ لە هەر دیمەن و شێوەیەكدا كە خوا خۆی ویستوویەتی تۆی پێكهێناوە، هەیە سپی پێستەو هەیە ڕەش پێستە وە هەیە سوورو سپییەو هەیە گەنم ڕەنگە، هەیە بالآبەرزەو هەیە كورتە بالآیە، بە هەموو جۆرەو شێوەیەك خوای كاربەجێ خەڵكی دروست كردوە، دیارە ئەو شێوەو دیمەنانە هیچی سزاو پادا شتی لە سەر نییە، چونكە هەمووی دروستكردنی خوایە، بەڵام پاداشت و سزا لەسەر ئەو شتەیە كە ئینسان خۆی وەدەستی دێنێ، لە چاكەو خراپە.

بەڵێ خۆشەویستانم! ئاواو بەم شێوەیە كە ئەم سێ نموونەیەمان لەسەر هێنایەوە، یەكی دیكە لە ئیمتیازو تایبەتمەندییەكانی قورئان، ئەوەیە كە ئینسان ڕادەچڵەكێنێ و سەرنجی ڕادەكێشێ و فیطرەتی بەخەبەر دێنێ و لە دڵەوە دەیجووڵێنێ، وەك چۆن عەقڵی دەدوێنی و (خطاب)ی لەگەڵدا دەكات بە هەمان شێوەش لە گەڵ دڵ و دەروون و فیطـرەتیشیدا قسە دەكات!

بە كورتی: قورئان بۆ خوای بەدیهێنەر و پەروەردگار بە خەڵكی ناساندن و ئاشناكردن لە سەرجەم دەرگایەكانی بوون (وجود)ی دەدات و لە تێكڕای ژێیە هەستیارەكانی (الأوتار الحساسة)ی دەدات!

## خاڵی شەشەم:
## قور ئان بەرپەر چی شوبهەكان دەدا تەوەو گوما نەكان لەبەریەك هەڵدەوشێنێ

بەڕێزان !

سەرەتا پێناسەیەكی كورتی هەركام لە (شبهة) و ( ظّن) دە كەین: (شبهة) بەو شتانە دەگوترێ كە خاوەنەكەی بە بەڵگەی دەزانێ، بەڵام لە ڕاستیدا بەڵگە نیەو وەك بەڵگەی دەچێ، واتە: (وەك بەڵگە چوو) یان زڕەبەڵگە، وەك پەندی كوردی دەڵێ: دوومەڵ بە بەز تێگەیشتوە.

گومان (ظّن)یش بریتیە لەو بیروبۆچوونانەی كە خاوەنەكانیان پێیان وایە بیروبۆچوون و بیروباوەڕی ڕاستن، بەڵام لە واقیعدا هەڵەو ناتەواون، وە تەنیا گومانن.

جیاوازی نێوان شوبهە (شبهة)و گومان (ظّن)یش ئەوەیە: كە شوبهە زیاتر لە ڕووی مەعریفییەوەیەو، گومانیش زیاتر لە ڕووی خودی ئەو شتەوەیە كە لێی دەكۆڵرێتەوە، واتە: شوبهە زیاتر لە ڕووی شێوازی تەماشاكردنی شتەكانەوەیە، گومانیش لە ڕووی خودی شتەكانەوەیە(ت).

(1) لە زمانی كوردی‌دا بۆ (شبهة) و (ظن) هەر (گومان) بەكارهێنراوە، بەڵام ڕاست وایە بۆ (شبهة) (زڕەبەڵگە) بەكاربێ یان هەر بگوتری (شوبهە).

جا ئێمە لەژێر ئەم سەرباسی (خاڵی شەشەم)دا بەرپەرچی سێ شوبهان دەدەینەوە کە بێدین و بێبڕوایەکان سەبارەت بە بوونی خوا خستوویاننە ڕوو، وە بەردەوام دەیانخەنە ڕوو، وە سێ گومانیش هەڵدەوەشێنینەوە لەو گومانانەی کە مولحیدو بێدینەکان لە بواری خواناسییدا خستوویاننە ڕوو، لەبەر تیشکی ئایەتەکانی قورئانداو جاروباریش هەندێك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە دێنینەوە.

سەرەتا با سەرنجی سێ شوبهەکان بدەین:

**شوبهەی یەکەم: بێ سەرەتا (أزلی) بوونی بوونەوەرو مادده:**

زۆربەی بێبڕوایەکان، بە تایبەتی ئەوانەی سەدەی بیست و ئەم دوادواییە، کە زیاتر بە ماددییەکان ناسراون، کە ئێمە زۆر جار وتووێژمان لەگەڵیاندا بووە، ئەم شوبهەیان خستۆتە ڕوو دەربارەی بوونی خواو دەڵێن: هیچ پێویست ناکات بڵێین: خوا هەیەو دروستکرانی بوونەوەری پاڵدەینەلا، چونکە ئەم بوونە هەر بووەو هەر دەبێ و نە پەیدابووەو نە لەنێو دەچێ.

هەندێك جاریش بۆ پشتگیریی قسەکەیان پەنا دەبەنە بەر هەندێك قسە کە بە حیساب ئەوانە بیردۆزەی زانیاریین، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە

دەڵــێ(ﷺ): (ماددە نە دروست دەبێ نە لەنێودەچێ)!

جا بزانین کتێبی خوای زاناو توانا چۆن ئەم شوبهەیە لەبەر یەك هەڵدەوەشێنێ و وەڵامی دەداتەوە، لە ئایەتی ژمارە (24)ی (الجاثیة)دا:

لە پێشدا شوبهەکەیان نەقڵ دەکات و دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلاَّ الدَّهْرُ﴾ واتە: وە کافرەکان (مولحیدەکان) گوتیان ژیان تەنیا ئەم ژیانە دونیاییەمانە، دەمرین و دەژین، وە تەنیا ڕۆژگاریش ئێمە لەنێو دەبات! (واتە: هیچ کەس نییە ئێمەی دروست کردبێ و هیچ کەسیش نامانمرێنێ، هەر بۆ خۆمان لە خۆوە پەیدابووین و بۆخۆشمان دەمرین و تەواو!)

خوای پەروەردگارو کاربەجێ لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئاماژەی کردوە بۆ پووچاندنەوەی ئەم شوبهەیە، کە ئێمە دوو شوێن بە نموونە دێنینەوە:

یەکەم: هەر دوابەدوای ئەو ڕستەیەی پێشتر هێنامان لە هەمان ئایەتدا دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُمْ بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ﴾(2) واتە: بەلام هیچ زانیارییان دەربارەی ئەوە نیە کە گوتیان، بەڵکە بەس گومان دەبەن(1).

(1) دیارە ئەم قسەیە ڕاستە ئەگەر مەبەست پێی توانای مرۆڤ بێت. کە بێگومان مرۆڤ نە هیچ شتێکی پێ وەدی دێ، نە پێشی لەبەین دەچێ، بەلام خوا (عزو جل) هەردوولای پێ دەکرێن.

(2) ( الجاثیة  24)

(3) شایانی باسە لە قورئاندا چەمکی (ظن) فراوانەو شوبهەش دەگرێتەوە بۆیە لە جیاتی وشەی (شبهة)ش هەر (ظن) بەکارهاتوە.

بەڕاستی خوای شارەزا وەڵامێکی زۆر دەمکوتکەر و ددان شکێن لە بەرانبەر ئەم شوبهەیەی ئەواندا دادەنێت، چونکە ئەوانەی کە ئەو جۆرە قسانە دەکەن کەسانێکی ماددین و دەڵێن زانیاری بەس ئەوەیە کە ئینسان شتەکەی ئەزموون کردبێ و لە تاقیگەدا بینیبێتی و هەستی پێکردبێ، خوای زاناو زاڵیش دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُمْ بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ﴾ هیچ زانیارییەکیان لەوبارەوە نیە، کەواتە: ئایا تۆ ئەی بێبڕوا کە دەڵێی کەس دروستی نەکردووینو هەر بۆخۆمان پەیدابووین و دەمرینو دەژینو ئەم بوونەوەرە کەس دروستی نەکردوە!! ئایا ئاگات لە ڕابردوو هەیە؟! خۆ تۆ هەربوو (أزلي) نەبووی تا ئاگات لێی هەبێت؟ تۆ بە تەواوی ئاگات لە خۆشت نیە کە چۆن دروست بووی، وە دوایی بەرەو کوێش دەچی؟! کەواتە هەرکەسێك کە دەربارەی ئەزەل قسە بکات، بەبێ زانیاری قسە دەکات، چونکە ئینسان ئاگای لە بوونێکی بێ سەرەتا (أزلي) یان بوونێکی بێکۆتا (أبدي) نیە تا قسەی لێبکات و کە قسەی لێبکات بەبێ زانیاری قسە دەکات و زانیاریش[2] ئەوەیە کە تۆ بینیت، هەستت پێکردبێت، ئاگات لێی بێت، بەڵام تۆ قسە لە شتێك بکەی کە ئاگات لێنەبووە و لەوێ نەبووی مانای وایە (رجماً بالغیب) قسە دەکەی و تفەنگ بە تاریکاییەوە دەنێی!

---

(2) واتە: زانیاری ئەزموونیی کە ماددییەکان غەیری ئەوە بە زانیاری دانانێن و ئێمەش بە قسەی خۆیان دەیانگرین!

دیارە قووڵایی مێژووی ماددەو قووڵایی مێژووی بوونەوەریش بۆ ئێمە تاریکاییەو هەرشتێکی لەبارەوە بڵێین، بێجێ یەو قسەی بێبەڵگەو پووچە، چونکە لەوێ نەبووین و نەشنووسراوەتەوەو تاقیگا (مختبر)یەکیش نیە کە ڕابردووی پێ تاقی بکەینەوەو لە تاقیگاکاندا تەنها دە توانرێ ماددەی کە ئێستا هەیە تاقی بکرێتەوە!

کەواتە: هەر قسەیەك دەربارەی ئەو ڕابردووە لەمێژینەیە بکرێ کە هیچی لێ نازانین، پێچەوانەی زانیارییەو تەنیا تفەنگ بە تاریکاییەوە نان و شوێنکەوتنی گومان (ظن)ەوە هیچی دیکە!

دووەم: لە ئایەتێکی دیکەدا  ئا یەتی ($51$)ی (الکهف) هەر بۆ پووچەڵ کردنەوەی هەمان شوبهە قورئان فەرموویەتی: ﴿مَا أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلاَ خَلْقَ أَنفُسِهِمْ﴾ وا تە: من نە لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و نەدروستکرانی خۆشیان، ئاگادارم نەکردوونەوە.

واتە: ئەو کاتەی کە من ئاسمانەکان و زەوی (بوون  وجود)م دروست کردوە، ئەوانم ئاگادار نەکردوەو پێشانم نەداون و لەوێم ئامادە نەکردوون، هەروەها خۆشیان، کە خۆشیانم دروست کردوە بە هەمان شێوە ئاگا یان لێنەبووەو زانیارییەکیان لەوبارەوە نیە!

بەڵێ هەرکام لە ئێمە بێئەوەی پرسمان پێبکرێت دروست کراوین و بەبێ ئەوەی پرسیشمان پێ بکرێت دەمرێنرێین و زیندووش دەکرێینەوە.

جا بەڕاستی ئەم وەڵامەش وەڵامێکی پڕ بە پێ ست و دەم شکێنە، چونکە: ئەزموون گەرایەکان و مادديیەکان دەڵێن: هەر شتێك ئین سان بە پێنج هەستەکان هەستی پێ نەکات و لە تاقی گەدا (مختبر) تاقی نەکاتەوە، بۆی نیە قسەی دەربارە بکات، وەك لە باسەکانی پێشوودا بە درێژی باسمان کردوە، ئەدی ئەوان چۆن بۆیان هەیە قسە لە ئەزەل و ئەبەد بکەن و بڵێین: کەس درو ستی نەکردوون و بوو نەوەریش هەر بەردەوام دەبێ؟ بێگومان قسەی وا لە زانیاری دوورەو لەسەر بنچینەی زڕەبەڵگە (شوبهە) نەبێت، لەسەر هیچ بناغەیەکی دی هەڵنە چنراوەو بنیات نەنراوە.

**شـــوبهەی دووەم:**

**ئەوەیە کە دەڵێ: ئەگەر هەموو شتێك خوا دروستی کردوە؟ ئەدی خوا کێ دروستی کردوە؟ ئەگەر هەموو شتێك خوا بەدیهێنەر یەتی، ئەدی بەدیهێنەری خوا کێیە؟**

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لەوبارەوە چەند فەرموودە یەکی هەن، یەك لەو فەرموودانە: ((عن يزيد الأصم: قالَ سَمِعتُ أبا هريرة رضي الله عنه يقُول: قالَ رسول الله ﷺ: لَيَسْأَلَنّكم النّاسُ عن كلِّ شيء حتى يقولوا اللهُ خَلَقَ كلّ شيء فَمَنْ خَلَقَهُ؟!))[1] واتە: ئەبو

(1) مسلم واحمد وابوعوانة وابن مندة كتاب السنة لأبي عاصم بەرگی (1) لاپەڕە (450).

هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: خەڵك لە هەموو شتێك لێتان دەپرسن، هەتا دەڵێن: باشە خوا هەموو شتێکی دروست کردوە، ئەدی کێ خوای دروست کردوە؟!

دەگێڕنەوە جارێکیان یەکێك هاتە مەجلیسی (ئەبووهورەیرە) خوا لێی رازی بێ و ئەو پرسیارەی لە (ئەبوهوریرە) کرد، ئەویش گوتی: (صدق رسول الله) پێغەمبەر راستی فەرمووە، ئەوەی کە ئەو فەرموویەتی، ئەوە لەم مەجلیسەی مندا هاتەدی.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: ((إِنَّ الشَّيطانَ يأتي أحدكم فيقولُ: مَنْ خَلَقَ كذا وكذا؟! حتى يقول مَنْ خَلَقَ ربَّكَ؟! فإذا بلغ من ذلك فَلْيَستَعِذْ بالله ولْينْتَهِ))[2]، واتە: شەیطان دێت بۆ لای یەکێکتان دەڵێ: کێ فلان شتەی دروست کرد؟ کێ فلان و فیسار شتەی دروست کرد؟ ئاوا بەم شێوەیە، هەتا دوایی دەڵێ: ئەدی کێ پەروەردگاری تۆی دروست کرد؟ ((پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دە فەرموێ)) جا ئەگەر گەیشتە ئەو شوێنە، با بڵێ: پەنا بە خوا دەگرم، وە با چیدیکە وەدوای (ئەو وەسوەسە و خەیاڵە) نەکەوێ.

لە فەرموودەکەی پێشوودا دەربارەی شەیطانێکی ئادەمی قسەی کردو ئەمەشیان دەربارەی شەیطانێکی جندە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەی یەکەمدا هەواڵی پێداوین کە شتی ئاوا دەبێت.

---

(2) البخاري ومسلم والنسائي وأبوداود وأحمد و ابن حبان  كتاب السنة- لأبي عاصم بەرگی (1) لاپەڕە (454) .

لە هی دووەمیشیاندا فێری کردووین چی بکەین!!

بۆیەش فەرمانی پێکردووین کە لەو حاڵەتەدا بڵێین: پەنا بە خوا دەگرم لە شـەیطانی ڕەجم کراو:

(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)، چونکە ئەوە وەسوەسەی شەیطانەو نابێ دوای بکەوین و نابێ خۆمان بەدەست شـەیطانەوە بدەین و وەك تۆپ لەبەر دەستیدا بین و گاڵتەمان پێ بکات بە ئارەزووی خۆی، چونکە ئەگەر خۆمان بە دەستییەوە بدەین دەمانبات بۆ شوێنی زۆر خەتەرو خراپ، خۆشت هەست ناکەی کە بەسەر چ کەندەڵانێکتدا دەخات!

ئێستاش با سەرنج بدەین و بزانین خوای زاناو زاڵ چۆن وەڵامی ئەم شوبهەیە دەداتەوەو پووچەڵی دەکاتەوە:

خوای کاربەجێ ئاوا وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾[1]، واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێك و لەسەر هەموو شتێك تواناداره.

ئێمە دوو جۆرە شتمان هەن، وەك زانایانی (علم الكلام) دەڵێن: (ممكن الوجود)[2] مان هەیە لەگەڵ (واجب الوجود)[3]، دروستکراوانێکمان هەن کە دەگونجا نەبن، واتە: فەرز نەبوو ئەم بوونەوەرە ببێ، ناتوانی بڵێی: فەرز بوو دەبوو هەر ببێ، نەخێر (ممكن

(1) (الزمر 62).

(2) (ممكن الوجود) واتە: هەبوون گونجاو.

(3) (واجب الوجود) واتە: هەبوون پێویستە.

الوجود )ە، دەنگونجێ ببێ و دەشگونجێ نەبێ چا هەر چی دروستکراو (مخلوق)ە هەمووی پێی دەگوترێ (ممكن الوجود).

جۆری دووەمی شتان خوای بەدیهێنەرە کە (واجب الوجود)ە، واتە: هەرگیز ناگونجێ کە نەبێ، بوون (وجود)ی فەرزەو هەر دەبێ هەبێ.

کەواتە (خالق) هەیەو (مخلوق) هەیە، (خالق) واتە: بەدیهێنەری غەیری خۆی، کەواتە غەیری خۆی هەمووی دروستکراو (مخلوق)ە.

مادام وایە ئەم پرسیارە هەر خۆی لە خۆیدا هەڵەیە، (کێ خوای دروست کردوە؟) ئەو (کێ)یە لە کوێدا بۆی دەگەڕێی؟! لە نێو دروستکراوان (مخلوقات)دا کە هەموویان دروست کراون، یان لەلای بەدیهێنەر (خالق) کە تەنیا یەکێکەو ناگونجێ زیاتر بێ؟!

ئەم ئایەتەش لەبارەی پێناسەی خواوە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ واتە: خوا (جلّ جلاله) یەکەمین و دوامین و، ئاشکراو و پەنهانە وە بە هەموو شتێك زانایە.

فەرموودەی پێغەمبەریش هەیە کە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە خوا (عزّو جلّ) پاڕاوەتەوەو فەرموویەتی: (أنتَ الأول فَلَيسَ قَبلَكَ شيء) وە تۆ یەکەمی و لە پێش تۆدا هیچ شتێك نەبووە (وأنتَ الآخر فَلَيسَ بَعدَكَ شيء) وە تۆ کۆتایی و لە دوای تۆ هیچ شتێك نییە، (وأنتَ الظاهر فَلَيسَ فَوقَكَ شيء) وە تۆ لە سەرووی و هیچ شتێك لە سەرووی تۆ نیە، (وأنتَ الباطن فَلَيسَ دونَكَ شيء) وە تۆ نیزیکی و لە تۆ نیزیکتر هیچ شتێك نیە.

وە لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: ((لا يَزالُ الناسُ يَسألون عن كل شيء حتى يقولوا هذا الله كان قبل كلّ شيءٍ فماذا كان قَبْلَ الله؟! فإن قالوا لكم ذلك فقولوا: هو الأول والآخر والظاهر والباطن وهو بكل شيء عليم))[1] واتە: بەردەوام خەڵك لە هەموو شت پرسیار دەكەن، هەتا دەڵێن: باشە ئەوە خوا لە پێش هەموو شتێكەوە بووە، ئەدی لە پێش خوادا چی بووە؟ ئەگەر وایان پێ گوتن، ئێوە بڵێن ((هو الأول والآخر والظاهر والباطن وهو بكل شيء عليم)) ئەو یەكەمین و دوامین و ئاشكراو پەنهانەو ئەو بە هەموو شتێك زانایە.

ئنجا با سەرنج بدەین:

ئەو شوبهەیەی كە دەڵێ: لە پێش خوادا چی هەبووە؟ یان كێ خوای دروست كردوە؟ لە ڕاستیداهەر خۆی لە خۆیدا پرسیارێكی بێجێیە، بۆچی؟ چونكە دەڵێین: ئەوەی كە تۆ بە (كێ) پرسیاری لە بارەوە دەكەی و دەتەوێ دروستكرانی خوای بەدیهێنەری پاڵدەیە لا و بیكەیە بەدیهێنەری خوا، ئایا بەدیهێنەر (خالق)ە یان بەدیهێنراو (مخلوق)ە؟ ئەگەر بڵێی (خالق)ە، دەڵێین، غەیری (خالق) هەمووی (مخلوق)ە، وە ئەگەر بشڵێی (مخلوق)ە، دەڵێین، دیارە (مخلوق) پێویستی بە (خالق)ە، ئنجا ئایا كێ هەر هەموو شتەكانی دروست كردوون؟ دیارە هەر ئەو

(1) أبو الشيخ لە كتێبی (العظمة)دا لە (عبدالله)ی كوڕی (عمر) و لە (أبو سعيد)ی خودرییەوە، هێناویەتی، خوا لێیان ڕازی بێ.

(خالق)ە هەموو شتەکانی دیکە غەیری خۆی هەموو (مخلوق)ن و ئەو دروستی کردوون، کەواتە چۆن دەبێ لە نێو (مخلوق)اندا بۆ (خالق) بگەڕێی؟!!

بە کورتی: خوا یەکەمین و سەرچاوەی (بوون)ە و تێکڕای دروستکراوەکان بەرهەم و زادەی ناو و سیفەتەکانی وین.

ئێستاش با بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینەوە، ئەگەر ژمارەی (1.000) یان (1.000.000) یان هەر ژمارەیەکی دیکە بنووسی، لە سفری کۆتایی بپرسە کە ئایا ئەو قیمەت و نرخە ژمارەییەت لە کوێ هێناوە؟! دەڵێ، لە سفری دوای خۆم بپرسن، لە سفری دوای ئەویش بپرسی، ئەویش دەڵێ: لە سفری دوای خۆم بپرسن، تا دەگاتە سەر ژمارە (1)، بۆ نموونە: هەزار سێ سفری هەیەو ملیۆن (1000.000) شەش سفری هەیە، لە سفرەکان بپرسە هەموویان حەواڵەی دوای خۆیانت دەکەن، بەڵام کە دەگەیە سەر ژمارە (1) یەك، لێی بپرسە کە: ئەو قیمەتە ژمارە (عدد)یی یەت لە کوێ هێناوە؟ دەڵێ چی؟ دەڵێ: هی خۆمە، بە بەڵگەی چی؟! دەڵێ: سفرەکان لا بەرە، من هەر (1) یەکم، سفرەکانیشم لە پێش دابنێ، قیمەت دەدەم بە هەموویان، ئەگەر ئەوان نەش بن، من هەر هەم، بەڵام ئەگەر من نەبم، ئەوان نابن!

لە ڕاستیدا بۆیەش خوای پەروەردگار دە فەرموێ ( هو الأول) خوا یەکەمینەو بێ سەرەتایەو زنجیرەی مەخلووقات دە چێتەوە سەر خوای بەدیهێنەرو ڕادەوەستێ، چونکە ئەو بوونی بە هەموویان داوە، ئنجا ئەگەر بە خەیاڵ بڵێی: ڕەنگە خوای بەدیهێنەر کاتێك بوو بێ کە نەبووبێ، دەڵێین: ئەو خەیاڵە بەتاڵە چونکە: ئەگەر گریمان نەبوون (عدم)، پێش خوای بەدیهێنەر کەوتبایە، دەبووایە ئێستا هیچ شتێك بوونی نەبووایە، چونکە دروستکراوەکانی هیچیان خاوەنی بوونی خودی نین و هەموویان بوون (وجود)یان لە خواوە چنگ کەوتوە. کەواتە بوونی دروستکراوەکان بەڵگەی هەبوونی خوای بەدیهێنەرە، وەك چۆن ئەگەر بێت و ژمارەی یەك (1) لابەری، دونیا پڕ بکەی لە سفر هەمووی بێقیمەتەو هیچی بەهای نیە، نەك هەر سێ سفر و شەش سفر، بەڵکو هەر لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا پڕی بکەی لە سفر، دەکاتە چی؟ سفر هەر سفرە، بەڵام ژمارە (1) یەك هیچی لەگەڵدا نەبێت، هەر بۆ خۆی قیمەتێکی سەربەخۆی هەیە، بەڵام سفرەکان قیمەتێکی خوازراو (مستعار)یان هەیە، دەجا بە هەمان شێوە:

خوای پەروەردگاریش بوون (وجود)ە کەی هی خۆیەتی، بەڵام دروستکراوەکان بوونەکەیان هی خۆیان نیەو خوازراوەو لە بەدیهێنەرەوە پێیان بەخشراوە.

**شـــوبهەی سـێیەم:**

**ئەوەیە کە دەگوترێ: ئایا ناگونجێ کەسێکی دیکە لە دروستکردن و بەڕێوەبردنی بوونەوەردا بەشدار بێ؟!**

واتە: ئایا هەر دەبێ خوا بەدیهێنەرو پەروەردگار بێ؟ ئا یا ناگونجی کەسێکی دیکەش شتێکی دروست کردبێ و ئەویش لایەکی دونیا لەگەڵ خوای بێوێنەدا بەڕێوەبەرێت؟!

خوای بالآدەست ئەم شوبهەیەش دەپوو چێنێتەوە، کە نەخێر ئەوە ئیحتیمالـی نیە، ئەوەش لە چەند ئایەتێکدا، لە یەکێك لەو ئایەتانەدا دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾(1)، واتە: ئە گەر لە ئاسمانەکان و زەویدا جگە لە خوا پەرستراوی دی هەبوونایە تێك دەچوون.

بۆچی تێك دەچوون؟

ئەوە لەم ئایەتەدا زۆر جوانی ڕوون کردۆتەوە کە چۆن و بۆ چی تێك دەچوون، کە دەفەرموێ: ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلاَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾(2)، واتە: خوا هیچ ڕۆڵەی نیە، وە هیچ پەر ستراوی دیکە شی لەگەڵ نین، ئەگەر لەگەڵی هەبوونایە، هەر پەرستراوێك ئەو شتانەی کە دروستی کردوون بۆ خۆی سەرپەرشتی دەکردن، وە لە نێوانی خۆیا ندا

(1) ( الأنبياء  22 ) .
(2) ( المؤمنون  22 )

تێکدەچوون چونکە هەر کامێکیان دەیویست ئەوانی دیکە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، پاکیی بۆ خوا لەو جۆرە بۆچوونانەی کە پێی وەسف دەکەن!

هەڵبەتە ئەوە فەرزی مەحاڵەو خوای زاناو توانا لێرەدا قسە لەگەڵ عەقڵی ئینساندا دەکات، واتە ئەوە مەحاڵە کە خوا شەریك و هاوبەشی هەبێت، بەڵام گریمان ئەگەر هەیبووایە لە ئەنجامدا بوونەوەر تێکدەچوو، کەواتە: ئێستا کە بوونەوەر تێك نەچووەو بە یەك شێوە ئیدارە دەکرێ و بەرێوە دەبردرێت و هەموو شتێك مۆری تاك و تەنیایەتی خوای پێوەیە کەواتە: بوونەوەر یەك بەدیهێنەرو یەك پەروەردگار و مەشوورخۆری هەیەو پێویستە هەر ئەویش بپەرسترێ و بەندایەتی بۆ بکرێ.

ئەوە پووچاندنەوەی ئەو سێ شوبهەیەی بێبڕوایان.

ئەنجار بێینە سەر سێ لە (گومان)ەکانیش:

### گومانی یەکەم:

### گومانی لەخۆوە دروستبوونی ئینسان، یاخود خۆ دروستکردنی

یەکێك لە بیروبۆچوونە لەسەر گومان بنیاتنراوەکانی بێبڕوایان ئەوەیە کە:

ئینسان هەر لەخۆوە دروست بووبێ، یان بۆخۆی خۆی دروست کردبێ! بۆ بوونەوەریش هەروا: کە بوونەوەر لە خۆوە دروست بووبێ و کەس دروستی نەکردبێ، یان بۆ خۆی خۆی دروست کردبێ!

خوای بەرزو بێوێنە لە سورەتی (الطور)دا، لە زنجیرەی بەرپەرچدانەوەو پووچاندنەوەی کۆمەڵێك لە گومان و تۆمەتی نارەوای کافرو هاوبەش پەیداکەرەکان، دەفەرموێ: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ۞ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بَل لاَّ يُوقِنُونَ﴾[1]، واتە: ئایا ئەوانەبەبێ بەدیهێنەر دروست بوون، یان بۆخۆیان خۆیان دروست کردوە؟، یاخود ئایا ئاسمانەکان و زەویان دروست کردوە، بەڵکو زانیارییان نیە (بۆیە ئەم جۆرە گومانانە دەبەن و قسەی ئاوا دەکەن)

بۆ دروست بوونی مرۆڤ سێ ئیحتیمالی زەینی هەیە، کە یان دەبێ بۆخۆی خۆی دروست کردبێ، یان دەبێ کەس دروستی نەکردبێ، یان دەبێ خوا دروستی کردبێ.

جا ئایا دەگونجێ کەس ئینسانی دروست نەکردبێ؟! تەماشا دەکەین هەر دروستکراوێك، هەر شتێك خاوەنی خۆی هەیە، با شە دەگونجێ ئینسان هەر لەخۆیەوە دروست بووبێ و کەس دروستی نەکردبێت؟! دیارەی ئەمە پێچەوانەی یاسای عەقڵی: ( هەموو پەیداکراوێك پەیداکەرێکی هەیە) کە وەك پێشتر باسمان کرد یەکێکە لە بەڵگەنەویستە عەقڵییەکان.

کەواتە: ئەم ئیحتیماله پووچەو ناگونجێ کە ئینسان هیچ شتێك دروستی نەکردبێ.

---

(1) ( الطور 35-36 ) .

ئنجا ئیحتیمالی دووەمیان: ئایا ناگونجێ ئینسان بۆخۆی خۆی دروست کردبێ؟ ئەمەشیان ناگونجێ، بۆچی؟! چونکە ئینسان ئەگەر نەبوویێت، چۆن خۆی دروست دەکات؟ وەختێك ئینسان شتێکی نەبێت چۆن دەتوانێ ئەو شتە ببەخشێت؟! وەختێك کە مرۆڤ بوون (وجود)ی نەبووە، چۆن دەتوانێ (بوون) بە خۆی ببەخشێت؟! ئەوەش بێگومان ئیحتیمالێکی پووچە.

کەوابوو ئیحتیمالی ڕاست هەر ئەوەیە کە ئینسان کەسێك دروستی کردبێت کە ئەویش خوای پەروەردگارە.

## گومانی دووەم

## گومانی بێحیکمەت و پووچ بوونی بوون و ژیانی ئینسان

ئەو گومانەش کە ئەم بوون (وجود)ە پووچەو بێحیکمەتەو هەر لەخۆوە دروست بووە، یەکێکی دیکەیە لە بیروبۆچوونە پووچ و گومانیانەی بێدینەکان.

وەك خوای زاڵ و زانا ئەم گومانە لە ئایەتەکانی ژمارە (27 و 28)ی سورەتی (ص)دا هەم باس دەکات هەم دەشیپووچێنێتەوە.

وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ النَّارِ﴾ واتە: وە ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، بە پووچ و بێحیکمەت و بە هەوەنتە

دروستمان نەکردوون، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، سزای سەخت بۆ ئەوانەی کە بێبڕوان لە ئاگری دۆزەخ.

جا بەڕێزان! جێگەی سەرنجە کە خوای پەروەردگار هەر بەوەندە ئیکتیفای کردوە کە ئەو بۆچوونە بە گومان لە قەڵەم دەدات، بە گومانی کافرەکان، گومانیش وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾[1] گومان هیچ نیشانە ناپێکی و هیچ ئینسان ناگەیەنێتە حەق.

بەڵێ گومان هیچ نیە، کە بڵێی ڕەنگە ئەو شتە وانەبێت، یان ڕەنگە ئاوا بێت، نەخێر ژیانی ئینسان نابێ لەسەر ڕێی هاتو نەهات بڕوات، یان دێت یان دەڕوات! نەخێر بەڵکو دەبێ لەسەر شتێکی ڕوون و ڕۆشن و مسۆگەر بێت.

﴿ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوە تەنیا گومانێکی کافرانە، ئەم بوونەوەرە بە پووچ و بێحیکمەت دروست بووبێ بەس گومانە، چۆنت زانی وایە؟! کوا چ شتێك لە بوونەوەردا پووچە، چ ئەندامێك لە جەستەی تۆدا بێحیکمەت خوڵقاوە، تەنانەت برژانگی چاو، تەنانەت نینۆك، تەنانەت جومگە، وە هیچ ئەندامێکی دیکە نییە، کە بەبێ حیکمەت دروست بووبێت.

وە زیندەوەرەکانیش هەر بە هەمان شێوە، خۆیان و هیچ ئەندامێکی بچووکیشیان بێحیکمەت نیە، بوونەوەر تاك تاکی دروستکراوەکانی بە

(1) ( النجم - 28 ).

حیکمەت دروست بوون، وە سەرجەمیشیان هەر بە حیکمەت دروست بوون، کەواتە ئەوە تەنیا گومانەو هیچی دی.

ئنجا دوایی خوای پەروەردگار وەلامێکی دیکەیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾؟! ئەگەر بوونەوەر بێحیکمەت دروست بووبێ، ئایا ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باش دەکەن، دەگونجێ وەك خراپەکاران لە زەویدا مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین؟! وە ئایا دەگونجێ پارێزکاران وەك تاوانباران دابنێین؟! دەکرێ وەك یەك وابن، خوای حەکیم و کاربەجێ چۆن چاکەکاران و خراپەکاران وەکو یەك سەیر دەکات و حیساب دەکات؟!

ئەگەر قیامەت و لێپرسینەوە نەبێت، مانای وایە کە وەکو یەك تەماشا کراون، ئەوەش لە خوا ناوەشێتەوە، کەواتە بوونەوەر بە حیکمەت خولقاوە، وە لە دوای ئەم ژیانە دونیاییەوە، قۆناغی دی هەیە، بۆ ئەوەی حیکمەتی ئەم ژیانە دونیاییە، وە ئەم بوونەوەرە زیاتر بێتە دی.

هەروەها خوای بێهاوتا هەر بۆ پووچاندنەوەی ئەم گومانە لە ئایەتەکانی (16، 17، 18)ی سورەتی (الأنبیاء)دا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاَعِبِينَ ﴾ واتە: وە ئێمە ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە گاڵتە دروست نەکردوە! ﴿ لَوْ أَرَدْنَا أَنْ نَتَّخِذَ لَهْوًا لاَتَّخَذْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا ﴾ واتە: ئەگەر ویستبامان شتێك دروست بکەین بۆ سەرگەرمی و بۆ یاری، هەر لەلای خۆمان دروستمان دەکرد، بەڵام

شتی وا لە خوا ناوەشێتەوە﴿إِنْ كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ ئێمە شتی وا نا کەین[1]، یاخود ئەگەر شتی وامان کردبایە هەر لای خۆمان دەمانکردو خەڵکمان ئەزیەت نەدەداو تووشی دەردەسەریمان نەدەکردن!، ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ بەڵکو ئێمە حەق بە نا حەق (با طل)دا دەدەین و دەماغی دەپێکی و لە بەینی دە بات. ﴿وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ﴾ سزای سەخت بۆ ئێوە لە سەرئەوەی کە ئێوە ئاوا وە سفی بوونەوەر دەکەن و وەسفی خوای بالآدەست دەکەن، کە بە گاڵتەو خۆڕایی بوونەوەری دروست کردوە!

وە هەر لەوبارەیەوە لە شوێنێکی د یدا دە فەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاَعِبِينَ ❁ مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ ❁ إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾[2] واتە: وە ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە گاڵتە دروست نەکردوە، بەڵکو تەنیا بە حەق، وە لەسەر بنچینەی حەق، وە بۆ هێنانە دی حەق، دروستمان کردوە، (لەسەر بنچینەی حەق، کە بریتییە لە بەندایەتی کردن بۆ خوا، بۆ هێنانەدی حەق کە بریتییە لە چەسپاندنی شەریعەتی خوا، وە بریتییە لەوەی کە چاکەکاران بە چاکەی خۆیان بچنە بەهەشت، کە ئەوە حەقە، وە خراپەکارانیش بە خراپەی خۆیان بچنە دۆزەخ، کە ئەوەش حەقە بەڵێ بوونەوەر بە حەق خولقاوە، وە سەرەنجامەکەی شی

(1) چونکە دەگونجێ (إنْ) (نافية) بێت لەسەر مانای یەکەم. وە دەشگونجێ (شرطية) بێت لەسەر مانای دووەم.
(2) ( الدخان 38- 40 ) .

حەقە) ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆر بەیان نازانن و زانیارییان نیە، بۆیە گومانی ئاوا دەبەن، زانیاریان لەبارەی خۆیانەوەو لەبارەی بوونەوەرەوەو لە بارەی شەریعەت و دینی خواوە نیە، بۆیە ئەو جۆرە قسانە دەکەین!

ئنجا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: بێگومان رۆژی لێك هەڵاواردن بەڵێنگەیە کە بۆ هەموویان دانراوەو لەوێ هەموویان ئامادە دەکرێن و لێك هەڵداوێردرێن و چاکەکاران و خراپەکاران لێك جیادەکرێنەوە، کەواتە: بوونەوەرو ژیانێك ئەو سەرەنجامە گەورەو گرنگەی لە پشتەوەبێ و بەدوادابێ ناکرێ و ناگونجێ بێحیکمەت و بەناهەق رەخسێنرابن!

## (گومانی سێیەم) و کۆتایی

## گومانی وێچوونی خوا بە دروستکراوەکانی

ئەم گومانەش کە خوا (عزّو جل) وەك هەندێك لە دروستکراوەکانی بچێت، یان هەندێك لە دروستکراوەکان وەك خوا بن، لە هەموو شتێکدا، یان لە هەندێك لە سیفەتەکاندا، یەکێ دیکەیە لە بیروبۆچوونە لەسەر گومان و وەهم بنیاتنراوەکانی ئەهلی کوفر بە گشتی، لە تەفسیری (قرطبـي)[1] دەڵێ: ئەهلی تەفسیر هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە سوورەتی (الإخلاص) بۆ وەڵامی هاوبەش

(1) تەفسیری ( قرطبي) بەرگی (10) لاپەرە -5598) .

پەیداکەرەکان هاتە خوارێ کە هاتنە لای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)و پێیان گوت: (صِفْ لَنا ربّكَ أمِنْ ذَهَبٍ أم مِنْ نُحاسٍ أم مِنْ صُفْر؟ فقال الله -عزّو جل- رداً عليهم: ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۞ اللَّهُ الصَّمَدُ ۞ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۞ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴾.

دیارە هاوبەش پەیداکەرەکان کەسانی ماددی بوون، وە ئەهلی کوفر بە گشتی ماددین و مەحکوومی پێنج هەستەکانیان، واتە: مەحکوومی عەقڵیان نین، چ جای مەحکوومی دڵ و دەروون و فیطـرەتیان بن و چ جای مەحکوومی وەحی و شەرعی خوا بن!، بۆیە هەمیشە لە بەرانبەر خوادا سەریان لـێ تێك چووە، ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) وەك ئەهلی کوفری هەموو دنیا تەنیا سەروکاریان لەگەڵ ماددەدا بووە، بۆیە هاتوونە لای و پێیان گوتوە: پەروەرد گاری خۆتمان بۆ وەسف بکە! ئایا لە (زێڕ) دروست بووە، یان لە (مس)، یان لە (زەرد)؟!

خوای پەروەردگاریش بەرپەرچی داونەتەوەو فەرموویەتی ﴿قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَدٌ﴾ ئەی موحەممەد بڵێ: ئەو خوایەکی تاکە، ﴿اللّهُ الصَّمَدُ﴾ خوایەکە هەموو شتێك پێویستی بەوەو ئەو پێویستی بە هیچ کەس نیە، ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ کەسی لـێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ وە هیچ شتێك هاوتای وی نیە، واتە: خوا بێوێنە و بێهاوتایەو نە بە دروستکراوەکانی دەچێت و نە دروستکراوەکانیشی بەو دەچن.

هەروەها (ئوبەی)ی كوڕی كەعب خوا لـێی رازی بێ هـــــەمان فەرمووده دەگێڕێتەوە، بەڵام بە شێوەیەكی دی و دەڵێ: هاوبەش پەیداكەران (المشركون) هاتنە لای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، (قالوا: للنبّي ﷺ: إنْسـب لَنا ربّك؟ فأنزل اللهُ  عزّو جل- ... ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ الخ)[1] واتە: پێیان گوت: پەروەردگاری خۆمان بۆ وەسف و پێناسە بكە؟ خوای پەروەردگاریش سوورەتی (الإخلاص)ی نارده خواری.

ئنجا با سەرنج بدەین: خوای بێهاوتا دەفەرموێ: ﴿فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَمِنْ الأَنْعَامِ أَزْوَاجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾[2]، واتە:(خوا) بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوییە لە جینسی خۆتان هاوسەری بۆتان دروست كردوە، هەروەها لە ئاژەڵانیش جووتی دروست كردوون (نێرومێی بۆتان دروست كردوە)و ئێوەش و ئاژەڵەكانیشتان بەو هۆیەوە زاووزێتان پێدەكـــات و زۆرتان دەكات، بەڵام خوا (جلّ جلاله) هیچ شتێك وێنەو هاوتای نیە، وە ئەو بیسەرو بینایە.

چونكە هاوبەش پەیداكەران دەیانگوت: (فریشتەكان) كچی خوان (جند)یش كوڕی خوان، جا خوای پاك و تاك دەفەرموێ: ئێوە كە نێرو مێتان هەیە و ئاژەڵ كە نێرو مێی هەیە، حیكمەتەكـــەی ئەوەیە كە

(1) الترمذي وأحمد و(الطبري) لە تەفسیری خۆیدا، حاكم بە (صحیح)ی دا ناوە، و(الذهبي) پاڵپشتی كردوە، بڕوانە (كتاب السنة) (لأبي عاصم) بەرگی -1 لاپەڕە (460).

(2) (الشورى 11).

زاووزێ بکەن و وەچەتان لـێ پاش بکەوێ، بەڵام خوا (جلّ جلاله) وێنەو هاوتای نیە بە هیچ شێوەیەك، تا هاوسەری هەبێ، وە پێویستیشی بە وەچە(ذرّیة) نیە چونکە هەر هەیەو هیچ کەس لەوە ناوەشێتەوە کە کوڕی خوا بێ، یان کچی خوا بێ.

کەواتە: ئەو بەهەڵەداچوونەتان ئەی کافرەکان- هەموو لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە قیاسی خوا (سبحانەو تعالی) لەسەر خۆتان دەکەن و وەك خۆتانی دادەنێن و تەماشای دەکەن و ئەوەش شتێکی بێجێیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ هیچ شتێك وەك وێنەی خوا نیە، بۆچی؟! چونکە هەر شتێك بێتە نێو خەیاڵ ومێشکی تۆوە دروستکراو (مخلوق)ەو خوای پەروەردگاریش دروستکەر (خالق)ە! کەواتە هەر شتێك بە مێشك و خەیاڵی تۆدا دێت، خوای بێوێنە وانیە!

وەك زانایەك دەڵێ: (وكلّ ما جرى بِبالَك، فاللهُ بِخِلافِ ذلِكَ) واتە: هەرشتێك بە مێشکی تۆدا دێ، خوا پێچەوانەی ئەوەیەو بەو شێوەیە نیە!

ئەمجار با هەر بە کورتی تەفسیرێکی (آية الكرسي)[1] بکەین، کە (10) ڕستەیەو هەر ڕِســـتەیەك حەقیقەتێکی گرنگی تێدایە دەربارەی ناساندنی خوای پەروەردگار، هەر بۆیەش وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە ئەم ئایەتە گەورەترین ئایەتە لە قورئاندا:

1- ﴿اللّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ﴾ خوا جگە لەو پەرستراوی دی نین،

---

(1) ( البقرة 255 ).

2- ﴿الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ زیندوویەو سەرپەرشتی کارە، (زیندوو و خاوەنی ژیانە، وە بە زاتی خۆی ڕاوەستاوە، واتە پێویستی بە کەس نیە کە بیژیەنێ و پێویستی بە کەس نیە ڕاگیری بکات، بە پێچەوانەی دروستکراوەکان کە خوا ژیانیان پێدەدات و ڕایان دەگرێت)

3- ﴿لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ﴾ خوا نە وەنەوز دەیگرێ و نە خەوی لێدەکەوێت، ﴿سِنَةٌ﴾ ویژینگ و نەوزی پێش خەوتنە، واتە: خوا نەك هەر خەوی لێناکەوێ بەڵکو بچووکتر لەوەش (وەنەوز)یشی نایەتێ و یەك چرکە لە دروستکراوەکانی بێئاگا نابێ وەك فەرموویەتی ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنْ الْخَلْقِ غَافِلِينَ﴾ (المؤمنون -17).

4- ﴿ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەموو هی ئەوە.

5- ﴿ مَنْ ذا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَ بِإِذْنِهِ ﴾ کێ هەیە لە لای خوا تکا بکات مەگەر بە مۆڵەت(إجازة)ی وی (نەکەس خاوەنی هیچ شتێکە، وە نە کەسیش هیچی بەدەستەو قسەی دەڕوا بەبێ مۆڵەتی خوا).

6- ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾ خوا دەزانێت ئەوەی کە لە پێشیانەوەیەو ئەوەی کە لە دوایانەوەیە (ئینسان نە ڕابردوو دەزانێ، وە نە داهاتووش، مەگەر تۆزێك لە ئێستا، بەڵام خوای زانا هەمووی دەزانێ).

7- ﴿وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاءَ﴾ وە (مرۆڤەكان) هیچ لە زانیـــاری خوا نازانن، لە زاندراوەكانی خوا نازان و ناناسن، مەگەر ئەوەی خوا خۆی بیەوێت.

8- ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ كورسی خوا ئاسمانەكان و زەوی گرتۆتەوە، (كرســـــي) هەم بە مانای زانیاری[1] و هەم بە مانای (جسم)ێك هاتوە.لە فەرموودەی پێغەمبەردا (عليه الصلاة والسلام) هاتوە كە حەوت ئاسمانەكان و زەوی لەچاو كورسی خوا، وەكو ئاڵقەیەك وانە لە بیابانێكدا كەوتبێ و كورسی حەوت و ئاسـمانەكان و زەویش لەچاو (عرش)ی خوا، وەكو ئاڵقەیەك وان لە بیابانێك كەوتبێ.

9- ﴿ وَلاَ يَؤُدُهُ حِفْظُهُمَا ﴾ پاراستنی ئاسمانەكان و زەوی و ئەم هەموو موڵكە فراوانە ماندووی ناكات .

10- ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ خوا هەتا بڵــێی بەرزەو مەزنە.

لێرەدا هاتینە كۆتایی ئەو دەرسانەی كە بۆ توێژینەوەی (خوا بە یەكگرتـــــن لە بواری بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتیدا) تەرخان كرابوون.

---

(1) (عبدالله بن عباس) وای تەفسیر كردوەو هەر ئەم مانایەش بۆ كورسی ڕاست و جێی پشت پێبەستنە، چونكە ئەوەی بە ناوی فەرموودەوە لەوبارەوە هاتوە سەنەدێكی ئەوتۆی نیە.

بەڕێزان !

ئەم بەندی پێنجەمە لە چوار کورتە باسان پێکهاتوە کە ئەمە ناونیشانەکانیانە:

1- بڕوا بەخواو، بڕوابوون بە یاساداریی بوونەوەر، تێك ناگیرێن.
2- مرۆڤ بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریتی خوا (عزّو جل).
3- پووچاندنەوەی دوایین هەوڵی بێبڕوایان.
4- زانیاری لە خزمەت بیری خواناسییدایە.

شایانی باسیشە کە لە نێوان ئەم چوار کورتە باسەو باس و بابەتەکانی چوار بەندەکانی پێشوودا وێکچوون و هەندێك جار وەك یەك بوونیش هەیە، بەڵام هەرچۆن بێ شتی تازەو نادووبارەشیان هەر تێدایە، بۆیە بە پێویستم زانی بیانکەمە کۆتایی باسی (خوا بە یەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریتیدا).

## 1 ) بڕوا بەخواو، بڕوابوون بە یاساداریی بوونەوەر، تێك ناگیرێن.

بەڕێزان !

خوا هەرچی دروستی کردوە، هەمووی لەسەر بنچینەی زانیارییەکی قووڵ و بێسنوور دروست کردوەو لە هیچ کام لە دروستکراوانی خوادا هێندەی نووکی دەرزییەکیش نارێکی و بێیاسایی نابینرێ!

وەك خوا زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَانِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ ۞ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ (الملك 3-4) واتە: لە دروستکراوی خوادا نارێکی نابینی چاو بگێڕە بزانە هیچ کەلێن و کونان دەبینی! دووبارە جار لەدوای جار چاو بگێڕە، بەلاّم لە ئەنجامدا چاوت بە دەرکراوی و ماندووەتی دەگەڕێتەوە لات.

جا بێگومان ئەگەر هیچ ئەنجامگیری (إستنتاج)ێکی ژیرانە لەو قسەیەی کە ڕابرد دەسگیر بێ ئەوەیە کە بڕوابوون بەوەی کە بوونەوەر لەسەر بنچینەی زانیاری ڕۆنراوەو بە گوێرەی چەند یاسایەکی ڕێك و پێك بەڕێوە دەچێ، نەك هەر مرۆڤ بێئیحتیاج ناکات لەوەی بڕوا بە

خوایەکی بەدیهێنەرو پەروەردگار بێنێ، بگرە ئەو جۆرە قەناعەتو بڕوایە وای لـێدەکات، کە بە ناچـــاری بڕوا بە خوایەکی زاناو تواناو کاربەجێو میهرەبان بێنێ!

کەواتە ئەو قسە بێسەرو پێیەی کە ماددەپەرست و خوانەناسەکان وەك تووتی دووجارو سـێجار دووبارەی دەکەنەوەو بەسەر زاریانەوە بۆتە بنێشتە خۆشکە، قسەیەکی بێپشتو پەناو بێ بنچینەیەو پارەی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی!

بەڵی قسەیەکی زۆر باوو دوپاتکراوەی بێبڕوایان ئەوەیە کە کاتی خۆی بۆیە مرۆڤـ بڕوای بە خوا هێناوە، چونکە نەزان بووەو شارەزای یاساو دەســـتوورو نهێنییـــەکانی ســـروشـــــت و بوونەوەر نەبووەو ناچار بووە بۆ تەفســـــیرکردنی چۆنیەتی پەیدابوونی بوونەوەرو ڕوودانی دیاردە سروشتیەکان پەنا بەرێتە بەر هێزێکی نادیار بە ناوی (خودا)!!

بەڵام دوای ئەوەی زانیاری بەرەو پێش‌چوو و مرۆڤـ توانی پەردە لەسەر رازو نهێنییەکانی بوونەوەر لابەرێ، بۆی ساغ بۆوە کە بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی دروســـــت بوون و بەڕێوەچوونی بوونەوەر حەوجێی بەخوا نیە! چونکە هەموو شـــــتێك کە پەیدا دەبێ و ڕوودەدات حەتمەن هۆیەکی دیاریکراوی هەیەو، مرۆڤـ دەتوانێ لە ڕێی تێفکرین و ســــــەرنجدان و لێکۆڵینەوەوە پەی بەو هۆیانە بەرێ و بیاندۆزێتەوە.

جا ئێمە بۆ خستنەڕووی پووچەڵی و بێکاکڵی ئەم وڕێنەیە کە زۆر کەسی بەناو خوێندەوارو ڕۆشـــنبیری پێ لە خشتە چووەو سەرەنگرێ بووە، چەند خاڵێك دەخەینەڕوو:

1- بڕوابوون بە هۆیەکان (الأسباب) ئاقڵمەندانی دنیا تێیدا بەشدارن و شتێك نیە بەس لەسەر بێبڕوایان تاپۆ کرابێو، کاڵایەك نیە بەس بە باڵای وان بڕابێ!

ئەوەتا خوای زانا کە بەسەرهاتی (ذو القَرْنَين)مان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴾ (الكهف- 84)، واتە: ئێمە دەستەڵاتدارمان کردبوو لە زەویدا وە بۆ هەمو شتێك هۆیەکمان دابۆیە.

وەك دەبینین خوای قسە لەجێ، دامەزران و فەرمانڕەوایەتی کردن لە زەویدا لەگەڵ دەست گەیاندنە هۆ (سبب)یەکان لێك دەبەستێ، واتە مرۆڤ لە ڕێی زاڵبوونی بەسەر هۆیەکانی سروشتدا، دەست بەسەر زەویدا دەگرێو تێیدا سەقامگیر دەبێ.

2- بڕوادار و خواناسان نەك هەر نکوولێیان لەوە نیە کە بوونەوەر ڕێکوپێك و یاسادار (منظم)ە، بەڵکو یاساداریی و ڕێکوپێکی بوونەوەر بە پتەوترین بەڵگەی سەلماندنی بوونی خوادا لە قەڵەم دەدەن!

بەڵێ لە راستیدا بابای بڕوادار لە هەموو کەس پتر پێداگیری لەسەر یاسادارییو پڕ وردەکاری سروشت و بوونەوەر دەکات، چونکە ئەو بابای بڕوادار- بوونەوەر بە پەرێزو شوێنەواری خودایەکی ئەوتۆ لە قەڵەم دەدات کە خاوەنی ئەوپەڕی زانیاری و تواناو کاربەجێییە، ئەوە هەمووی لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە قورئانی مەزن لە چەندان ئایەتدا خستوویەتە ڕوو کە لە بوونەوەردا هیچ جۆرە نارێکیو

بێیاساییەك بەدی ناكرێو، هەرچی كە لە بوونەوەریش دایە گچكە بێ یان گەورە ئەندازەگیری كراوەو بە ئەندازەو شێوەو چۆنیەتییەكی تایبەتی دروست كراوە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾(القمر 49)، واتە: ئێمە هەموو شتێكمان بە ئەندازە خوڵقاندوە.

دیسان فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ﴾ (الحجر 21) واتە: وە هیچ شتێك نیە كە عەمبارەكانی لای ئێمە نەبن، وە بە ئەندازەی دیاریكراو نەبێ نایَنێرینە خوارێ.

وە فەرموویەتی ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ (الفرقان 2) واتە: وە هەموو شتێكی دروست كردوە، جا ئەندازەی گرتوە بە ئەندازەگیری.

جا ئێستا پاش ڕوونكردنەوەی خاڵی یەكەم و دووەم، كە وەك دوو پێشەكی (مُقَدِمة) وابوون، دەتوانین بچینە سەر خاڵی سێیەم كە ئەنجامی سروشتی دوو خاڵی پێشەوەیەو بە ڕاشكاویی بڵێین:

3- تێكگیرانی بڕوا بە خوا بوون و بڕوا بوون بە یاساداری بوونەوەر ئەفسانەیە.

بەڵێ ئەو قسەیەی كە دەڵێت بڕوابوون بەوە كە خوا بەدیهێنەرو مشوورخۆری بوونەوەرە، لەگەڵ بڕوابوون بەوە كە بوونەوەر هەمووی لەسەر بنچینەی زانیاری دروست كراوەو بە پێی چەند یاسایەكی وردی ژیرانە بەڕێوە دەچێ، پێكەوە دژن و تێكدەگیرێن! قسەیەكی ئەفسانەیەو لە دنیای بەڵگاندا ڕووت و ڕەجاڵ و بێ پشتیوانە، چونكە:

یەك: ئایا بەڕێوەچوونی شتێك بە پێی چەند یاسایەك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەس دروستی نەكردوە؟!

دوو: یاخود ئایا پەی بردن بە چۆنیەتی كاركردن و بەڕێوەچوونی شتێك بەسە بۆ تەفسیركردنی چۆنیەتی پەیدابوونیشی؟!

سێ: یان ئایا وەڵامدانەوەی پرسیاری: ئەمە چیە (ماذا هُوَ) دەشبێتە وەڵام بۆ پرسیاری: ئەوە چۆن پەیدا بووە؟ (كَیفَ وُجِدَ هـذا؟!)، بێگومان نەء نەء نەء چونكە:

أ- بەڕێوەچوونی شتێك بە پێی چەند یاسایەك لەلای هەموو ژیرو تێگەیشتوویەك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەدیهێنەرو ڕێكخەرێكی هەیە، ئاخر ڕێكوپێكی بەڵگەیە لەسەر ڕێكخەرێك (النِّظامُ یَدُلُّ علی الـمُنَظِّم) كەسێكیش شێت نەبووبێ، نالێ چونكە تەلەفزیۆن و كاتژمێرو بەفرخەرەوە (ثلاجة)وردەكاریی و یاسایان پێوەدیارە، كەس دروستی نەكردوون!!

ب- وە پەی بردن بە چۆنیەتی كاركردن و بەڕێوەچوونی شتێك بەس نیە بۆ تەفسیركردنی چۆنیەتی پەیدابوونیشی، چونكە هەموو پەیدابوویێك پەیداكەرێكی هەیەو، بۆ دۆزینەوەی پەیداكەری هەر شتێكیش دەبێ لە دەرەوەی جوغزی ئەو شتەدا بگەڕێین.

ج- وە وەڵامدانەوەی پرسیاری: (ئەمە چیە؟) ناگونجێ ببێتە وەڵامی پرسیاری: (ئەمە چۆن پەیدا بووە؟) چونكە بە پەی بردن بە

حەقیقەتی شت و ناسینی زاتی، مەرج نیە پەی بە پەیداکەرو سەرچاوەی بوونیشی ببردریّ.

**کورتەی مەبەست:**

ئەوە کە ئێمە دەزانین بوونەوەر چیەو چۆن کاردەکاو بەڕێوەدەچێ، بێئیحتیاجمان ناکات لە بڕواهێنان بە خودای بەدیهێنەر، چونکە ئەو زانین و زانیارییە بەس واقیعی ئێستای بوونەوەری پێشان داوین، بەلاّم بۆی نەخستووینە ڕوو ئەو واقیعە چۆن پەیدابووەو ئەو ڕێکوپێکی و وردەکارییە کێ هێناویەتەدی!

ئنجا هیچ بڕوادارێکیش نەیگوتوە بڕوابەخوابوون وام لێدەکات بڕوا بە ڕێکوپێکی و یاسادارییی بوونەوەر نەکەم، چونکە بڕوادار لە پێش خەڵکی دیکەدا بڕوای وایە خوا (جلّ جلاله) هەموو شتێکی بە پێی زانیارییەکی قووڵ و بێسنوورو چەند یاساو دەستوورێکی یەکجار پڕ وردەکاری خوڵقاندوەو بەڕێوەی دەبات.

واتە: بابای خواناس کە دەڵێ: خوا باران دەبارێنێو درەخت و شیناورد دەڕوێنێ و... هتد. مەبەستی ئەوە نیە، کە خوا بەبێ هۆو بەبێ نەخشەو بەرنامە ئەو کارانە ئەنجام دەدا، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئەو یاساو دەستوورو نەخشەیەی کە ئەو دیاردانەی پێهاتوونەتە دیو بەڕێوە دەچن،

لە لایەن خواوە دانراوە، کەواتە سەرەنجام هەر شتێکیش زادەی وان بێ زادەو بەرهەم و دروستکراوی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارە[1].

مادام وابێ: نە بڕوا بەخوابوون بێ ئیحتیاجمان دەکات لە بڕواهێنان بە یاساو دەستورەکانی بوونەوەر، وە نەناسین و دۆزینەوەی رازو نهێنی و یاساکانی بوونەوەرو پەی بردن بە چۆنیەتی کارکردن و بەڕێوە چوونی بێئیحتیاجمان دەکات لە بڕوا بەخوا هێنان.

بەڵکو بە پێچەوانەوە هەر کام لەو دووانە ئەوی دی کە پەلکێش دەکات، بڕوا بەخوا بوون وا مان لێدەکات بڕوا بە رێ کوپێکی و یاساداری بوونەوەر بێنین، چونکە خوای زاناو تواناو کاربەجێ هەر وای لێ چاوەڕوان دەکرێ کە دروستکراوی خۆی بە پێی چەندان یاسای وردو ژیرانە بە رێکوپێکی بخولقێنێ.

وە ناسین و دۆزینەوەی رازو نهێنی و یاساکانی سروشت و بوو نەوەر و پەی بردن بە چۆنیەتی کارکردن و بەڕێوەچوونی، وامان لێدەکات کە بڕوا بە خوای زاناو تواناو کارزان بێنین، چونکە یا سا بێ یا سادانەرو رێکوپێکی بێ رێکخەرو کارکردن و بەڕێوەچوون بێ کارگێڕو بەڕێوەبەر، هاتنەدی یان مەحاڵە.

---

(1) بێگومان ئەگەر گریمان مسوڵمانێکیش هەبێ بڕوای بە زانیاری و یاساکانی سروشت نەبێ، ئەوە تاوانە کە بەس هی نەفامیی خۆیەتی و ئیسلام وای فێر نەکردوە.

## 2) مرۆڤ بەڵگـەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسـەر بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی خـوا ( عـز وجـل )

بەڕێزان !

ئەگەر سەرنج لە ئینسان بدەین کە یەکێکە لەو گیانلەبەرا نەی لە بوونەوەردا دەژین دەبینین خاوەنی ویست و تواناو زانیاری و ژیان و دیتن و بیستن و قسەکردن و پێکەنین و گریان و توڕەبوون و بەزەیی و ... هتدە.

جا ئێستاش با سەرنج بدەین داخوا ئینسان لە چ سەر چاوەیەکەوە هاتووەو کێ هێناویەتەدی ؟!!

یاسایەکی ژیربێژی (منطقي) هەیە دەڵێ: نەدار پێی نابەخشرێ، (فاقِد الشَّيء لا يَعطيه).

کەواتە حەتمەن دەبێ ئەو سەرچاوەیەی ئینسانی لێوە هاتووە ئەو زاتەی ئینسانی دروست کردوە، خاوەنی هەموو ئەو خەسڵەتانە بێت کە لە ئینساندا هەن، واتە ئەو زاتەی یان ئەو سەر چاوەیەی کە

دروستکردنی مرۆڤــی وەپاڵ دەدەین دەبێ خاوەنی ژیان و ویست و تواناو زانیاری و دیتن و بیســتن و قسەکردن و تووڕەیی و بەزەیی بێت.

جا با سەرنج بدەین داخۆ ئەو سەرچاوەیە یان ئەو زاتە کێیە؟!

لە ڕاستیدا بۆ دیاریکردنی ئەو سەرچاوەیە بەس ســێ ئیحتمال ڕێیان تێدەچێ:

1- کە بڵێین ســەرچاوەی دروست بوونی مرۆڤ خوای پەروەردگارە.
2- کە بڵێین ســەرچاوەی دروست بوونی مرۆڤ خودی خۆیەتی.
3- کە بڵێین ســەرچاوەی دروست بوونی مرۆڤ شتێکی دیکەیە غەیری خواو غەیری مرۆڤ.

هەڵبەتە ئەوەی کە ڕاست و واقیعی بێ و بەڵگە پشتگیری بکەن بەس ئیحتیماڵی یەکەمیانە، بەڵام با جارێ بچینە سەروکاری ئیحتیماڵی دووەم وسێیەم، چونکە کە ســەلمێنرا ئەوان شتاقیان راست نین و پووچ و هەڵەن، ئەو دەمی بە ناچاری بمانەوێ و نەمانەوێ ناچار دەبین دان بە ڕاستیی ئیحتماڵی یەکەم دابنێین.

جارێ ئیحتماڵی دووەم، کە مرۆڤ بۆ خۆی خۆی دروست کردبێ، ئەوە شتێکی ڕوونە کە هەڵەیەو قســە لێکردنی ناوێ، چونکە شتێکی نەبوو (معدوم) مادام نەبێ، چۆن خۆی پێوەدی دێ؟!!

هەڵبەتە ئەگەر بگوترێ بەردێك بۆ خۆی خۆی کرد بە ئینسان، زۆر وێچووترە لەوەی کە بگوترێ ئینسان نەبوو بەڵام خۆی دروست کرد!!

چونکە لە حاڵەتی یەکەمدا هەر چۆنێکی بێ شتەکە بنەڕەتێکی هەبووی هەبوو، بەڵام لە هی دووەمدا چش!!

کەواتە با بچینە سەر توێژینەوەی ئیحتمالی سێیەم:

ئیحتمالی سێیەم کە دەڵێ سەرچاوەی دروستبوونی ئینسان نە خودایەو بۆخۆی، لێی دەپرسین ئەدی ئەو سەرچاوەیە چیەو کێیە؟!

بێگومان خاوەنی ئیحتمالی سێیەم ناچارە لە دوو ڕێ یان یەکیان هەڵبژێرێ:

1- کە دروست بوونی مرۆڤ بگێڕێتەوە بۆ هێزێکی پەنهان ( قوة غيبية) لە بوونەوەردا.

2- کە دروست بوونی مرۆڤ بگێڕێتەوە بۆ هێزێکی بەرهەست و ماددی.

جارێ ئەگەر ڕێی یەکەمیان هەڵبژێری  دەشزانم هەڵی نابژێرن- ئەوە توند بەرۆکیان دەگرین و دەڵێین: ئەو هێزە پەنهانە چیەو کێیەو بەڵگەتان چیە لەسەر بوونی؟!

وە دەڵێین: مادام هەر دان دێنن بە بەدیهێنەرایەتی هێزێکی نادیاردا، ئەدی بۆچی دانتان بە بوونی خوا نەهێنا، سەرەڕای ئەوەی کە دەروونتان بۆی تینووەو بەرنامەو ڕابەریشی بۆ ناردوون؟!

وە ئەگەر ڕێی دووەم هەڵبژێرن پێیان دەڵێین: پێمان بڵێن ئەو هێزە بەرهەست و ماددییە چیەو چۆنەو لە کوێیە؟! چونکە شتی ماددی دەبێ هەستی پێبکرێ و ببینرێ!

جا ئەو کاتە هەرچی بیلێین حەتمەن لە چوغزی ماددە دەرنا چێ، چونکە ئەگەر بڵێین ڕێکەوت، دەڵێین ڕێکەوت نە دیاردەیەکی ماددییەو نە مەعنەوی، کەواتە نیە، چونکە ئەگەر ماددی با هەستی پێدەکراو، ئەگەر مەعنەویش با دەبوو بەرهەم و پەرێزی بەدی کرابا، بەڵام نە کەس ڕێکەوتی دیوەو هەستی پێکردوە لە هیچ کات و شوێنێکدا، وە نە هیچ کەس پەرێزو بەرهەمی ڕێکەوتیشی دیوە، چونکە ڕێکەوت بە پێلێنانی ڕێکەوت پەرستان نە خاوەنی ژیان نە ژیری نە زانیاری نە دیتن نە بیستن نە ئیرادە، نە هیچە!!

بەڵام ئێمە هەرچی لە بوونەوەردا دەیبینین هەموو ڕێکوپێکی و یاساداری تێدا ڕەنگ دەداتەوەو، بە دانپێداهێنانی بێبڕوایانیش هیچ شتێك نیە کە بە گوێرەی زانیاری و حیکمەتێکی باڵا نەخوڵقابێ.

وە ئەگەر بڵێین (سروشت)!! دەڵێین: پێناسەی سروشتمان بۆ بکەن و خەسڵەتەکانیمان بۆ هەڵدەن، بێگومان لە وەڵامدا دەڵێن: سروشت هەر ئەو دەوروبەرە ماددییەو یاساو دەستوورەکاننی، واتە: سروشت ناوێکی دیکەی ماددەیە، یان دەڵێین ماددە و شەیەکی گ شتییە بۆ حاڵەتی بێیاسایی ماددەو حاڵەتی یاساداریشی بەکاردێ، بەڵام کە گوتمان (سروشت) ئەوە بەس ماددەی یاسادارو ڕێکوپێك کە لە شێوەی دیاردەو ڕواڵەتەکانی بوونەوەردا دەبینرێ، دەگرێتەوە.

کەواتە سەرەنجام ئەو هێزە مادییەی کە خوانەناسان ناچارن پەنای بەرنە بەرێ بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی دروست بوونی مرۆ ڤ ، هەر شتێکی بێ هەر ماددەیەو لە جوغزی ماددە ناچێتە دەرێ.

جا با بزانین داخوا (ماددە) دەبارانی دا هەیەو لێی دەوە شێتەوە بە سەرچاوەو بەدیهێنەری مرۆڤ دابنــرێ؟!

پێشەکی داوا لە خوێنەری سەنگین دەکەم زۆر بە ڕوونی ئەو یا سا ژێربێژییەی کە لە سەرەتای باسەوە خستمانە ڕوو لە زەینی خۆیدا ئامادە بکات ( نەدار ناتوانێ هیچ ببەخشێ) ئنجا دە لێین: بڕوادارو بێبڕوا تێکڕا لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ماددە لە بنەڕەتدا لە گەرد (الجُزَيء - مۆلکول)ان و گەرد لە گەردیلان پێکدێو گەردیلەش هەر کامێکیان بیگری لە بارگەیەکی سارد (ئەلکترۆن)و بارگەیەکی گەرم (پرۆ تۆن)و تەنۆلکەیەکی دیکەی هاوبارگە کە پێی دەگوترێ (نیوترۆن) پێکدێ، وە هەمووشیان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە نە گەردو نە گەردیلەو نە هیچ کام لەو تەنۆلکانەی کە گەردیلە پێکدێنن، کە بنەڕەتییەکان(ئەلکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن)ن، خاوەنی هیچ کام لەو خەسڵەتانە نین کە لە مرۆڤدا هەن، وەك ژیان و ویست و تواناو زانیاری و بەزەیی و... هتد.

واتە: ماددە کە خوانەناسان بە سەرچاوەی بوونی مرۆ ڤی دەزا نن- خاوەنی هیچ کام لەو سیفەتانە نیە کە لە ئینساندا هەن، بە واتا یەکی دیکە ماددە نەدارەو ئەو سیفەتانە شك نابات کە پێکهێنەری مرۆڤن!!

جا ئێستا وەرن با وێکرا تێفکرین تاکو زۆر چاك پەی بە فەقیر حاڵیی ئەوانەی خوانەناسن بەرین! چونکە ئەو بە ستەزمانانە دە لێن: مادده مردوەو ئینسان زیندوو، مادده نەفام و مرۆڤ زانا، مادده کەرەو مرۆڤ بیسەر، مادده لاڵەو مرۆڤ گۆیا، بەڵام دەڵێن: ئەو مادده کەرو کوێرو داماوو مردوو و لاڵ و هیچ پێنەکراوە، مرۆڤی بیسەرو زاناو بیناو خاوەن تواناو زیندوو و گۆیاو گورج و پێکراوی خولقاندوە!!

هەڵبەتە کەسانێك ئاوا بیربکەنەوە لە (بۆ گریان) و (پێ پێ کەنین) شایستەی یەکێکیان یان هەردووکیانن.

چونکە کەسێك کە دەڵێ مادده مرۆڤی وەدیهێناوە، قسەکەی بە چەند پلەی زل زل سەیرترە لە هی ئەو کەسەی کە دەڵێ: فلان کەس بۆخۆی (سێو)ان شك نابات، بەڵام دەتوانێ بە (بار)ان بدات بە خەڵکی! یان فلان شوان خوێندەورای نیەو هیچ نازانێ، بەڵام سەدان کتێبی قەبەقەبەی لە هەموو بوارەکانی زانستدا داناون!!

کەواتە: گەیشتینە ئەنجام کە ئەو سەرچاوەیەی مرۆڤی لێوە هاتوەو ئەو زاتەی لێی بوەشێتەوە دروستکراوی مرۆڤی وە پاڵ بدرێ، تەنیاو تەنیا زاتی پاك و بێوێنەو تاکی خودایە.

جا خوێنەری سەنگین! ئەوەی رابرد بەڵگەیەك بوو لە نێو دەیان بەڵگەی دیکەی درەوشاوەداو بە نموونە هێنامانەوە لە سەر سەلماندنی بوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار، بەڵام وانەزانی کە هەگبەی بیری خواناسیی هەر ئەو بەڵگەیەی تێدایەو دەریای قووڵ و بێ سنووری

بڕواداریی بەس ئەم گەوهەرەی تێدایەو هیچی دی، بەڵكو وەك گو ڵمان ئەم گەوهەرە دانەیەكە لە نێو دەیان گەوهەری دیكەدا كە مە لەوانی چاك لە دەریای قووڵ و بەرینی خواناسی دەریان دێنێ و بۆ خەڵكێك كە لە هەقێ دەگەڕێن ڕایان دەنوێنێ.

## 3 ) پووچاندنەوەی دواییـن هەوڵـی بێبڕوایان

پاش ئەوەی كۆنترین[1] بەڵگەو بیانووی دەستی بێبڕوایان كە بریتییە لە بڕوانەهێنان بە بوونی خوا لەبەر نەدیترانی، لە سایەی بەرەوپێش

(1) زۆر كە سی بێئا گا پ یێی وا یە بڕوا نەبوون بە خوا ( جلّ جلا لە) لە بەر بەرهە ست نەبوونی، بەر هەمی كار گەی بەرەوپێش چوونی ئەورووپاو گە شەكردنی زانیاری یە سروشتییەكانە! بەڵام لە ڕاستیدا بیری ناوبراو كۆنترین بەها نەی دە ستی بێبڕوایان بووە بۆ بڕوا بەخوا نەهێنان، ئاخر ئەوەتا فیرعەونی میسر (خۆفۆ) كە نیزیكەی (5000) ساڵ پێش ئێستا ژ یاوە، بۆ بەرپەر چدانەوەی باذ گەوازی خوانا سانەی (موسی) ☐ علیه السلام- پەنای بردۆتە بەر هەمان قسەو، بە گاڵتە پێكرد نەوە بە ها مانی وەز یری گو تووە كە دە بێ كۆ شكێكی بەرزم بۆ درو ست ب كەن تا بگە مە ئاسمانەكان و بزانم داخۆ ڕاستە (موسی) جگە لە من خوایەكی دیكەی هە یە! ﴿وَ قَالَ فِرْعَوْنُ يَاهَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَعَلِّي أَبْلُغُ الأَسْبَابَ ، أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لأَظُنُّهُ كَاذِبًا وَكَذَلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلاَّ فِي تَبَابٍ﴾ (المؤمنون 36-37 ).

چوونی زانیارییە سروشتییــەكانەوە وەك قوماشی ناجســن سپات بۆوەو ڕەنگەكەی چۆوە[2]، بێبڕوایان كەوتنە پەلەقاژەو گەڕان و سووڕان بۆ ئەوەی چڵەپووشێكی دیكە بدۆزنەوە كە دەستی تێبگرن و خۆی پێ لە ڕووباری بەتەوژمی عەقڵ و زانیاری قوتار بكەن و نەیانبات، لە ئەنجامدا دەستیان بە چڵەپووشی (ڕێكەوت) گرت و پێیان وابوو مام ڕێكەوت ئەو قوتاركەرەیە كە ئەوان لێی دەگەڕان! بەڵام هەر هێندەیان خۆش بوو تا دەستیان لــێگیركردن و ڕووباری بەڵگان یەك دوو تەكانی پێدان، ئیدی چڵەپووشی گۆڕینیشیان بەدەســتەوە هات و سەر لە نوێ پێداچوونەوەو[1]، سەر لەنوێ بۆ دیتنەوەی پچك و مچك ئەوە هیچ، بەڵام چڵەپووشێكی دیكە تێهەڵچوونەوە، ئنجا پاش پەلەكوتەو هەوڵدانێكی زۆر، سەرەنجام چڵەپووشی هەربوویی ماددە(أزلية المادة) یان بەدی كردو وەك كەسێك كە پوورە هەنگی لە دارێدا دەدۆزێتەوە، خۆشێك چەنگیان لە چڵەپووشــی ناوبراو گیركردو، پێیان وابوو تازە لێی حەسانەوە دەتوانن بە هۆی چڵەپووشی گۆڕینەوە خۆ لە ڕووباری بەڵگان قوتار بكەن و

---

(2) چونكە زانیاری نوێ دە لێ چەندان د یاردە هەن وەك: (هێزی كێشندە) و (هێزی موگناتیسی) و (تیشكی سەرووبنەو شەیی) و (ژێر سوور) و (هە ستی شە شەم) و ...هتد، كە بە هیچ كام لە پێنج هەستەكان (الحواس الخمس) هەستیان پێ ناكرێ و گومانیش لە بوونیان دا نیە.

(1) بۆ حاڵی بوون لە چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی بیردۆزەی ( بەڕێكەوت دروست بوونی  كون– بوو نەوەر) لە لا یەن زانیاریی نوێوە، بە تایبەتی زانیاری ماتماتیك (علم الرياضيات) بڕوانە كتێبی (مصير البشرية) نووسراوی (لیكۆنت دی نۆی)، هەروەها كتێبی (الله يتجلى في عصر العلم) و (ڕێكەوت لە تەرازووی ژیری‌دا) نووسراوی محمد ملا صالح شارەزووری (خوا لێی خۆش بێ).

بێنەدەرێ، وە وایانزانی کە هەربوویی ماددە چەترێکە دەگونجێ لە سەر خۆ یانی هەڵ بدەن و کار ێك ب کەن ڕێژ نەبارانی بەڵ گە ژ یری و زانیارییەکانی دەستی خواناسان لەشیان تەڕنەکاو دایان نەشـۆڕێنێ!

بەڵام حەیفێ ئەم گومانەشیان وەك هاوەڵانی پێشیی خەیاڵ پڵاوێ کی ڕووت نەبێ چیدی نەبوو، چونکە هەر هێندەیان زانی زاز یاری فیز یا و کیمیا سەرباری عەقڵ و ژیربیێژی وەك پاچێکی نووك تیـژ لە رووخاندنی کۆنە قەڵای رزیوو ئەفسانەیی هەربوویی ماددە وەخۆ کەوت و هێ ندەی دەڵـێی یەك و دوو پەرەم بە پەرەمی کردو هەر پ چکەی بۆ لا یەکی فڕێدا[1].

بەڵێ جا سەرەنجام پاش ئەو هەموو دەردە سەری و فەلاکە تەی بێبڕوایان بە پێی یاسا خوارو خێچ و ناتەواوی مەلای مەزبووره: (پ یاو ئەوەیە لە قسەی خۆی نەیەتەخوارێ و قسەی هەر یەك بێ)[2] دی سان

---

(1) لە ڕا ستیدا لەم دوای یەدا زاز یاری فیز یاو کیم یا و ل قەکانیان مەعلوومات و کەرە سەیەکی زۆر یان خ ستە دە ست عەق ڵەوە کە دەتوا نێ پ تەوترین بەڵ گەیان لێدروست ب کات لە سەر سەلماندنی پە یدابوویّتی ماددە، وە بە پێ چەوانەی بیروبۆ چوونی ماددەپەر ستان، زانیاری بە هیچ ڕەنگێك بۆی نیە دەم لە (هەربوویی ماددە) وەربدات، چونکە ئەم مەسەلەیە شتێك نیە بە تۆڕو شەداوی پێنج هەستەکان بگیرێ و لە تاقیگە (مختبر)دا بجەڕبێنرێ، بێگو مان زانیاریش بەس توا نای بە سەر د یاردە بەرهە ستەکاندا دەش کێ، بەڵام مەسـەلەی هەربوویی (أزلیة) مە سەلەیەکی ژیری و فەلسەفییەو نایەتە ئەو جوغزەوە.

(2) دە ڵێن لە تە مەنی (20) ساڵیدا لە مەلای مەزبوورەیان پر سی چەند ساڵ دە بی؟ ئەویش گوتی (20) ساڵ، ئنجا پاش (20) ساڵی دیکە هەمان پرسیاریان لێکردەوە هەر گوتی (20)، گوتیان جا چۆن! گوتی: پیاو ئەو کەسەیە قسەی هەر یەك بێ!!

دوایین هەوڵ و تەقەڵلای خۆیان بە خەرجداو، دەستیان بۆ چڵە پووشێکی دیکەش برد، بە ئومێدی خۆگرتنەوەو ڕزگاربوون، ئەو چڵەپووشەش کە ئێمە ناومان لـێناوە (دوایین هەوڵی بێبڕوایان) بریتیە لەو قسەیەی کە دەڵێت: (پەیدابوونی بوونەوەرو هەموو دیاردە سەرسامکەرەکانی سروشت، شتێکە ئەنجامی حەتمی و سروشتی ماددەو توخمەکانیەتی)! بۆ وێنە دەڵێن:

نێوکی هەر میوەیەك تۆوی هەر ڕووەکێك و گیاندارێك، تایبەتمەندیی یەکی تێدایە کە وای لـێدەکات ئەو میوە ڕووەك و گیاندارانەی لـێپەیدابن، وە دەڵێن:

هەر بەم شێوەیە هەموو گەردیلەو گەردو خانەکان هەر کامێکیان خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکە کە دوایی ئەو تایبەتمەندییە وای لـێدەکات ئەرکی دیاریکراوی خۆی ئەنجام بدات! کەوا تە پێویست ناکات بۆ وەلامدانەوەی پرسیاری (کێ باران دەبارێنێ)، (کێ ڕووەك دەڕوێنێ)، (کێ مندالْ لە مندالْدانی دایکیدا درووست دەکاو پێی دەگەیەنێ؟)، پەنا بەرینە بەر بڕوا بەخوابوون و بلێیـن: خوا!

بەڵکو دەلێیـن ماددە چ لە شێوەی گەردیلەو گەرددا بێ، چ لە شێوەی توخم، چ لە شێوەی خانەیەکی گیانداری (خلية حيوانية) خاوەنی چەند خەسلەت و تایبەتمەندییەکە، بەهۆی وانەوە ئەو ئەرکانە ئەنجام دەدات و، ئەو دیاردەو ڕواڵەتانەی تێدا سەر هەڵدەدەن.

جا ئێستا با ئەم دوایین هەوڵەش لەمەڕەکی عەقڵ بدەین و بیخەینە بەر تیشکی زانیاری و، بە تەرازووی واقیع هەڵی سەنگێنین و، بزانین وەك بێبڕوایان گومان دەبەن! ڕاست دەردەچێ، یان بە پێچەوانەوە بە مەرەدی هاوەڵانی پێشووی دەچێ و چڵەپوو شێکی بێڕەگ و ڕیشە دەردەچێ! لە پێشەوە دەڵێین:

ئێمەش نکوولیمان لەوە نیە کە تێکڕای شتە ماددییەکان هەر کامێکیان خاوەنی چەند خەسڵەت و تایبەتمەندییەکی زاتییەو دەزانین کە ماددە لە هەر شێوەو چۆنێتییەك دا بێ و شوێنەوارێکی زاتی هەیە[1]، بەڵام ئەمە بەتەنێ (واتە: بڕوابوون بە خەسڵەتمەندیی و شوێنەوارداریەتی ماددە) بەس نییە بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی پەیدابوونی بوونەوەرو دیاردە سروشتییەکانی، وە بڕوابوون بەوەی کە هەر کام لە گەردیلەو گەردو توخم و خانەکانی ماددە خاوەنی کاری گەری و شوێنەواری سەربەخۆو زاتییە، بێئیحتیاجمان ناکات لە بڕوا بەخواهێنان، چونکە:

1- ئەگەر گریمان بڕوابوون بە خەسڵەتداریی ماددە تەفسیری چۆنیەتی پەیدابوونی دیاردەو ڕواڵەتەکانی ماددەشمان بۆ بکات، هەر ناتوانێ چۆنیەتی پەیدابوونی خودی ماددەمان بۆ تەفسیر بکات.

---

(1) خوداش بە ئاشکرا ئەم ڕاستییەی لە قورئانێدا خستۆتە ڕوو، وەك لە سەر زمانی (موسى) - عليه السلام- بە فیرعەون دەفەرموێ: ﴿ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى ﴾ (طه 50) واتە: پەروەردگارمان ئەوەیە کە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو دوایی ڕێڕوونی کردوە! (بۆ ئەنجامدانی ئەرکی خۆی).

2- ئنجا دان هێنانمان بەوەدا كە مادده خاوەنی چەند خەسڵەتێكە دەبنە هۆی گۆڕان و پەرە ستاندنی و پە یدابوونی د یاردە سرو شتییە رێكوپێكەكانی، لەگەڵ پرسیارێكی گرچووبڕدا، دە ستەویەخەمان دەكات و دووچاری (عوزر لە قەباحەتی خراپتر)مان دەكات! چونكە یەكێك دەپرسێ:

باشە ئاخر ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندی یە گرنگا نەی مادده كە سەرچاوەو دینەمۆی گۆڕان و پەرە ستاندنی د یاردە سرو شتییە پڕ وردەكارییەكاننی، چۆن و كێ لە ماددەدا پەیدای كردن؟! هەڵبەتە یان دەبێ بڵێین، خوای بەدیهێنەر یان بڵێین، مادده بۆ خۆی ئەو خەسڵەتانەی لە خۆیدا هێناونە دی!

جا بێگومان لەم دوو وەڵامەش بەس یەكیان گونجاوە كە یەكەمیانە، وەك لە مەسەلەی دووەمی ئەم بەندەدا خرایەڕوو:

3- كاتێك دەگونجا پەیدابوونی دیاردەو ڕواڵەتەكانی مادده بە ق سەی گۆڕین تەفسیر بكرێ، كە بوونەوەر و دیاردە سرو شتییەكان بەم شێوە ڕێكوپێك و یاسادارەی ئێستا نەبان، بەڵكو وەك چێ شتی مجێوری و شێوی شێتەی تێكەڵ و پێكەڵ و بێ سەرەوبەرەو كەس نازانێ چۆن بان!!

با بۆ ڕوونكردنەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینەوە:

کابرایەکی وردەواڵەفرۆش بێنە بەرچاوان کە هەگبەیەکی پێیە، پڕی کردوە لە شمەکی هەمەجۆری منداڵانە، وەك: نوقڵ و چوکلیاتو بنێشتو نەعناو لوقم و شەقشەقەو گەنمەشامی و ... هتد.

بێگومان ئەگەر لە کابرای وردەواڵەفرۆش بپرسن ئەرێ خاڵە! نوقڵ بۆ شیرینەو نەعنا بۆ مزرەو شەقشەقە بۆ شەقەشەقی دێ و گەنمەشامی بۆ سپیە؟! دیارە پێمان دەڵێ: چونکە نوقڵە بۆیە شیرینە چەنکە نوقڵەو، نەعنا بۆیە مزرە چونکە نەعنایەو ... وە هەروەها.

هەڵبەتە ڕاستیش دەکات شیرینی نوقڵ و مزری نەعناو شەقەشەقی شەقشەقەو سپییەتی گەنمەشامی چەند خەسڵەتێکی زاتی ئەو شتانەن و لێیان جوێ نابنەوە.

بەڵام با ئەمجار پرسیارێکی دیکە لە بابای وردەواڵە فرۆش بکەین و بڵێین: ئەدی خاڵەگیان! بۆچی نوقڵ و چوکلیات و بنێشت و مژ مژەو ... هتد هەموویان پێکەوە لە هەگبەکەتدا خڕبوونەوەو شتێکیان پێکهێناوە کە پێی دەگوترێ: (وردەواڵە)؟

ئاشکرایە خاڵی وردەواڵەفرۆش دەڵێ: کاکە گیان ئەو شمەکە هەر لە خۆڕا لە هەگبەی مندا خڕنەبوونەوە، من کڕیومن و پێکەوەم کۆکردوونەوە.

هەڵبەتە ئەگەر لەو دەمەیدا یەکێك قسە بە بابای وردەواڵەفرۆش ببڕێ و بڵێ: نەخێر خاڵە نەخێر بەهەڵەدا چووی؟ بەڵکو ئەوەی بۆتە هۆی خڕبوونەوە لەسەریەك کەڵەکەبوونی ئەو شتانە و دروستبوونی

دیاردەیەك بە ناوی (وردەواڵە) هەر خودی ئەو خەسڵەتانەن كە شتێكی زاتی شمەكەكانن، وەك شیرینی و مزریی و شەقشەق و سپییەتی!! نەك هەر بابای وردەواڵەفرۆش، ئێمەش و هەموو خاوەن عەقڵێكی دی كەش قسەكەی نەك هەر لـێوەرناگرێ، بەڵكو دەیكاتە بەڵگەی كەودەنیی و فەقیرحاڵی و بەستەزمانییانی!!

ئنجا ڕێكوپێكی و هاوئاهەنگی یەك كە لە نێو بوونەوەری شدا دەبینرێ، بە هەمان شێوە ناگونجێ بەوە تەفسیر بكرێ كە ماددە خاوەنی چەند خەسڵەتێكی زاتی و كاریگەرە، چونكە هەبوونی چەند خەسڵەتێكی سەربەخۆو زاتی لە چەند شتێكدا دەبێتە هۆی ئەوەی هەر كام لەو شتانە شوێنەوارو پەرێزێكی سەربەخۆو تایبەتی هەبێ، بەڵام هیچ كاتێك نابێتە هۆی دروست بوونی جۆرە ڕێكوپێكی و هاودەنگی و هاوسەنگییەك كە ئامانجێكی ویستراوی پێ بێتەدی.

زانایان دەڵێن: ئەوەی تا ئێستا جێی متمانەو دڵنیاییە ئەوە یە كە بەس لەسەر خڕۆكەی زەوی ژیان هەیە، چونكە بارودۆخێك كە ڕەخسانی ژیان دەیخوازێ تەنها لەسەر زەوی سازكراوە، ئەویش بە هۆی پێك كەوە گونجان و هاودەنگی و هاوسەنگی چەندان دیاردەی سرو شتی وەك ڕۆژو مانگ و هەواو ئاوو چیاو ڕووەك و گیاندارو ... هتد.

هەڵبەتە هەر كامێك لەو دیاردانە بۆ ئەوەی لە گەڵ دیاردە كانی دیكەدا ڕێك بكەوێ و بسازێ و ببێتە مایەی پەیدابوونی ژیان لە سەر زەوی، چۆنیەتی و ئەندازەیەكی تایبەتی بۆ دیاریكراوە كە ئە گەر بەو

چۆنیەتی و ئەندازە تایبەتییە نەبا، نەدەگونجا ببێتە ما یەی رەخ سانی ژیان لەسەر زەوی.

جا ئێستا با بزانین ئەو ڕێک کەوتن و هاو سەنگی و هاوکاری یەی دیاردە سروشتییەکان چۆن و بە هۆی چییەوە پەیدابووە؟!!

لە ڕاستیدا بۆ دۆزینەوەی هۆی پەیدابوونی ڕێکوپێکی و هاوسەنگی بوونەوەر بە گشتی و، ئەو دیاردە سروشتییانەی بوونە هۆی پە یدابوونی ژیان بە تایبەتی، ناچارین یەکێك لەم سێ ڕێیە هەڵبژێرین:

1- ڕێکوپێکی و هاوسەنگی دیاردە سروشتییەکان، لە هەر کام لە دیاردە سروشتییەکانەوە پەیدابووە.

2- ڕێکوپێکی و هاوسەنگی دیاردە سروشتییەکان، لە تێکڕای دیاردە سروشتییەکان پەیدابووە، بەڵام بە هەر شێوەیەك کە ڕێ کەوتبێ و هاتبێتە پێش!

3- ڕێکوپێکی و هاوسەنگی دیاردە سروشتیەکان، لە تێکڕای د یاردە سروشتییەکان پەیدابووە، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی ویستراو.

بێگومان هی یەکەمیان نەگونجاوە، چونکە یەك دیاردەی سرو شتی بەس شوێنەوارو پەرێزی تایبەتی خۆی هەیەو هیچی دی، بۆ وێ نە رۆژ بەس پەرێزی تایبەتی خۆی هەیەو ناتوانێ هەر کام لە زەوی و ئاوو هەواو ڕووەك و...هتد، یەك یەك لە خودی خۆیا نداو وێ کڕاش وا یان لێبکات گونجاوو ڕێکوپێك بن.

هی دووەمیشیان دیسان لەگەڵ عەقڵ و زانیاریدا دانووی ناکوڵن، چونکە یەك تاقە فیشەك کە بە نەزانی و ناشێیی دەتەقێنرێ، پەرێزی

خراپ نەبێ لێـی چاوەڕان ناکرێ، چ جای ئەوەی سەرلەبەری ماددەو دیاردە سـروشتیەکان ببنە فیشەکە شێتەو گورزی بابای ( شەلم کوێرم کەس نابوێرم)!!

کەواتە ئەوەی کە لەگەڵ عەقلٚ و زانیار یدا دەگو نجێ بەس ڕ یی سێیەمیانەو، ناچارین بۆ تەفسـیرکردنی چۆنیەتی پە یدابوونی ئەو ڕێکیی و پێکەوە گو نجان و هاو سەنگییەی کە لە ن یوان د یاردە سـروشتیەکاندا دەبینرێ و بۆتە هۆی پەیدابوون و بەردەوام بوونی ژ یان لەسەر زەوی بلێین: ئەو دیاردە سـروشتییانەلە لا یەن زاتێ کی زا ناو کاربەجێوە ڕێك خراون و هاوسەنگی و تەباییان لە نێواندا پەیداکراوە.

کەواتە: بەڵێ راسـتە، هەر کام لە گەردیلەو گەردو توخم و خا نەو هەرکام لە د یاردە سـروشتییەکان، پەرێزو شوێنەوارێکی زا تی و تایبەتییان هەیە، بەلام ئەوە کە هەر کام لەمانە- کە چەند حاڵەتێکی جوێ جوێی ماددەن- پەرێزو شوێنەوارێکی زاتی و سەربەخۆی هە یە، ناتوانێ چۆنیەتی پەیدابوونی هاودەنگی و ڕێکوپێکی و هاوکاری دیاردە سروشتییەکانمان بۆ تەفسـیر بکات.

ئنجا لە کۆتاییدا بۆ نەمانی هیچ گرێو گۆل و دوودڵی یەك دوو وێنەی دیکەش دێنینەوە:

وێنـەی یەکـەم:

رستەی (هێمن شاعیرە) لە (10) پیتان پێکهاتوە:

( ھ، ێ ، م ، ن ، ش ، ا ، ع ، ی ، ر ، ە )

دیارە ھەر کام لەم (10) پیتانە خاوەنی دەنگێکی تایبەتییە، کە بە شوێنەوارێکی زاتی و سەربەخۆی وی دادەنرێ، بەڵام بێگومان ئەم پیتانە بەس لە کاتێکدا بەم شێوە تایبەتییەی سەرێ ڕیز دەبن و ئەم مانا و مەبەستە دەگەیەنن کە ئێمە دەمانەوێ، وە غەیری ئەم شێوەیە بە ھەر شێوەیەکی دی ریز بن، ئەو ئامانج و مەبەست و ڕێکوپێکییەی ئێمە دەمانەوێ نایەتەدی.

جا لێرەدا ئەگەر یەکێك بڵێ: ھەر کام لەم پیتانە شوێنەوارێکی تایبەتی و دەنگێکی دیاریکراوی ھەیەو، تا تێکڕای ئەم پیتانە بە دەنگە تایبەتییەکانی خۆیانەوە نەیەنە مەیدانێ و ڕیز نەبن، قسەی گۆرین نایەتەدی، ئەوە بێگومان قسەیەکی بەجێی کردوە.

بەڵام ئەگەر لەو کەسە پرسیار بکرێ، باشە بۆچی لە نێوان سەدان جۆرە ریزبوونی دیکەی مومکین و لە باراندا ھەبوودا بەس ئەمجۆرە ڕیزبوون و تەعبیرە دروست بوو؟!

ئەویش بڵێ: خەسڵەت و شوێنەواری تایبەتی و زاتی ھەر کام لە (10) پیتەکان بوو بە ھۆی ئەوە، ئەوە بێگومان قسەیەکی بێ جێی کردوە، چونکە خەسڵەتی زاتی و تایبەتی ھەر پیتێك ھەر ئەوەندە پێویست دەکات کە شوێنەواری تایبەتی خۆی- واتە دەنگەکەی- لێی جیانەبێتەوە، بەڵام ئەوە کە دەبێ حەتمەن پیتی (ھ، ێ) لە تەنیشت

(م،ن) ریزبن، ئەوە بە هیچ جۆرێك یەكێك نیە لە داخوازییەكانی هیچ كام لە پیتەكان.

مادام وابێ بۆ تەفسیركردنی هۆی رێكوپێكی و ریزبوونی پیتەكان بەم شێوەیە حەتمەن دەبێ لە سەرچاوەیەكی دیكە بگەڕێین، ئەویش ئەوەیە كە بابایەكی ژیرو فامیدە، مەبەست و ئامانجێكی تایبەتی هەبووەو ویستوویەتی بە خەڵكی ڕابگەیەنێ كە (هێمن موكریانی) شاعیرە.

شتێكی ڕوونە كە ئەو بابایە لە دەنگ و خەسڵەتی هەر كام لە پیتەكان ئاگادار بووەو زانیویەتی چۆن وشە ریز دەكرێن و رستەیان لێ پێك دێت، وە بە گوێرەی سەلیقەو بەرنامەیەكی ژیرانە لە پیتەكان وشەی تایبەتی دروست كردوون و، وشەكانیشی بە شێوەیەكی تایبەتی ریز كردوون، تا لە ئاكامدا ئەو مەبەستەی راگەیاند كە لە نێو دوو تویی رستەی گۆڕیندا بوو.

مەسەلەی گەردیلەو گەردو توخم و خانەو دیاردە سروشتیەكانیش بە هەمان شێوە، هەر كام لەمانە خاوەنی چەند خەسڵەتێكی تایبەتی و شوێنەوارێكی زاتییە، بەڵام لە كاتێكدا هەموو ئەمانە دەستیان پێ لە ملی یەكدی دەكرێ و هەر كامێكیان دەكرێتە ئاڵقەیەك و لە هەموانیان زنجیرێك دروست دەكرێ، بە هیچ عەقڵێك رەوا نیە بگوترێ ئەو دەست پێ لە ملی یەكدی كران و ئاڵقەبەندی كرانەش شوێنەواری زاتی و تایبەتی ئەو شتانەیە، چونكە ئەو شتانە (گەردیلەو

گەردو... هتد ) شوێنەواری گچکەو تایبەتییان هەیە، بەڵام هێنا نەدی شوێنەوارێکی گ شتی و ڕێکوپ ێك و هاو سەنگی و هاوکاری یەکی بەرفراوانیان لە وزەدا نیەو، پێوی ستە بۆ تەف سیرکردنی چۆنیەتی پەیدابوونی دیاردەیەکی وا، لە سەرچاوەیەکی دیکەدا بگەڕێین کە شتی وای لێ بوەشێتەوەو کاری وای لە دەست بێ، هەڵبەتە ئەو سەرچاوەیەش خودای پەروەردگارە.

وێنـەی دووەم:

هاوکات لەگەڵ لەدایکبوونی منداڵدا (شیر)ێك لە مەمکی دایکدا پەیدا دەبێ، کە ئەندازەی خەستی و ڕوونییەکەی لەگەڵ ئەندازەی تەمەن و پێداویستی جەستەی منداڵەکە ڕێك کەوتووەو پێ بە پێ خەستی شیرەکەش زیاتر دەبێ.

جا گومانی تێدا نیە کە شیری دایك لە کارگەیەکدا دروست دە بێ، کە لە چەند ئەندامێك پێکهاتوەو، هەر کام لەو ئەندامانەش لە چەندان شانەو خانە دروست بووەو، هەر کام لەو شانەو خانانەش لە ملیۆ نان گەردو گەردیلە پێکهاتوە.

بەڵێ هیچ کەس نکوولّی لەوە نیە کە شیری دایك لە ئەنجامی پێکەوە ڕیزبوون و هاوکاری ملیاران گەردیلەو ملیۆنان گەردو هەزاران خا نەو شانەو چەندان شتی وەك: خوێن و ڕەگ و دە مارو دەزوو لەو مەمی لەو هۆرمۆن .... هتد پەیدا دەبێ.

بەڵام جێی کێشەو دەم بەدەمە لێرەدا ئەوەیە، کە ئایا پێکەوە ریزبوون و هاوکاری یەکدی کردن و پاڵ لێکدانی ئەو ملیارەها گەردیلەو ملیۆنەها گەردو هەزارەها خانەو چەندان شتی وەك خوێن و هەواو ڕەگ و دەمارو دەزوولەو هۆرمۆن... هتد، کە دەبنە هۆی دروست بوونی شیرێك کە لەگەڵ مەمکی دایك و زارو گەرووی منداڵ و ئەندازەی پێداویستی جەستەی و قۆناغەکانی تەمەنیدا لە سەدا سەد (100%) گونجاوو پێکەلپێکە، کارو پەرێزو شوێنەواری کێیە؟!

ئایا دەتوانین بڵێین: پەرێزو شوێنەواری گەردیلەو گەردو خانەو شانەکانی جەستەی دایکەکەیە، چونکە هەر کام لەوانە خاوەنی کاریگەری و شوێنەوارێکی زاتی و سەربەخۆیە؟!

بێگومان نەخێر، چونکە پەرێزو شوێنەوارێك کە ئەو شتانە پەیدای دەکەن شتێکی گچکەو دیاری کراوە، بەڵام پێکەوە ریزبوونیان و هاوکاری و پاڵ وێکدانیان دیاردەیەکی گشتی و فراوانە.

کەواتە راستە هەر کام لە گەردیلەو گەردو توخمەکانی ماددەو ئەو دیاردە سروشتییانەش کە لێیان پێك دێن، خاوەنی کاریگەری و پەرێزێکی زاتی و سەربەخۆن، بەڵام نابێ لەوە بێئاگابین کە ئەو شوێنەوارو پەرێزانە جوزئی و گچکەن، کەواتە ئەگەر هات و پەرێزو شوێنەوارێکی گشتی و فراوانمان دی، وەك پێکەوە گونجان و هاوکاری کردنی ئەو هەموو گەردو توخم و دیاردە سروشتییانە بە شێوەیەك کە دەبوو بەهۆی هێنانەدی ئامانج و مەبەستێکی گرنگ و مەزن (وەك

پەیدابوون و بەڕێوەچوونی ژیان) کە ئەگەر بەو شێوەیە نەبا بە هەر شێوەیەکی دیکەبایە، نەدەهاتەدی، ئەوە لە حاڵێکی وادا عەقڵ و ویژدانی ساغ و زانیاری راستەقینە ناچارمان دەکەن، کە ئەو شوێنەوارە گشتی و بەرفراوانە بگێڕینەوە بۆ سەرچاوەیەکی وا کە لێی بوە شێتەوەو دەبارانیدا هەبێ، تاقە سەرچاوەیەکیش کە دەباراندیدا هەبێ بتوانی سەرلەبەری بوونەوەر رێك بخات و هەموو وردو درشتی ئەو بوونەوەرە بە شێوەیەك ریز بکات و جۆرە هاوسەنگی و هاودەنگی و هاوکارییەکی تێدا بێنێتەدی، کە دەبێتە هۆی هێنانەدی چەندان ئامانج و مەبەستی گرنگ و بەجێو ویستراو، کە زاناو شارەزاو پسپۆڕان لە ئاقاریدا سەرسام و ماتن، تەنیاو تەنیا خودای بەرزو مەزن و زاناو توانا کاربەجێیە، کە خاوەنی ئەوپەڕی بەزەیی و زانیاری و دەسەلات و لێزانی و هەموو خەسڵەتێکی دیکەی بەرزو پەسندەو لە هەموو هەڵەو پەڵەو کەموکوڕییەك دوورە.

## 4) زانیاری لە خزمەت بیـری خواناسـیی دایە

بەڵێ لە راستیدا بەرەوپێش چوون و گەشەكردنی زانیاری (بە تایبەتی زانیارییە سروشتییەكان) دەبێتە هۆی پتر درەوشانەوەو زیاتر بەهێزبوونی بیری خواناسی، چونكە وەك لە لاپەڕەكانی پێشوودا گوتمان لە ڕێی زانیارییەوە مرۆڤ پەی بە رازو نهێنییەكانی بوونەوەرو سروشت دەبات و بە یاساو دەستووورە ڕێكوپێك و پڕ وردەكارییەكانی ئاشنا دەبێ، هەڵبەتە هەتا زیاتریش توانای موتاڵاو تێگەیشتنی دێڕەكانی كتێبی بوونەوەرمان هەبێ، پتـر بە دانەری ئەو كتێبە ئاشنا دەبین كە خوای میهرەبان و كاربەجێیە.

جا وا ئێمە لەم باسەدا وەك (لویچێك لەتەغارێك)، چەند نموونەیەك لەو وردەكاری و ڕێكوپێكی و هاو سەنگی (توازن) یە سەر سامكەرە

دەخەینە بەرچاو، کە زانیاری نوێ لە بوونەوەردا پەی پێبردووەو پەردەی لەسەر لابردوە، بەڵام بەر لەوەی بێینە سەر خستنەڕووی ئەو نموونانە دەڵێین:

زانایان دەڵێن هاوسەنگیی (توازن)و هاودەنگی و پێکەوە گونجانی هەموو دیارە سروشتییەکانی بوونەوەر، یەکەمین یاسای بەرچاوو زەقترین درووشمی بوونەوەرە، هەمان ڕێکوپێکی و هاوسەنگی کە لە نێوان زەوی و مانگ و رۆژو ئەندامانی دیکەی کۆمەڵەی رۆژ (مجموعة الشمسية)دا دەبینرێ، هەم لە نێوان کەهکەشانە زەبەلاحەکانیشداو، هەم لە نێوان تەنۆلکە (جُسَیْم) گچکەکانی نێو گەردیلەشدا دێتە بەرچاوی عەقڵ و زانیاری.

بە واتایەکی دی بوونەوەر، هەر لە گچکەترین شتییەوە بیگرە هەتا گەورەترین شتی تێکرا گەردن کەچی یاساو حوکمی هاوسەنگی و تەبایی و پێکەوە گونجانە، بە دەردی قورئانی مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ (آل عمران 83) وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی بوونەوەر- دایە، گەردن کەچی ویییە.....!!

گۆڤاری (کوریری جیهانی) کە ڕێکخراوەی یۆنسکۆ(منظمة اليونسكو) دەریدەکات، لەوبارەوە گوتوویەتی: (بەڕاستی سروشت شتێکی تێروتەواوە، وە چەند دیاردەیەکە هەندێکی لەگەڵ هەندێکیدا تەباو گونجاوە، کار لە یەکدی دەکەن و پێکەوە پەیوەستن، لەوبارەوە

ڕاست وەك پارچەكانی كاتژمێرێكی ئاڵۆز وان، وە لە نێوان تێكڕای ئەو دیاردەو ئەندامانەدا هاوسەنگییەكی دامەزراو هەیە، كە بەهۆی فلان و فیسار ئەندازەی تایبەتیەوە پەیدابووە كەلەو دیاردانەدا هاودەنگی ڕەچاو كراوە).

ئێستاش نۆرەی خستنەڕووی چەند نموونە یەك لە هاو سەنگی و هاودەنگی بوونەوەر:

**وێنەی یەكــەم: پەیوەندی نێـوان گیـانەوەر و ڕووەك:**

زانایان دەڵێن خەڵكی سەر زەوی لە ماوەی ساڵێكدا(664) ترلـیۆن و (736) ملیار لیتـر ئۆكسجین هەڵدەمژن كە بە ژمارە ئاوا دەنووسرێ (664736000000000)!!

وە وێڕای هەڵمژینی ئەم ئەندازە ئۆكسجینە (559) ترلـیۆن و (640) ملیار لیتر ترشی كاربۆنیك لەگەڵ هەناسەدانەوەدا دەدەنەوە بە سروشت!!

تێبینی: (بە شێك لەو دووەم ئۆكسیدی كاربۆنەی كە لە گەڵ هەناسەدانەوەدا دێتە دەرەوە، بە هۆی هەڵمی ئاوی نێو هەواوە دە گۆڕێ بۆ ترشی كاربۆنیك).

هەڵبەتە ئەو هەموو (ئۆكسجین)ە كە خەڵكی سەر زەوی لە ماوەی ساڵێكدا هەڵی دەمژن و ئەو هەموو ترشە كاربۆنییەی كە وەك پاشەڕۆك و ڕەژوو وایە، زۆر زۆرەو دەبوایە بە ماوەیەكی كەم (ئۆكسجین)یش ببڕێ و دنیاش پڕبێ لە دووەم ئۆكسیدی كاربۆن، بەڵام ئا یا بۆ چی ئە مە ڕوو نادات، كە مردن و لەنێوچوونی مسۆگەرو حەتمی مرۆ ڤ و تێ كڕای گیاندارانی لە گرەودایە؟!

زانیاری لە وەڵامدا دەڵێت: هاو سەنگی و هاو كاری و تەبای یەكی سەرسوڕهێنەر لە نێوان گیانەوەرو ڕووەكدا هەیە، لە سۆنگەی ئەو هاوسەنگی و هاوكاری و تەباییەوەیە كە نە (ئۆك سجین) لە هەوای دەوری زەویدا دەبڕێ و نە دووەم ئۆكسیدی كاربۆن دنیا پڕ دە كات، چونكە ئەو (ئۆكسجین)ەی كە گیا نەوەر هەڵی دە مژن، هەر چەندە ئەندازەیەكی زۆریشە بەڵام لەچاو ئەو هەموو (ئۆكسجین)ەی كە ڕووەك و شیناورد لە كاتی تیشكەپێكهاتن (التمث یل ال ضوئي)دا دەر یدەدات یەكجار كەم و نابووتە!!

دیسان ئەو پاشەڕۆك و زبڵ (دووەم ئۆكسیدی كاربۆن)ەی كە بە هۆی هەناسەدانی گیانەوەرانەوە پەیدا دەبێ زۆر كەمترە لەو ئەندازەیەی كە ڕووەك پێی دەژی و هەڵی دەمژێ!!

جا گومانی تێدانیە كە ئەم هاوسەنگی و هاوكاری و تەباییەی نێوان گیانەوەرو ڕووەك كە هەردووكیان پێویستی یە كدی دا بین دە كەن و هەردووكیان بۆ یەكدی هەم كڕیارو هەم فرۆ شیارن و، وەك دوو پ ێی

تەرازوو وان بۆ یەكدی، هەتا بلـێی جێی سەر سوورِمان و تێف كرین و وردبوونەوە یەو، درەو شاوەترین بەڵ گەی مە شوورخۆریەتی و بە سەر راگەیشتوویەتی خوای كاربەجێو بەبەزەییە.

## وێنـەی دووەم: لە سـروشـتدا هەموو شتێك دەخوات و دەخورێ

نموونەیەكی دیـ كەی هاو سەنگی بوو نەوەرو پێ كەوە تەبابوون و بەدەنگی یەكدییەوە هاتنی دیاردەكانی، ئەوەیە كە هەموو شتێك لە سروشتدا هەم لە دەوروبەرەكەی دەخوات و هەم دەشبێتەوە خۆراك بۆ دەوروبەرەكەی!!

رِووەك و شـیناورد بژێوی خۆی لە تیشـكی رِۆژو ئاوو گڵ دابـیـن دەكات، گیانەوەرانیش بەشێكیان لەسەر ورگی رِووەك و شیناورد دەژین، ئنجا ئەو ئەندازە رِووەكەی كە لەبەر گیانەوەران دەمێنێتەوەو پاشەرِۆكی گیانەوەرانیش دەبنە خۆراك و بژێو بۆ برِێك لە زیندەوەران.

ئنجا لاشەی مردووی گیانەوەرو توێڵك و گەڵاو میوەی رِزیوی برِێك لە شیناوردو درەخـتیش دەبێ تە خۆراك و رِۆزی كر مـی زەوی و ئەو زیندەوەرانەی وەك وین.

ئنجا كە تیشكی رِۆژ دەچێتە بن توێخی زەوی یەوە، دەبێ تە هۆی یاریدەدانی زیندەوەرەكانی بن گڵ و، ئەوانیش ماددەی ئەندامیی (المادة العضوية) وردوخاش دەكەن و بەشێكی لـێدەخۆن و بەشێكی دیـ كەش لە شێوەی پاشەرِۆكدا فرێ دەدەنەوە.

ئنجا گیانداره ڕووەكییه وردیلەكانی بن زەویش لە كەڕوو و بەكتریا كە توانای جێبەجێكردنی تیشكه پێكهاتنیان نیه، لە تاریكی بن زەویدا بژێوی خۆیان لە پاشەڕۆك و لاشەی زیندەوەره وردەكان دابین دەكەن.

وە هەندێك لەو بەكتریاو جۆره كەڕووانەی كە دەمێننەوە، ئەو پاشماوه ڕووەكی و گیانەوەرییه پێك دێنن كە خۆراك بۆ ڕووەك دابین دەكەن، وە هەندێك لە جۆرەكانی گیانداره ڕووەكییه وردیلەكانیش كاره كە دەگەیەننه قۆناغه كۆتایی و ئەو پاشماوه گەنیوەی ژێر گڵ دەگۆڕن بۆ خوێیه كانزاییەكان، كە ڕووەك و هەندێك شتی دیكه دەیانمژن.

وەك دەبینین هەر جۆرێك لە ڕووەك و گیانەوەر، بژێوو خۆراكی خۆی لە شتێكدا دابین دەكات و، دوایی بۆ خۆشی دیسان سەر لەنوێ دەبێتەوە خۆراك و بژێو بۆ شتێكی دیكەو، ئەو شتەش بۆ شتێكی دیكەو، وە هەروەها وەك بازنەیەكی داخراو!!

## وێنەی سێیەم: هاوسەنگی لە ژیانی بەكتریادا:

زانایان پێیان وایه كە بەكتریا یەكەمین زیندەوەری گیانداره كە پێش ملیۆنان ساڵ لەسەر زەویدا پەیدابووە، وە ئەو بەكتریایانه گەورەترین دەوریان هەبووه لە چاككردن و بە پیت كردن و نوێكردنەوەی زەویدا، وە

ئەنزیمەکانی[1] بەکتریا سەرەکیترین پشکیان هەبووە لە گۆڕینی ماددەدا لە شێوەیەکی نائەندامی (غیـر عضویة)یەوە بۆ شێوەیەکی ئە ندامی (ئۆرگانی)کە ژیانی پێبەرێوە دەچێت.

بەکتریاش گیا نداریکی یەکجار وردی[2] سەربەخۆیەو خاوەنی توانایەکی گەورەیە، دەتوانێ لە بارودۆخێکدا بژی کە پلەکانی گەرمی یەکجار بەرز بن، یان بە پێچەوانەوە یەکجار نزم بن، وە بەکتریا لە هەموو زیندەوەرێك بڵاوترە لە سروشتدا، لە هەوادا بە بەرزی چوار (4) میل لە ئاستی دەریاوە هەیە، وە لە قوڕی بن زەو یدا لە قووڵی (3) میلدا هەیە!!

وە بەکتریا بەرپر سیارە لە ئا قار زۆر بەی گۆڕا نە فیز یایی و کیمیاییەکانی ژیانی ڕووەك و گیاندارو مرۆڤ.

وە بەکتریا لە ڕێی دوولەت بوونەوە ز یاد دە کات، لە هەر ن یو سەعاتێکدا جارێك!!

واتە بۆ وێنە میکرۆبێکی کۆلێرا ئەگەر بەردەوام بێ لەسەر پیـ شەی خۆی (کە دوو لەت بوو نە)، دەتوا نێ لە ماوەی (30) سەعاتدا

---

(1) ئەنزیم ماددەیەکی ئەندامییە، توانای توانەوەی هەیە، یارمەتی کارلێکە کیمیاییەکان دەدات.

(2) قەبارەی بەکتریا 1- 10 ی مایکرۆنێك ، مایکرۆنیش 1- 1000 ی میللیمەترێکە، بڕوانە (افریدگار جهان) ناصر مکارم شیـرازی، لاپەڕە (111) .

وەچەیەکی وای لــێبکەوێتەوە کە سەرلەبەری ڕووکاری زەوی بە شاخ و دەشت و دەریاوە داپپۆشــێ بە چینێکی ئەستووری لێك نەپچڕاو!

مادام وابێ بەکتریا دەتوانێ لە ماوەی کەمتر لە ڕۆژێکدا کۆتایی بە ژیانی ڕووەك و گیاندارو مرۆڤــی ســەر زەوی بێنــێ!

بەڵام جا بە دەردی پێشــینان گوتوویانە (دنیا شاری بێساحێب نیە)و لێرەدا مەسەلەی هاوسەنگی (توازن) دێتەپێش، دەبینین بەکتریاکان لەنێو خۆیاندا جەنگ و کێشەیان هەیەو هەندێکیان هەندێکیان بە فەتارەت دەبەن، بۆ وێنە سوپایەکی گەورەی بەکتریایی لە ڕیخۆڵەکانماندا دەژی، وە لە هەر چرکەیەکی شەوو ڕۆژاندا هەراو جەنگ و کوشتارێکی بێڕەزا لە نێوان جۆرەکانی ئەو سوپایەدا لە گۆڕێ دا یەو یەکدی قەتڵوعام دەکەن، خۆ ئەگەر خوانەخواستە بەکتریاکانی نێو لەشمان بەس یەك جۆر بان، ئەوە دەبوو لە ماوەیەکی زۆر کورتدا تازیەو سەرەخۆشی هەر کامێکمان ساز کرابا.

ئنجا گەورەترین ئەرك و خزمەتی بەکتریا کە بۆ ئێمەی ئەنجام دەدات. هەروەها لە پاڵ ئێمەدا بۆ ڕووەك و گیاندارانیش، چونکە (لە پەنا گوڵە گەنمێکیدا هەزار گوڵە جۆش ئاوی دەخۆنەوە)، بریتیە لەوەی کە هەڵدەستێ بە شیکردنەوەو بڵاوکردن و گۆڕینی پاشماوەکانی گیانداران (لاشەی مردوویان و پاشەڕۆکیان) و ناهێڵێ بە هۆی مانەوەو لەسەریەك کەڵەکەبوونیان سەر زەوی بۆگەنیو بکەنو بێتامی بکەن!!

بەڵێ بەکتریا بۆیە دروست کراوە کە نزیکەی دوو هەزار ملیار تەن پاشماوەی گیاندارانی کەڵەکەبوو بە قوڵینگ و پاچ و بێ لی نەبینراوی خۆی لەبەرێك هەڵبوەشێنێ و پەیوەندییە کیمیاییەکانی نێوان ئاوێتە هاڵۆزەکان (الُمرکَباتُ الُمعَقَدة) بپچڕێنێ، بەم کارەش بەکتریا وا لەو پاشماوەو زبڵە کەڵەکەبووە دەکات کە لە جیاتی ئەوەی ببێتە هۆی بۆگەنیوکردنی دونیاو لەنێوچوونی ژیان، ببێتە خۆراکێکی تەڕو تازەو پوخت بۆ ڕووەك و گیانەوەران!!

بەڵێ جا پاش ئەوەی بەکتریاکان ئەو لاشەو پاشماوە کەڵەکەبووانە لەبەرێك هەڵدەشێنن و سەر لەنوێ بە جۆرێکی دی کە دروستیان دەکەنەوە، کە لەوجۆرە تازەیە ڕووەك و شیناورد خۆراکێکی سازو ئامادەی چنگ دەکەوێ و پێی دەڕوێ و گەشە دەکات و دواییش گیاندارو مرۆڤ لەو ڕووەك و شیاناوردە خۆراك و بژوێکی پاك و پوخت دەستگیر دەکەن، وە جارێکی دی دیسان بەکتریاو میکرۆب و ڤایرۆسەکان لە سەر لاشەو پاشماوەی مرۆڤ و گیانداران دەلەوەڕێن و پێدەگەن و .... وە هەروەها.

جا بێگومان ئەگەر بەکتریاکان نەبوونایەو ئەو ئەرکە پیرۆزەو خزمەتە مەزنەیان پێشکەشی ژیان نەکردبا، سووری ژیان ڕادەوەستاو دنیا دەبوو بە ئاشی ئاو لێبڕاوو برۆ بەخێرهاتی!!

جا بێگومان ئەم دیمەنی هاوسەنگی و هاوکاری و تەباییەی کە لە سروشتدا دەبینرێ، گەورەترین کاری کردۆتە سەر ئەو زانایانەی کە

بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێن و دنیای لــێ دەپشکنن، وە بەوپەڕی دڵنیاییەوە ڕایانگەیاندوە کە مەحاڵی کوڕی مەحاڵە ئەو هاوسەنگیو ڕێکوپێکیو وردەکارییە پەرێزو بەرهەمی ماددەی کەڕولاڵ، یان ڕێکەوت و سروشتی ئەفسانەیی بێ، بۆ وێنە زانای سروشتی (جۆرج ئیرل داف یز) گوتوویەتی: (بەڕاستی هەتا گەشەکردن و پەرەستاندنی زیندەوەران پتر بەرەوپێش دەچێ، زیاتر دەبێتە بەڵگەو شایەدی هەبوونی بەدیهێنەرێکی مشوورخۆر بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری بوونەوەر، وە هەر ئەو گەشەکردنەی کە زانیاری لە بوونەوەردا پەردەی لەسەر لاداوە، بۆ خۆی گەورەترین شایەدی هەبوونی خودایە، چونکە لە چەند تەنۆلکەیەکی سادە کە هیچ شێوەو دیمەنێکی دیاریکراوی نیەو، هیچ بۆ شاییان لە نێوا ندا نییە، ملیۆنان خڕۆکەو ئەستێرەو جیهانانی جۆراوجۆر دروست بوون، کە هەر کامێکیان شێوەیەکی تایبەتی و ئەندازەو تەمەنێکی دیاریکراوی هەیەو تێکڕایان گەردن کەچی چەند یاسایەکی نەگۆڕن کە عەقڵی مرۆڤ لە ئاقار پەی پێبردن و ناسینــی و وردەکارییانیدا کلۆڵ و دەستەوستانە، وە هەر کام لە گەردیلەکانی ئەم بوونەوەرەو بگرە لە گەردیلانیش گچکەتر کە نایەنە بەر هەستەکانەوەو گچکەیی و وردییان نایەتە ژێر ڕکێفی بیــرو خەیاڵەوە، یاساو دەستووری خۆی هەیەو بۆی دیاری کراوە چ بکات یان بۆچی گەردن کەچ بکات[1]!

---

(1) بۆ نووسینی ئەم باسە، (هاوسەنگی لە ژیانی بەکتریادا) سوودێکی زۆرم لە باسێکی گۆڤاری (علوم)ی عێراقی ژمارە (35)ی ساڵی (1988) وەرگرت، باسەکەش بە ناوی : (لولا.... والتوازن الكوني) نووسینی: سامي احمد الموصلي.

خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ ( طه  50) پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو، ئنجا ڕێڕوونیشی کردوە (وا تە: بەرنا مەو نەخشەی بەڕێوەچوونی بۆ داناوە).

خوێنەری بەڕێز!

لەم سێ نموونەیەدا (کە لویچێك بوون لە تەغارێك) دەرکەوت کە هاوسەنگی و هاوکاری و تەبایی وەك ڕۆژی ڕوون لە بوونەوەردا دەبینرێ، هەڵبەتە لە ڕێی زانیارییە سروشتییەکانیشەوە مرۆڤ توانیویەتی پەی بەو هاوسەنگی و هاوکاری و ڕێکوپێکییەی بوونەوەرو سروشت بەرێ، مادام وابێ ڕاستەو سەلمێنرا کە: زانیاری لە خزمەتی بیری خواناسیی دایە!!

# دوا قسەم

بەڕێزان !

بڕوا بەخوابوون و خواناسین شتێکی خوارِسك[1](فطري)و سروشتییە لە دەروونی ئینساندا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا

(1) خوارسك مەعنای پڕ بە پێستی وشەی (فطري)یە، نەك خۆڕسك، چونکە جگە لە خوا هیچ شتێك خاوەنی بوون (وجود)ێکی زاتی و سەربەخۆ نیە، هەر خودایە کە بوون بە دروستکراوەکانی دەبەخشێ.

**فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾** (الروم 30) ، وە وەك پێغەمبەری مەزنمان (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ((كُلُّ مَولُودٍ يُولَدُ على الفِطْرَةِ، فأبواهُ يُهَودانِه ويُنَصّرانِه وَيُمَجّسانِه)) متفق عليه.

کەواتە: با هیچ کەس وا گومان نەبات کە بۆ دۆزینەوەو ناسینی خوا پێویستی بە ئەرك و ماندووبوونێکی زۆر دەکات، بەڵکو وەك خواناسانی دڵ بێدار فەرموویانەو منیش بە تەجرەبەی زاتیی خۆم بۆم ئیسپات بووە:

خوای میهرەبان لە هەموو شتێك لە ئینسانەوە نزیکترە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئینسان بۆخۆی خۆی لە خودا دوور نەگرێو بە هۆی شوێنکەوتنی نەفس و شەیتان و ئارەزووەکانییەوە سروشت و دەروونی خۆی چڵکن و پیس نەکات و، پەردەو دیوارو تەمومژ نەخاتە نێوان خۆی و خوای پەروەردگارییەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿**كَلاَّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ، كَلاَّ إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ**﴾ (المطففين 14-15) واتە: نەخێر بەڵکو ئەو کردەوانەی کە ئەنجامیان دەدەن ژەنگیان لەسەر دڵیان پەیداکردوە، نەخێر بێگومان ئەوان لەو رۆژی (دوایی)دا لە بابەت (دیداری) پەروەردگاریانەوە پەردە پۆش دەکرێن (وە بە دیداری شاد نابن)!!

وەك دەبینین تاوان و سەرپێچی و کردەوە خراپەکان دەبنە هۆی چڵکن بوونو ژەنگهێنانی دڵو دەروونو ،لە سۆنگەی ئەمەشەوە ئینسان پەردەی بەسەر دڵ هەڵدەکشێ و لە دیداری خودا بێبەش دەبێت!!

بەڵــێ خوێنـەری خۆشەویست و بەڕێز!

دڵنیاو مسۆگەر بە کە خوای بەرزو مەزن و میهرەبان زۆر لە ئێمەوە نزیکەو، لوتف و بەزەیی و بەخششی وەك تیشکی زێڕینی رۆژ بە هەموو لایەکدا بڵاوبۆتەوە ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأعراف 156) وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَحْمَةَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾(الأعراف 56) واتە: بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە!

کەواتە: با هەوڵ بدەین کە ئێمەی دوورە پەرێزیش بەرەو لای خوا بگەڕێینەوەو، خۆمانی لــێ نزیك بخەینەوە، ئەویش بەهۆی گەڕانەوە سەر ئەسڵ و سروشتی خواڕسکی ساغ و بێ خلتەمان، لە رێی خۆچاککردن و خۆپاککردنەوەو خۆڵەبێژینگ دانەوە کە تاقە رێگای بەختەوەری و سەرفرازی یە، وەك خودا فەرموویەتی:﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾(الشمس -9).

دیارە ئەمیش بە هۆی پابەندیی بە قورئان و ســـــوننەتەوە گرتنی ڕێوشوێنی پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) دێتەدی، وەك خـــوای زانا فەرموویەتـــــی: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ (آل عمران 31) .

ئنجا با کۆتایی ئەم (دواقسە)یەشم بەم فەرموودە[1] قودسییە بەرزو بەپێزە بێنین کە دەفەرموێ: (مَنْ عادى لِـي وَلِيَاً فَقَد آذنْتُهُ بِالحَربِ، وما

(1) ئەم فەرموودەیە لە کتێبی (ڕێگای صالح بوون و بەرەوخوا چوون)دا توێژراوە تەوەو شەرح کراوە، بەڵام ئەوەی لێرەدا بە شایانی باسی دەزانم دوو شتە:

تَقَرَّبَ إلَـيَّ عَبْدي بِشَيءٍ أَحَبَّ إلَيَّ مِمَا أفتَرضْتُ عَلَيه، وَما يَزالُ عَبْدِي يَتقَرَّبُ إلَيَّ بالنَوافِلِ حَتّى أَحِبَّهُ فإذا أحبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الّذي يَسمَعُ بِهِ، وَ بَصَرهُ الّذي يُبْصَرُ بِهِ، وَ يَدهُ الّتي يبطِشُ بها، وَ رِجْلَهُ الّتي يَمشي بها، وَإنْ سـألَني أعطَيتُهُ، ولَئِن استَعاذَني لأعِيذنَّهُ) رواه البخاري.

کەواتە: با ناوی خوای لـێبێنین و هەوڵ بدەین بە هۆی جێبەجێکردنی فەرزەکانەوە( کە خۆشەویسترین وەسیلەی بەرەوخوا چوونن لە لای خوا) نێزیك بینەوە، وە بە هۆی پابەندبوونمان بە ئاداب و سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) کە مایەی خۆشەویست بوونمانە لە لای خوا، خۆمان لە لای خوا شیرین و بەرێز بکەین ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات- 13) بەشکم سەرەنجام بە لوتف و یارمەتی خوا ببینە بەندەیەکی وا کە بیستن و دیتن و گرتن و ڕۆیشتنمان بەس بۆ خواو بە پێی بەرنامەی خوا بێت و: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ

1- خوای بەرزو مەزن لە سەرەتاوە پێمان ڕادەگەیەنێ کە پشتی دۆستانی خۆی دەگرێ و بەرگرییان لێدەکات، دوایی تێمان دەگەیەنێ کە تاقە ڕێگای لەخوا نزیك بوونەوەو بوونە دۆست (ولّي)ی خوا جێبەجێکردنی بەرنامەکەیەتی.

2- وە لەم فەرموودە بەپێزەدا خراوەتەڕوو کە جێبەجێکردنی فەرزەکان بناغەو بنچینەی خواپەرستی و بەرەوخواچوونەو، پێش دامەزراندنی بناغەی ناوبراو نابێ دەست بە دانانی دیواری جێبەجێکردنی سوننەتان بکرێ.

کەواتە: ئەوانەی کە پایەو بنەڕەتە بذچینەییەکانی ئیسلام و هێڵە گشتییەکانی فەرامۆش دەکەن و زۆر بە ئیشکی و بیرتەسکییەوە گرنە لە هەندێك شتی لاوەکی ( ثانوي) و جوزئی دە ئاڵێن، بەهەڵەدا چوون! چ جای کە سانێك کە فەرزو سوننەتەکانیشیان پشت گوێ خستوون و بە هەندێك مەسەلەی بیدعەت و داهێنراوەوە سەرگەرم بوون!!.

وَمَ حَاتِي لِ لَّهِ رَبِّ الْ عَالَمِينَ﴾ (الأن عام 162) ببێ ته درو شم و ناوو نیشانێکی ڕاستەقینەو واقیعیمان.

هەڵبەتە تەنیا لەو حاڵەتەشدا تاموچێژ لە خواپەرستی وەردەگرین و، وردە وردە پێبەپێ بە عەقڵ و دڵ و ناخی دەروون و بوون (وجود )مانەوە هەست بە مەعناو مەبەستە بەرزو جوان وشیرین و دڵگیرەکانی ناوە چاك و تەواوەکان و سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوا دەکەین و، بەقەدەر ئامادەیی (إستعداد ) و شایستەی خۆمان لە هەردووك جیهانی خوێنراوە (مَقْروءْ)و بینراو(مَنظورْ)ی پان و بەرینی خوادا کە قورئان و بوونەوەرن، هەست بە حیکمەت و نیهێنییەکانی پەروەردگارمان دەکەین و، لە ئاکامی ئەمەشدا خوا پشتیوان بێ بە کامومرادی دنیاو دوارۆژمان دەگەین .

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب اليك.

# نێوەرۆك

## ئەم بەرهەمانە بە چاپ گەیاندراون

1- ئایین ، ئیمان ، خواناسیی.
2- ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا.
3- ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون.
4- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم.
5- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان.
6- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام.
7- ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قور ئان و سوونەتدا بەرگی یەکەم .

8- گەنجەکانمان .

9- با وریابین داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگەکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات .

10- بەدورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام، چ زیانێك دەکەین؟!

11- چۆنیەتی بونە پێشەنگ.

12- چەند وانەیەك دەربارەی ئیسلام و مسوڵمانەتی و کاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا.

13- سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك.

## ئەم بەرهەمانە لەژێر چاپدان

1- ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوونەتدا. بەرگی سێیەم .

2- ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوونەتدا بەرگی چوارەم .

# ئەم کتێبە

لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فراوانە دەربارەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی

گومانیش لەوەدا نییە کە ئیمان و عەقیدە لە ئیسلامدا وەک بناغە بۆ دیوار و

ڕەگ و ڕیشە بۆ درەخت وەهەوێن بۆ ماست وەهەناو بۆ ئینسان وایە !

بۆیە هەرکەسێک بیەوێ مسوڵمانەتی و دینداریەکی ڕاست و ڕەسەن

دەبێ لە ئیمان و عەقیدەوە و بنیاتنانی لە عەقڵ و دڵیدا دەستی پێ بکات !

وەهەرگەل و میللەتێک بیەوێ ژیان و گوزەرانی خۆی بەپێی شەریعەتی

خوا پاکسازی و چاکسازی بکات و ڕێگەی نەجاتی پێویستە لە ڕاستکردنەوە و

بژارکردن و چەسپاندنی ئیمان و عەقیدە دەست پێ بکات .

پێشم وایە ئەم کتێبە بە هەرشەش بەرگەکەیەوە هاوکارێکی باش و

جێی متمانە و پشت پێ بەستن بۆ هەر تاک و کۆمەڵێک بیەوێ

دەست بە گۆڕانکاری و پاکسازی و چاکسازییە بکات .

عەلی باپیر




نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پاڵاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com






/TafseerOffice

7000 دینار